

زنجیرەی کەڵەپیاوانی ئیسلام

١






# شێخ عبدالقادری گەیلانی

ئیمامی زاهید و پێشەنگ

وەرگێڕان: دکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان




تەفسیر

هەولێر چاپی یەکەم ٢٠٠٣

# شێخ عبدالقادری گەیلانی

## ئیمامی زاهید و پێشەنگ

نووسینی

دکتۆر عبدالرزاق گەیلانی

وەرگێڕانی

دکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان


چاپی یەکەم

١٤٢٤ك - ٢٠٠٣ز

تفسير

هەولێر

| | |
|---|---|
| ناوی پەرتوك بە عـەرەبی: | شیخ عبدالقادر الگیلاني |
| نـــــاوی نوســــــەر: | دکتۆر عبدالرزاق الگیلاني |
| ناوی پەرتوك بە کـوردی: | شێخ عبدالقادری گەیلانی |
| نــــــاوی وەرگـــــێر: | دکتۆر ابراهیم احمد شوان |
| چـــاپ و بلاوکردنـــەوەی: | نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر |
| خـــــــــــــــــەت: | نەوزاد کۆیی |
| نـــۆرە و ســــاڵی چـــاپ: | یەکەم ١٤٢٤ك |
| چاپخانـــــــــــــــە: | چاپخانەی پەروەردەی هەولێر |
| ژمــــــارەی ســــــپاردن: | ( ٤٥٧ )ی ساڵی ٢٠٠٣ |
| تـــــــــــــــیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

تەفسیر
هەولێر- شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥-٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# لەبارەی ئەم پیاوە گوتویانە

((ئیمامی خوناسی شێخی عێراق لە سەردەمی خۆی، ئەوەی بە رووناکی دڵبینی و بێگەردی دەروونی بووە نموونەی سەردەم، گەلێ کەرامەتی بەناوبانگ و دەنگوباسی تۆمارکراوی هەیە.))

**حافز ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عبدالغنی بەغدایی حەنبەلیی ناسراو بە (ابن نقطة)**
**ساڵی ٦٢٩ ك مردووە.**

((بەڵام ئیمامە صۆفییە بەناوبانگەکانی وەکو: جونێدو پەیڕەوانی، شێخ عبدالقادر و ئەوانی وەك ئەو، ئەمانە لە هەموو کەسێ زیاتی پابەندی فەرمان و نەهی بوون، گوتەکانی شێخ عبدالقادر هەمووی بۆ پێڕەو کردنی فەرمان و وازهێنان لە قەدەغەو ئارام گرتن لەسەر تەقدیر کراو دەگرێتەوە)).

**شێخ ئیبن تەیمییە، فتاوی: ٥٠٧/١٠**

((شێخی ئیمام، زانانی زاهید، خواناسی پێشەنگ، شێخی ئیسلام، ئالای پیاوچاکان.))

**حافزی زەهەبی، سیر اعلام النبلاء ٤٣٩/٢٠**

((شێخی سەردەم، پێشەنگی خواناسان، خاوەن پایەو کەرامەت، لووتکە لە ئامۆژگاری و قسەکردن لە بیر و ئەندێشەدا)).

**الذهبي، العبر في خبر من عبر ٣٦/٣ ص٥**

# پێشکەشە

+ بۆ زانا کارکردە(عاملین) و دڵسۆزەکان؛ ژیننامەی یەکێ لەوان پێشکەش دەکەم.

+ بۆ ئەوانەی بەهیوای ئەوەن کە ببنە بانگخوازێکی ئاین و چاکخواز و ڕابەر؛ پێشەنگێکی ساڵحیان پێشکەش دەکەم.

+ بەهیوای ئەوەی پەروەردگاری مەزن یەکێ لە ناو ئەم ئوممەتە پەیدا بکات، کە ئاینەکەیان نوێ بکاتەوەو لە بێ ئاگایی بە ئاگایان بێنێ و لە خافڵەتی ئاگاداریان بکاتەوە، بەڕاستی ئەو (خوا) چاکترین مەولایە و چاکترین سەرخەرە. هەروا شایەنی وەڵامدانەوەی بەندەکانیەتی، ئەومان بەسەو چاکترین بریکارە.

# سوپاسنامە

﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ : ئەگەر سوپاستان کرد بۆتان زیاد دەکەم.﴾ابراهیم/٧

((مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ: کەسێ سوپاسی خەڵك نەکات، سوپاسی خوا ناکا)) ترمذی و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە هەروەکو لە(جامع الاصول)هاتووە ژ/١٠٣٣

سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم کە دەستی یارمەتییان بۆ درێژکردم بۆ دانانی ئەم کتێبە، بەتایبەتی مامۆستای مەزن شێخ (وهبی سلێمان الغاوچی) و مامۆستای بەڕێز شێخ (محمد بشیر الشقفة) کە بەکتێبەکە داهاتنەوە و هەندێ کەم و کوڕییان ڕاست کردەوە و پێشەکیان بۆ نووسی.

هەروا مامۆستای بەڕێز (محمد أيمن المراد) ئەویش بە کتێبەکەدا چۆوە و زۆر هەڵەی راست کردەوە.

هەروا هەردوو بەڕێز (محمد موفق لطفي، وعبدالعزیز محمد صالح)کە زۆر سەرچاوەیان پێ بەخشیم، کە لەوپەڕی پێویستی دابووم بۆ دانانی ئەم کتێبە.

لەلایەن منەوە سوپاسی هەموویان دەکەم و خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە لە دنیا و ڕۆژی دوایی، خوای گەورە بیسەری پاڕانەوەیە.

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

# پێشەکی کتێبەکە

## بە پێنووسی: شێخ وەهبی سولەیمان غاوچی

چەند چەپکێ لە گولزاری کتێبی شێخ عبدالقادری گەیلانی دانراوی بەڕێز د. عبدالرزاقی گەیلانی خوا زیاتر ڕێنوێنی و سەری بخات:

کە ناوی پیاو چاکان دێ ڕەحمەت دەبارێ، لەکاتی خوێندنەوەی ژیاننامەی پیاو چاکان بەتایبەتی، ڕەحمەت دەرژێتەسەر دڵی خوێنەرانی.

لەکاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەی پزیشکی سەرکەوتو بەڕێز عبدالرزاق گەیلانی -خوا بیپارێزێ- دا چەند ساتێ ژیام کە پڕ بوون لە دڵسۆزی و خدوو گرتن و خۆشیو شادی و فێربوون و زوهدو پاکبوونەوە، کە لەسەر ژیانی شێخ عبدالقادری گەیلانیی باپیرەیەتی -ڕەحمەتی خوای لێ بێت-.

١- گەنجێکی تازە پێگەیشتوو کە وڵاتەکەی (گەیلان)[1] بەجێ دێڵێ بۆ بەغدای پایتەختی جیهان بەڕێ دەکەوێ لە پێناوی زانستداو چل دیناری پێ دەبێ بۆ خەرجیی خوێندنەکەی، لە ڕێگادا تووشی چەند ڕێگرێ دەبێ، بەهۆی ڕاستگۆییەکەی خوا ڕزگاری دەکاو دەبێتە هۆی ئەوەش، کە هەموو ئەو دز و جەردانە تۆبەبکەن و بۆ خوا بگەڕێنەوە. هەروەك لە دواییدا چیرۆکەکە دەخوێنینەوە، شایانی ئەوەیە کە ڕێ نیشاندەرو سەرکەوتوو بێت.

گەنجێکی تەواوی پێگەیشتوو پیاوانە کە (٣٤) ساڵ لە پێناوی وەرگرتنی فیقهو

---

١ لەدەقەکەدا ( جیلان) نووسراوە، بەڵام من لە سەرەتای کتێبەکە کردمە ( گەیلان) ( وەرگێر).

فەرموودە و تەفسیر و بیروباوەڕ و صۆفیگەری و زانستی تر بەسەر بەرێ شایانی ئەوەیە، کە زانستێکی زۆر فێربوو بێ.

ئینجا پیرێك دەروونی خۆی نقووم کردبێ لە گۆڕەپانی پەروەردەو ڕێنماییکردن و زوهدو بەرەو خواچوون و، خوا دەروونی پاك کردبێتەوە و دڵیشی پاك کردبێ لەدنیا و نەرمی کردبێ کە بەرەو خوا بچێ و، گوێ نەداتە دنیا و کەلاوەکانی و، خوێندنی قورئان و نوێژ و یادکردن و خدوگرتن بە خوای لا خۆشەویست بووبێ، شایانی ئەوەیە کە گەیشتبێتە فەزلێکی مەزن و ئاکارێکی چاك.

پیاوێك (٣٤) ساڵی لەوانە وتنەوە و رابەریکردن و ئامۆژگاری بردبێتە سەر، بازاڕێکی پێ نەزانیبێ و بازرگانیي نەکردبێ، تێکەڵێ خەڵکی نەبێ لەکاروباری دنیا و لەسەر خواردنی جێیان پێ تەنگ نەکا، بۆ هیچ گەورەیێ سەر دانەنەوێنێ و ماستاویشي بۆ هیچ دەوڵەمەندیێ سارد نەکاتەوە، هەر ماڵێکی دنیاشي بۆ بێ چەندی زۆربێت پێویستی ناگزوورەکانی پێ لادەدات وێڕای نەفس بەرزیی و پاکیەکەی، هەر ماڵ و سامانێکی پاکی بۆ بێت لەسەر هەزارەهای قوتابیەکانی خەرجي دەکات لە بواری خواردن و خواردنەوە و شوێنی حەوانەوە و جل و بەرگ، شایاني ئەوەیە کەوا سودێکی گەلێ زۆری گەیاندبێ.

پیاوێك کە لەسەر دەستی خۆی و یاریدەرانی ساڵانە سێ هەزار مرۆڤ دەربچێت و لە وڵاتانی خوادا بڵاوبنەوە و زانست و چاکسازی و سلوك[1] بڵاو بکەنەوە بەگوتە وحاڵی صۆفیانە، لەماوە (٣٤) ساڵ ژمارەیان بگاتە نزیکەی ۰۰۰ ۱۰۰ قوتابي، شایانێتی کە ببێتە دەگمەنی سەردەمی خۆی و هەمو سەردەمێك دوای پێغەمبەرﷺ، خوای مەزن پایەیەکی گەورەی پێ بەخشی کە کردیە ئیمام و مامۆستا و رابەری ئوممەت، لە پەروەردەو پاککردنەوەی دەروون و کردەوەی ئوممەت سەرکەوتوو بوو، گەیشتە پلەیەکی وا کەس لەسەردەمی خۆی و دوای خۆی

---

١ سلوك: بریتیە لە پاکخویی کردنی رەوشت و ئاکار، واتە بەندە خۆی لە ئاکارە ناپەسەندەکان پاك بکاتەوە، وەك خۆشویستنی دنیا و پلەوپایە و رق و قینە و ئێرەیی و فیزیی و رەزیلی و لەخۆڕازیبون و درۆ و غەیبەت و ستەم کردن.. (ن.تەفسیر)

نەیگەیشتیٚ، ئەمەش بەهرەیەکی خوایە بەوەی دەبەخشیٚ کە ویستی لەسەر بیٚت.

٢- پزیشکي بەڕێز د. (عبدالرزاق) کتێبەکەی بەم چەپکە گوڵ و ڕێحان و بەم وردە مرواریانە لەژیننامەی شێخ عبدالقادر رازاندۆتەوە. هەروەك گوتم ئەمە مشتێکە لە خەرواریٚ، ئەوەی دەمەویٚ لەم وتەیەم دەری‌بڕم هیوادارم لـە پێناوخوا بیٚ و ببێتـە هۆی پاداشت دانەوە و ڕێنماییکردنی خـەڵکانیٚ لەسـەر ئـەو خـێرەی کـە خـوا ڕێنماییی کردم: چونکە بڕواداران هەندێکیان ئامۆژگاریکەری هەندێکیانن و ئێستا بە پێی گوتەی دکتۆر کەمیٚ باسی ژیاننامـەی شـێخ دەکـەم: شـێخ عبدالقـادر ڕەزای خوای لەسەر بیٚ خاوەن بڕوایەکی ساغ و بێگەرد بـوو، لـەکاتی وەفاتی فـەرمووی: بگەڕێنەوە سەر باسکردنی سیفەتەکان هەر وەك لەکتێبي (الفتح الربـاني) ل ٣٧٣ دا هاتووە.

شێخ(بەبەر ڕەحمەتی خوا کەویٚ) گوتوویەتی: ((بەناوی خوای دلۆڤان، سـوپاس بۆ ئەو خوایەی کە چونێتیی داهێناوە و خۆشی دوورە لە چۆنێتی، لەهەموو شـتێکدا هەیەو بیٚ چوارچێوەیە، سەرەتای هەموو شـتێکە و بیٚ کۆتاییە. گـەر بڵێـی: چۆنـە؟ داوای چۆنیەتیت لێکردووە. گەر گوتت کەی؟ بەکات خـەریکت کردووە. گـەر گوتـت: نـا، لـە بـوون دوورت خستۆتەوە. گـەر گوتـت: ئەگـەر، بەپێچەوانـە پێشوازیت کردووە. گەر گوتت: بۆچی، لە مەلەکوتیدا دژایەتیت کردووە. خـوای مەزن لەوە بەرزترە کەکات پێش و دوای بکەویٚ، بە لەشـی ناناسـریٚ. خـوا بـەرزو باڵایە، گەر مرۆڤ بوایە پێکهاتەی ناسراوبوو، ئەگەر لەش بوایـە چـەندێتیی ناسـراو بوو، بەڵکو خوا تاکە بـە پێچەوانـەی بۆچوونـی دیانـەکان، بیٚ نیـازە بـە پێچەوانـەی بتپەرستەکان، وێنەی نییـە وەکـو تانـەیٚ لەسـەر (حشــویة)کـان، هاوشـانی نییـە بـە پێچەوانەی ئەوانەی بەجۆرە وەسفی دەکەن، هیچ جووڵاویٚ لە خێر و شەڕ لە نهێنی و ئاشـکرا، لەسـەر زەوی و نـاو دەریـا بـیٚ ویسـتی ئــەو ناجوولێتــەوە، ئەمــەش بەرپەرچدانەوەی قەدەرییەکانە. هتد..[1]

---

١ الفيوضات الربانية، ص٢٩ .

٢- شێخ مامۆستای سەرکەوتو پەروەردیارو پێشەوا بوو، نزیکەی حەفتاهەزار کەس دەهاتنە کۆڕەکەی، هەندێ جار ژمارەی مەرەکەب دانەکان دەگەیشتە چوار سەد، کۆڕەکەی لە تۆبەکارە تاوانبارەکان پڕ بوو و ژمارەیان گەیشتە سەد هەزار تۆبەکار، هەروەها پێنچ هەزار گاور لەسەر دەستی موسڵمان بوون.[1] (حافظ ابـــن رجب الحنبلي) دەڵێ: لەبارەی سێزدە زانستەوە دەدوا، قوتابیەکان وانەی تەفسیرو فەرموودەو ڕێباز(مذهـــب)یان لەلا دەخوێند لەسەر ڕێبازی شافعی و حەنبەلی فتوای دەدا هەروەها وانەی خیلاف و ئوسوولْ و ڕێزمانیان لا دەخوێند، پاش نیوەڕۆیان بەهەموو شێوە خوێندنەوەکان قورئانی دەخوێند.[2]

لەئامۆژگاریەکانی ئاماژە بە چەند وشەیێ دەدەم: ئەی ڕۆڵە ئومێدت کورت بکەوە، مکوڕ بوونت کەم کەوە، نوێژی ماڵ ئاوایی بکە، هەر بڕواداریێ نابێ بنویێ گەر وەسیەتەکەی لای سەری نەنووسرابێ، چونکە گەر خوا بەساغی بە ئاگای هێنایەوە ئەمە کارێکی پیرۆزە، گەر نا کەس و کاری دوای مردنی سوودی لێ دەبینن و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، خواردنەکەت خواردنی یەکێ بێ کە ماڵ ئاوایی لە ژیان بکا، بوونت لە نێوان کەس و کارت و بەیەك گەیشتنی برادەرەکانت وەکو یەکێ بێ ماڵ ئاوایی بکات. لەدڵی خۆت گوتەی (من دەڕۆم) ئامادەبکە..هتد.[3]

٤- شێخ زۆر فەرمانی بە چاکە و قەدەغەی لە خەراپە دەکرد، نەدوی گوتی: زۆر حەزی لەحەق بوو، لە فەرمانکردن بەچاکە و قەدەغە لە خراپە زۆر بەهێز بوو گەر بەرامبەر خەلیفە و پاشا و میر و خەڵکی تایبەت و گشتیش بوایە. شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەیفەرموو: پاکی بۆ ئەو خوایە کە ئامۆژگاریکردنی خەڵکی خستە دڵمەوە و کردیە گەورەترین خەمم. شێخ دەیفەرموو: عەزیمەتتان هەبێ و لە ڕێپێدان(رخصـــة) دوور کەونەوە، چونکە ئەوەی فێری ڕێگەپێدان بوو وازی لە

---

١ قلائد الجواهر ص١٩

٢ رجال الفكر والدعوة، للندوي، ص٥٨.

٣ الفتح الرباني، ص٢٨٦.

عەزیمەت هێنا مەترسیی لەناوچوونی ئاینەکەی لێدەکرێت، عەزیمەت بۆ پیاوانە چونکە قورسترو تاڵترە، رێگەپێدان بۆ ژن و منداڵانە چونکە ئاسانترە.[1]

٥- ئاکاری شێخ -رەحمەتی خوای لێبێ-؛ دکتۆر بەدرێژی و بە پوختی باسی ئاکاری شێخی کردووە و رێگابە خۆم دەدەم زۆر بەکورتی ناونیشانی ئاکارەکانی باس بکەم ئای کە جوانن بریتین لە: بەخشندەیی و بدەیی، راستگۆیی، دونیا بەکەم گرتن، ئارام، خۆشەویستی، پشت بەستن بەخوا، نەرم و نیانی، فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردن لە خراپە، خواپەرستی، لەخواترسان و خۆ پارێزی، وەرع).

٦- دکتۆری بەڕێز لایەنی صۆفیگەریی ئاشکرا کردووە بە پێی گوتەی زانا بڕواپێکراوەکان، هەروەها باسی حاڵی صۆفیەکان و مێژووی صۆفیگەری لە ژیانی موسڵمانەکان کردووە، کە پێویستە لە کتێبێکدا بخوێندرێتەوە و کورتە لێرەدا سوود بەخش نییە، هەر کە باسی پەروەردەی صۆفیانەی شێخ دەکا دەری دەخات کە تەنها لەسەر ئەم بنەمایانە وەستابوو: ئارامی، سوپاس، خۆ بەکەمزانی، راستگۆیی، دڵسۆزیی، پشت بەستن بەخوا، زوهد لەدنیا و ویستنی ڕۆژی دوایی، قایلبوون، خۆشەویستی، خەبات و تێکۆشان، بەبەزەیی.

دوای ئەمە؛ دکتۆری بەڕێز کتێبەکەی بە گوتەی هەندێ کەڵە زانا رازاندۆتەوە لەبارەی ژیان و کردەوە و حالەکانی شێخ، هەروەها باسی کتێبەکانی شێخ و گوتەو ڕاسپاردە و خەبەرو چیرۆکە بڕوا پێکراوەکانی دەکات کە لە کتێبەکانەوە وەرگیراون. ئەمەش وامان لێدەکا لەو بڕوایە بین کە ئەم کارە شایانی پاداشتێکی گەورەیە لەخواوە و خوێنەرە بەڕێزەکان متمانەی پێدەکەن، ناڵێم پایەی لەدنیادا پێ بەرز دەبێت، چونکە دکتۆریش وەکو باپیرەی زاهیدە لەبریق و باقی دنیا و هەموو ئەوانەی گوێیان لێی بووەو دەیناسن ئەمە دەزانن.

یاخوا دکتۆری بەڕێز خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە لەسەر ئەم کارە چاکەت و من و خوێنەرە بەڕێزەکانیش سوودی لێ وەرگرین لەبواری زانست و حاڵ و گوتە و

---

١ الفتح الرباني — المجلس: ٦١ .

سلوکدا، خوای گەورە پیرۆزی بخاتە تەمەن و کردەوەت، تەقواو لەش ساغی و سەرکەوتنت زیاد بکاو لەڕۆژی بەپابوونەوە فەزڵ و پاداشتێکی تایبەتیت پێ ببەخشێ و لەگەڵ باپیرە گەورەتﷺ و عبدالقادری باپیرەت کۆت بکاتەوە لەژێر ئالای پێغەمبەرﷺ و ئەوانەی کە خوا نیعمەتی لەگەڵ کردونە لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، بەڕاستی ئەوانە هاوڕێی چاکن.

سەڵات و سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەر و کەس و کارو یار و براو پەیڕەوو خۆشەویستەکانی بێت تا ڕۆژی بەپابوونەوە.

**نووسینی**

**وهبی سلێمان غاوچی**

# پێشەکیەکی تر بۆ کتێبەکە

**بەپێنووسی: شێخ (محمد بشیر الشقفه)**

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس بۆ خودا، درووددو سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا و کەس و کارو یاران و ئەوەی پەیڕەوی ئەو دەکات.

### هونەری ژیاننامە:

ژیاننامەی گەورەپیاوان ئەرکێکی گران و زەحمەتە، ژیاننامەی گەورەپیاوە تایبەتەکان قورسترو گرانترە بەتایبەتی ئەگەر نووسەرەکە کەم توانا و بێ هێز بێ، چۆن دەتوانێ جل و بەرگێکیان بۆ بەرادان بدات کە بگاتە سەری بەرزیان و لەشی گەورەیان داپۆشێ و لەهیچ شوێنێ تەسك و شەپ و شۆڕ نەبێ کە کار بکاتە سەر کەسێتی و گرانیی لەبەر کەرەکەی؟!!

ئەمە ئەو پێوەرەیە کە دەبێ لەناساندنی پیاوان پەیڕەو بکرێ، بەڵێ؛ نووسینی ژیانی کەسێ وەکو بەرادانی بەرگێکە بەپێی پێوەری خۆی، هێندە شەپ و شۆر نەبێ تاپێی بگوترێ درێژو شۆڕە، هێندە تەسکیش نەبێ بگوترێ: لە سێبەری ڕم تەسکترە، بەڵکو پێویستە بڕینەکە دوای ئەندازە بێ، هەر وەك لەم پەندە هاتووە ((ئەندازەی بگرە، ئینجا بیبڕە))، ئەوەی لە ئەندازەگرتن کارامە نەبێ، لەهەڵبژاردنی وشەی ڕاست و دەستەواژەی شایان بەکەسەکەو پلەو پایە و بۆنەکە شارەزا نەبێ، ئەوا ناگاتە مەبەستی خۆی.

سەعدی شیرازی گوتوویەتی:

گەر گوتەیێ ورد بینی لێ نەهاتەدی
وەکو بەرگێکی بێ رادانەو جەڵەبێ
باگوتەکەم بێتن بەڵام بیری تیابێ
چاترە لە قسەی درێژ، هەڵەی تیابێ
هەزاران تیر مەهاوێ بەپەشیمانـــــی
بەبیر تەنیا تیرێ باوێ بـــــۆ پێکانی

ئەوەی گـوتم بـۆ ئەوانـە دەگوترێ کـە سـوار چـاکی گۆڕەپانی کتێـب دانـانن و ژیاننامەی کەڵە پیاوانیان نووسیوە، بەڵام ئـەوەی لـەم بـوارەدا ناشـارەزایە و سـواری ئەم گۆڕەپانە نییە وەکو یەکێکە لـە شـەوی تـاریکی ئەنگوستە چاودا هـەنگاو بنێ، ئـەوەی بەجۆرە بـێ ناگاتـە شـوێنی مەبەسـت و لـە بـزن مشـك گومڕاتـر دەبـێ، پێنووسەکەی لـە دەستی نـاو کۆرپەیـەکی نـاو منداڵـدان بـێ توانـاتر دەبـێ و ئـەو کەسەی دەی‌ناسێنێ و ژیانی دەنووسێ لەمانگی زستان ون تر دەبێت.

شێخی ئیمام : ئەمە حاڵی نووسەری ئـەم ئـەم چـەند دێڕەیـە هەرکـە داوای لێکـرا پێشەکیەك بـۆ کتێبـێ شـێخ عبدالقـادری گـەیلانی بنووسـێ، چونکـە زۆر ڕێـزو شکۆمەندیی لە دەروونیدا بۆ شێخ هەیە و هەروەك بڵێی دەفـرە بچووکەکـەم توانـای جێکردنـەوەی دەریـا پڕەکـەی ئـەوەی نییـە، چاوەکزەکـەم توانـای هـەڵاتنی نییـە لـە نوورو پەرتەویدا، ئەوەندە دەتوانم لەبارەی شێخی ئیمامەوە رەزای خـوای لێ‌بـێ- بڵێم:

-هێشتا نەمتوانیوە بەهیچ دەربڕینێ باسی پایە بەرزی بکـەم لـە بـواری زانسـت و ئـەدەب و پـەروەردەی کەڵـەپیاوان و شـکۆمەندیی پایـەی لـەرووی بەخشـندەیی و توانای یەقینی بە خوای مەزن و کاریگەریی لە دڵان و تـەنیا بوونـی لەچاکەکاری و کۆمەك بوونی هەموو جۆرە شانازییەك لەو، بۆیـە تـەنیا گوتـە لەوانـە وەردەگـرم کـە خـوا دەربڕینەکانی بـۆ ئاسـان کردونـە و پوخـت و رەوانـن، ئینجـا بـەچاکی ڕێـزی شێخیان گرتووەو پایەی ئەویان زانیوە.

-(ابو الحسن الندوی) دەڵێ: ((شێخ عبدالقادری گەیلانی لە بەغدا دەرکەوت و سەرۆکایەتی ئایینی وەرگرت و نزیکەی سەدەیەك وەك تەنیا کەسێ ژیا بۆ بلاوکردنەوەی ئایینی خوا، جیهانی ئیسلامی لە چواردەوری کۆبوونەوەو هێندە کاری لە جیهان کرد کە هیچ زاناو چاکسازێ زۆر لە مێژە ئەو رۆڵەیان نەبووە)).[1]

گوتی: ((لە دیارترین کەرامەتەکانی شێخ عبدالقادری گەیلانی-رەحمەتی خوای لێبێ- زیندوکردنەوەی دەرون و دڵە مردووەکان بوو، چاندنی بڕوا و لەخواترسان و خۆشەویستیی خوا بوو، سەر لەنوێ گەشکردنەوەی پشکۆدانی دڵەکوژاوەکان بوو، خوای گەورە بەهۆی ئەو ژیان و بڕوای بۆ گەلێ دڵ گێڕاوە کە لەژمارە نایەن و هەر خوا دەتوانێ بیان ژمێرێ، بەرێگەی پەروەردەو ئامۆژگاریەکانی بای بڕوا هەڵێکردە سەر دڵە مردووەکان و زیندووی کردنەوە، دەروون گەلێکی کپ بوو چالاکیی تێکەوتەوە، شەپۆلێکی بڕوای نوێ و گیان دارییەکی بەتین و ئاکاری جوان و تەقوا جیهانی ئیسلامی گرتەوە. خوای مەزن سەرکردایەتیی ئاینی و گیانیی بۆ رەخساند لەجیهانی ئیسلامیدا و بەغدای بۆ هەڵبژارد-کە پایتەختی عەباسی و دڵی جیهانی ئیسلامی بوو- خەڵکی بەغدا بۆی هاتن و کۆمەڵەیان لەسەری کرد و نزیکەی حەفتا هەزار کەس ئامادەی کۆڕو کۆبوونەوەکانی دەبوون)).[2]

هەروەها دەڵێ: ((ماوەیێ بوو جیهانی ئیسلامی زۆر پێویستی بە بانگبەرێکی گەل(شعبي) و کەسێتیەکی گیانیی بەرز بوو، کە زۆر پەیوەندیی بە چینەکانی جەماوەرەوە هەبێ و بە بانگەوازیی و ئامۆژگاریەکانی و بە دەرون پاکردنەوە و چاکسازیی کردنی ئاکار و رەوشتەوە، گیانی ئایینی و ژیانی ئیمانی بە کۆمەڵگەدا بکات.[3] ... خۆشەویستی دنیایان لەدڵ کەم بکاتەوە و سنورێ بۆ توندی و

---

١ رجال الفكر والدعوة، ص٢٥٢.

٢ رجال الفكر والدعوة، ص٢٥٦.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٨.

تێژییەکەی دابنێ و بڕوا لەدڵەکاندا زیندوو بکاتەوە و بیروباوەڕی ڕۆژی بەپابوونەوە بووروژێنێ و خۆشەویستیی خوا بخاتە دڵەکان و بیجولێنێ، خەڵکی بەرەو هیمەت بەرزیو کۆشش کردن بۆ هێنانە دیی زانستی خواناسی و پەرستنی و وەرگرتنی ڕەزامەندیی ئەوو پێشبڕکێ لەڕێگاکەی و داواکردنی یەکخواپەرستی تەواوو ئاینێکی بێگەرد هان بدات،[1] ئەم سیفەتە چاکسازییانە لە کەسێتیی شێخ عبدالقادری گەیلانیدا هەبوو))[2] ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

## پزیشکی دانەر :

دانەری ئەم کتێبە بەڕێز (عبدالرزاق) گەیلانی لە پزیشکیی مرۆڤیدا پسپۆڕە، لەنووسینەکەیدا کارامە و هەڵکەوتوو بوو هەروەك هاوڕێکانی گەواهیی بۆ دەدەن، لەگەڵ ئەوەش مرۆڤێکی بەئاکارو سلوك جوان و پابەند بە ئاینەکەی بوو، دەیزانی چیی بۆ هەیە و چیی لەسەرە بیکات، پیاوێکی هێدی و لەسەرە خۆو ئاکار بەرز و زۆر بە ئەدەب و خاوەن سروشتێکی بێ فیز بوو، سوور بوو لە سەر هاوڕێیەتیی زاناو پیاوماقولان، بەجوانی گوێی لە ئامۆژگاریەکانیان دەگرت، حاڵی دڵسۆزەکان زۆر کاری تێدەکرد، ئارەزووی لە خوێندنەوە بوو، بەوردی و تێگەیشتنەوە سەیری وردەکارەکانی دەکرد و لایەنە شاراوەکانی دەزانی، حاڵی خەڵکیی دەزانی و لەواقیعیانی دەکۆڵیەوە، بۆیە کتێبێکی لە پەندی پێشینان و یەکێکی تری لە حەکایەتی پێشینان و سێیەمی لە تەندروستی دانا.[3] ئەو لەو بڕوایە نەبوو کە بوێژ(ادیب)ێکی لێهاتووە، یاخۆ سوارچاکێکی ڕەوانبێژی و زمان پاراوییە، یا لە هەڵکەوتووەکانی ڕەوانبێژی و شیعرە، بەڵکو لە نووسینەکانیدا شێوازێکی سادەی وای بەکار دەهێنا کە خەڵکی ڕەمەکی تێبگەن، نیشانەی هەرە دیاری کتێبەکەی لایەنی هۆشمەندییە و بەتەواوی لە باسکردنی کەرامەتەکانی شێخ

---

١ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٠.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٢.

٣ کتێبی (الامثال الحموية) وکتێبی (کان یا ما کان) وکتێبی (المحنة في احاديث الطب والصحة) وهیتر.

دوور کەوتۆتەوە و لەم بارەیەوە باسی هەرشتێکی کردبێ پێشەکیەکی زانستیانەی لەلایەن وانەبێژێکی رووسییەوە پێشکەشکردووە،[1] بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کەئەم جۆرە پێشبین(کرامـــة)انە زانست و تاقیکردنەوە پشتگیری دەکەن و پشتی بەم گوتەیە بەستووە ((الاستقامة عين الكرامة: مانەوە لەسەر پەرستنەکان چاوی پێشبینییە.))

هەروەها چەندەها جار جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە پەیڕەو(منهج)ی شێخ پەیڕەو کردن بوو نەك داهێنانی شتی تازە، دەقەکانی قورئان و فەرموودە ئیمامی بوو، بیروباوەڕی وەکو پێشینەکان(سلف) بوو، رێبازەکەی رێبازێکی خوایی بوو، رێگەی موحەمەدی بوو، شەریعەتەکەی ئیسلامی بوو، ڕاستیەکەی ئیحسانی[2] بوو، لەبارەی دانەرەوە هێندەی لێدەزانم، ئومێدم وایە وەك وتم وابێ، کەس لەخوا بەپاکتر نازانم.

لەبارەی بابەتی کتێبەکەوە لەوانەیە لەودیو پەردە هەندێ هۆ هەبن کە دانەر هەڵی بژاردووە، خۆی کاریگەری پەروەردەی گیانی بینی لەبنیاتنانی گەنجەکان بەتایبەتی ئەگەر ئارەزووی پیس و شتە هەڵخەڵەتێنەرەکان گەمارۆی دابن و ئاژاوە تەنگی پێ هەڵچنیبن، ئەگەر ئەو گەنجانە خاوەنی ویستی بەهێز و گیانی پاك و سۆزی وروژاوبن بەخۆشەویستیی خواو ڕۆژی دوایی هیچ شتێ بەسەریاندا زاڵ نابێ، دانەر لەرووی ئەزمون و گەواهیی دیارەوە لە مێژووی بانگەوازیی و چاکسازیدا کەسێتیی بەناوبانگی گەیلانیی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی بە بانگەوازکارەکان(الدعاة) بڵێ: لە ئیسلامدا کۆمەڵە گەنجینەیەك هەیە دەبێ بەکار بهێنرێن و کۆ توانایەکی گیانی هەیە پێویستە بەرهەم بهێنرێن، لەناوچوونی ئەم توانایانە نەمانی کۆمەڵە ڕەگەزێکی گرنگی بانگەزوازیە و کەم و کوڕییەکە لەئیسلامی تەواو و بۆچوون و گشتگیرییەکەی، ئەم توانایانەش بریتین لە: پاکردنەوە(تزكيـــة) و پەروەردە، گرنگی دان بە بێگەردی گیان و پاکیەکەی و

---

[1] سەیری ل ٢٥٥ بکە لە کتێبەکە.

[2] احسانية: أن تعبد الله كأنك تراه، فإن لم تكن تراه فأنه يراك. (وەرگێر).

زانینی ورده کاریه کانی یه کخواپەرستی و زانستی ئیخلاس و ڕاستیی دڵنیایی(حقیقة الیقین).

ئه گەر ئەم زانستانه لەقوتابخانەی صۆفیگەریدا هەبن، ئەوا ناوه کەیی و ئەو بیدعەو لادانانەی کەتێی کەوتووه نابێ ببێته هۆی دوورکەوتنمان لێی، ئەو زانستانه لە کرۆك و دڵی ئیسلامن، لەجیاتی ئەوەی هەمووی ڕەدبکەینەوە، ئەوا لەبێژینگی دەدەین و دەیپاڵێوین، تا دەبێتەوە ئاوە پاکە کەی جاران و بەگەروودا دەچێو هیچی وای تێدانییە کەلەگەڵ قورئان و فەرمووده نەگونجێ و کۆمەڵی پێشینەو زانا پێشەواکان کاریان پێی نەکردبێ.

ئەمەش ئەوەبوو، کە گەیلانی پەیڕەویی کردو دانەریش لەکتێبەکەی پێی لەسەر ئەم خاڵە دادەگرێ. وابزانم یەکەم هۆی هەڵبژاردنی بابەتی کتێبەکە ئەمەیە، لەکتێبەکەدا بەشێکی لەسەر صۆفیگەرییە و بەویژدان و بەحەق هەڵس و کەوتی لەگەڵ کردووەو دوور لە دەمارگیری مافی خۆی داوەتێ.

**داد و دادوەری:**

+ ئەوانەی ناوی صۆفیگەری ڕەد دەکەنەوە تەوازۆ(عـذر)دارن، زۆر لەخۆ دەکەن ئەوانەی بەپێوەنانەوەباسی بنەچەو ناو و پێکهاتەکەی دەکەن، زیان مەندن ئەوانەی هەرشتێ جۆرە دەمارگیرییەکی تێدابێ بێ وردبوونەوە ڕەدی دەکەنەوە، ستەمکارن ئەوانەی ڕەفزی هەموو کەسێ دەکەن کەئەو ناوەیان لێیە بێ‌ئەوەی ئاگاداری حاڵ و کردەوەو بیروباوەڕیان بن، ئەوانەی حوکمی یەکێ بەسەر گشتدا و هەندێ بەسەر زۆرداو چینێ بەسەر کۆمەڵێکدا و تاکی بەسەر هەموو خەڵکدا و حوکمی تاوانبارێ بەسەر شارەکەیدا دەدەن، نەزانن.

+ ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن، کە بنەماو تەرازو و حوکم و کردەوە بۆ قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ دەگەڕێتەوە، بۆیە هەموو موسڵمانێ شانازی پێوە دەکا و داوا لەخۆی و کەسانی تر دەکا کەپابەند بێ پێی و کارەکان بەم تەرازووە کێشانە بکەن. ئەم بنەمایەش یەکێتیی هزر(فکر)ی و زانستی و کردەوەیی

موسڵمانەکان پێکدێنیٚ و دوان لەمە جیاوازییان نییە و لەسەریی ململانیٚ ناکریٚ.

کەواتە ئامانج یەکێکە، بەڵام دژایەتی لە تێگەیشتنی دەقەکان و لێکدانەوەیان، یا لە بارەی ڕاستی و چەسپانی، یا لە سڕینەوەی ئایەتەکان ڕوودەدا. قورسترینیان لە خافڵەتی هەندیٚ ڕوودەدا بەرامبەر داوایەکانی ئیسلام و پشتگویٚ خستنی هەندیٚ لە حوکمەکانی، خوا دەفەرمویٚ ﴿فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ: لەو بڕیارەی کە دەگەڵ ئەوانمان دابو، خۆیان لە چەند بەشێکی بوارد. ئیتر ئێمەش کارێکمان کرد، شەڕ و ئاژاوە لەناویان بەردەوام بیٚ هەتا قیامەت؛ لە جەزای ئەو کردەوانەی ئەوان کردیان. ﴾[1]

+ تەوازۆ(عذر)ی ئەوانەی هەرشتیٚ لە قورئان و فەرموودە نەبیٚ ڕەدی دەکەنەوە قەبوولە، خۆڕسك(فطرة)ی موسڵمان لەسەر ئەمە هاتووە، هەر ناو و بیر و یاساو بنەماو ڕێساو بیروباوەڕو زاراوەو یاسادانیٚ کەلەم دوو سەرچاوەیەوە نەهاتبن خۆرسکی موسڵمان ڕەدی دەکاتەوە و لێی دوور دەکەوێتەوەو بەپیس و گڵاوی دەزانیٚ، تەنیا ئەگەر ئەو زانستانە بۆ کە دەبنە یاریدەدەری تێگەیشتنی قورئان و فەرموودە و، بە هۆیانەوە شتیان لیٚ هەڵدەهێنجریٚ و تێگەیشتنیان ئاسان دەبیٚ و بەخەڵکی ڕادەگەیەنریٚ.

+ نابیٚ موسڵمان بەخەیاڵی دابیٚ کە هەموو کارو پەرستنێکی لیٚ وەردەگیریٚ، مەگەر شەرلِی و دروست بێت، بە (فضیل کوری عیاض)یان گوت: واتای ئەم فەرموودەیەی خوا چییە ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾؟ گوتی: ڕاستترینیان و بەئیخلاس ترینیانە، خالیس ئەوەیە بەتەواوی بۆ خوا بیٚ، ڕاست ئەوەیە لە سەر سوننەت بێت، ئەگەر کارەکە خالیس بوو و لەسەر سوننەت نەبوو ئەوا وەرناگیرێت، ئەگەر لەسەر سوننەت بوو بەڵام خالیس نەبوو، هەمیسان

---

[1] المائدة /١٤

وەرناگیرێت، ئەو کردەوەیە وەردەگیرێ کە بە تەواوی لە ڕێی خوابێ و لەسەر سوننەتی پێغەمبەرﷺ بێت.

+ پەیڕەو کردن دەبێ لە هەموو شتێکی ژیانی موسڵمان بێت لە عەقیدە و نیاز و ئیخلاس و ویستنەوە تا دەگاتە گوفتار و یاد(ذکـر)کردن و کردەوە و پەرستن، خۆشویستنی خواش بەمە نەبێ نایەتە دی، خوا دەفەرموێ ﴿فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ : شوێن من بکەون هەتا خوداش خۆشی بوێن.﴾[1]

دوای ئەمە باسەیری ناوی صۆفیگەری(التصوف) بکرێ کە ئاماژە بە چ ڕاستی و زانست و زانیاري و کۆشش و هەوڵدان و زوهد و پەرستن و یادکردن و بیرکردنەوەیێ دەکات، هەندێك لەمانە لەگەڵ کاکڵەی ئیسلام و حوکم و داواکارییەکانی یەکە، بابەشێوەیەکی شیاو ناوی لێ بنرێ چونکە خوا زیاتر پێی قایلە و لە دڵی بڕواداران قەبووڵ ترە و زیاتر متووی گیانیانەو لەگەڵ لۆجیکیان دەگونجێ و چاکتر واتای ویستن دەگەیەنێ و ئاماژە بەمەبەست و ئامانج دەکا و مراز دەناسێنێ، چونکە یەکەمین سوودەکانی ناو دیاریکردنی واتاو ناوەرۆکە.

+ ئەگەر بەوردی سەیری واتای زمانیی وشەی (صۆفیگەری)مان کرد لەبنەماوە گەر دانیمان کۆلیەوە دەبینین پەیوەندی بە ڕاستییە زاراوەییەکەوە نییە نە لەنزیك و نە لەدوور، سەرەڕای ئەمەش ئەم ناوە لای پێشینەکان بەناوبانگ نەبوو و بەکار نەدەهات.

+ بەڵام هەرکە لە دادوەریکردنی مێژوو دەستەوستان دەوەستین کە بەچەند سەدەیێ ئەم ناوەی بەم گروپە لکاند تا گەیاندیە ئێمە.

+ هەروا کە لەوەستانی بەردەوامبوونی ئەم زاراوەیە بە دەنگی کز و وشە کەمەکانمان خۆمان بێ هێز دەبینین و هەست بەوە دەکەین کە لە ئێمەڕەت دەبێ و دەگاتە چەندسەدەی داهاتوو، لێرەدا دەمانەوێ بۆ زانست و ویژدان تۆماربکەین کە: دەمارگیری بۆ ناوی صۆفیگەری و مکوڕ بوون لە سەر پاراستنی جێی خۆی

---

[1] آل‌عمران/٣١

نییە، بەتایبەتی کە بۆمان دەرکەت رەبەنە صۆفییە دیانەکان و بووزییەکان و جگە لـە گاورەکانی تر ئەم ناوەیان لێ بووە.[1]

+ هـەروا زۆر ستەمە بـۆ صۆفیگـەری صۆفییـەکان کۆمـەڵێ ڕاسـتیی ئیمـانی و ئاکـاری نمونـەیي تـەنیا لـەبـەر ناونـانی بـەم نـاوە رەد بکەینـەوە و پشـتگوێی بخـەین. زیانمەندە ئەوەی ئـەمجۆرە حوکمـە ستەمکاریانە دەدا بەسـەر صۆفیگـەریدا، دووجـار دەستدرێژی کردووە، جارێکیان ستەمی لەزانست کردووە و جارێکیش سـتەمی لـە صۆفیـەکان کـردووە، ئایـا زانستەکەیان زانستی ئیحسـان یـا زانسـتی ئیخـلاس یـا زانستی بەندایەتی[2] یا زانستی پاککردنەوە(تزکیـــة) نییـە؟ ئایـا ئەهلەکەشـی خوایـی نین[3]، ئەهلی خوا، زانایانِ بەخوا، ئەهلی یادکردنەوە(ذکـــر)، خواناسـەکان نـین ؟ خوا دەفەرموێ: ﴿فَسْئَلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾[4]، هـەروەها خـوا فەرموویەتی: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا﴾.[5]

+ صۆفیگـەری و پـەیڕەوانی بەهـەر نـاوێ نـاو نرابـن تـۆ ئـەو نـاوە لـەقورئان و فەرموودە بەدی دەکەیت، ناوەکە نیشانەی ئـەو گروپـەو پسپۆڕییانە بـێ هیـچ تـەم و مژو گومانێك.

وشـەی (تصـوف) وەکـو وشـەیەکی کولتـووری دەمێنێتـەوە و واتـای چـەند ڕاستیەکی ئیمـانی بـە دەستەوە دەدات، نـاکرێ لەبەر واتایەکی پشتگوێی بخـەین، هەروەها نابێ وەك بڵێی دەقێکی قورئان و فەرموودەیە بـۆی بکەوینـە دەمارگیرییـەوە و نابێ موسڵمان حەزبکا ئەم ناوەی لێ بنرێ دوای ئەوەی خـوای مـەزن بـە (مسلم)

---

[1] ئەمانەی باسکران جۆرێك لە صۆفیگەرییان هەبووە، بەڵام ناوی (صوفی) یان لێ نەبووە و (صوفی) تایبەتە بە ئیسلام. (وەرگێر)

[2] سەیری کتێبێ (العبودیة) ی ئیبن تەیمیە بکە.

[3] سەیری کتێبێ (ربانیة لا رهبانیة) ی ئەبوحەسەنی نەدوی بکە.

[4] النحل/٤٣

[5] الفرقان/ ٥٩

ناوی هێناوه هەروەك دەفەرمووێ ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ : خوا ناوی لێناون موسڵمان. ﴾.[1]

**داد(الانصاف):**

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ: بەدادگەرانە بكێشن. ﴾

بێ ویژدانیە شتی خەڵك بە سوك دابنێین، بەگشتی ئەمەش لە گەنەڵی بیروباوەڕ و گومانەوە سەر هەڵدەدا، ئەوەی خەڵكی بەپاك و بێ تاوان تێدەگا پێویستە بە توندوتیژی حسێبیان لەگەڵ بكاو لێیان بپێچێتەوە، ئەگەر یەكێكیان هەڵەیەكی كرد رەخنەی لێدەگرین و، خێرو چاكەكەی رەد دەكەینەوە هەروەك چۆن گوناهو خراپەیمان رەد كردەوە، خۆی و ئەوانی وەك ئەوو پەیڕەوانی و ئەوەی پێی قایلە یاخود ستایشی دەكا یا لەگەڵی دادەنیشێ رەفز دەكەین، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ: بەدادگەرانە بكێشن. ﴾.[2]

بەڕاستی گشتگیری(التعمیم) نالەبارە و خوای مەزن بەقەد تۆزقاڵێ ستەم لەكەس ناكا، هیچ زانایەكی ئیسلام دەستكوژی قەسابی گوناهكاری حەرام نەكردووە لەبەر گوناهەكەی ئەگەر بەشەرعی سەری بڕیبێ، بەڵكو ئەو دەستەی كە بە ئەنگوستیلەی زێڕ گوناهكارە كوشتیی پێ حەڵاڵ دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرمانی رشتنی ئەو ئاوەی نەكردووە كە مێشی كەوتووەتێ، بەڵكو فەرمانی فڕێدانی مێشەكەی داوەو ئاوەكە هەر شایانی خواردنەوەیە، هەروەها فەرمانی نەداوە كە قاپ و قاچاخی گاوران بشكێنرێ و جل و پۆشاكیان بسوتێنرێ، بەڵكو رێگا دراوە دوای پاككردنەوەیان سوودیان لێ وەربگیرێ، فەرمانی نەداوە ئەو قاپەی سەگ دەمی تێناوە لەناو ببردرێ، بەڵكو فەرمانی پاككردنەوەی داوە بە خۆڵ و ئینجا ئاسایی بەكار دەهێنرێ، لە شەریعەتمان نمونەی ئەمانە زۆرن وهەموو ئەوە دەگەیەنن

---

١ الحج/٧٨

٢ الرحمن/٩

که لەسەر موسڵمان پێویستە ئەوەی زیان بەخشە لای بباو سوود بەخش بهێڵێتەوە، بەقەد خۆی زیانەکە لابەرێ نەك زیاتر، بەپێی توانا سوود بەخشەکە بهێڵێتەوە، وەکو ئەو ورچە نەبێ کە مێشێکی لەسەر سەری خاوەنەکەی بینی بەردێکی زلی پێداداو خاوەنەکەی کوشت و مێشەکەش هەڵفڕی، خوا دەفەرموێ:

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ﴾.[1]

+ بەڵێ ئەمجۆرە نموونانە لە شەریعەتی ئیسلامدا زۆرن، زانایانی ئیسلام بڕیاریان داوە کە تۆبەکردن لە ئیسلامدا لە تاکە خودێکدا دەبێتە چەند پارچەیێ، هەروەك گوناهیش پارچە پارچە دەبێ، جا چۆن سزای خەڵکانێ بدەین بە تاوانی کەسانێ تر ؟ زانایان بڕیاریان داوە ئەگەر موسڵمان لەسەر دوو گوناە یان زیاتر بەردەوام بێ و ئەگەر تۆبەی لە یەکێکیان کرد تۆ بەکەی وەردەگیرێ، خوای گەورە حسێب لەگەڵ زەکات نەدەر ناکات لەسەر نوێژ نەکردنی ئەگەر نوێژ کەر بێ، سزای ئارەق خۆرەوە نادا لەسەر بەڕۆژوو نەبوونی ئەگەر بەڕۆژوو بێت، هەروەها حسێب لەگەڵ دز ناکات لەسەر داوێن پیسی ئەگەر داوێن پیس نەبێ، بەمجۆرە تاوان و گوناهیش لەتلەت دەبێ.

جاری وا دەبێ پاداشت و سزا لە چاکەو خراپە لەکەسێك کۆ دەبێتەوە، لەسەر چاکە پاداشت دەکرێ و لەسەر خراپە سزا دەدرێ هەروەك بوخاری لە (صحیح)ەکەی دەیگێڕێتەوە: ((**إِنَّ رَجُلاً كَانَ يُسَمَّى حماراً، وَكَانَ يُضْحِكُ النَّبِيَّ ﷺ، وكَانَ يَشْرَبُ الخَمْرَ، وَيَجْلِدهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَأُتِيَ بِهِ مَرَّةً، فَقَالَ رَجُلٌ: لَعَنَهُ اللهُ، مَا أَكْثَرَ مَا يُؤتَى بَهَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ تَلْعَنْهُ، فَإِنَّهُ يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ**: پیاوێ ناوی کەر بوو و پێغەمبەری دەهێنایە پێکەنین و ئارەقی دەخواردەوە، پێغەمبەریش جەلدەی لێدەدا، جارێك هێنایانە لای پێغەمبەر، پیاوێ گوتی: نەفرەتی خوای لێ بێ چەند زۆر دەیهێننە لای پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەر پێی

[1] الرحمن /٩

فەرموو: نەفرەتی لێ مەکە چونکە خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێ.))[1]

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە تاوانباری مەیخۆر و شتی تر، دەشبێ خواو پێغەمبەری خوایان خۆشبوێ، خۆشەویستیی خواو پێغەمبەری خواش بەتینترین بنەماکانی ئیمانە، چ جای ئەوکەسەی کە حوکم لەسەر کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر دەدا لە زاناو خواپەرست و زاهد و خواناس و پەروەردیار و رابەر بەهۆی تێکچوونی هەندی لە وانەی کەسەر بەمانەن، حوکمی گەندەڵیی لەسەر هەموویان دەدا، پەنا بەخوا لەو حوکمە ستەمکارە، دەبێ خاوەنی ئەم بڕیارە چەند لەویژدان و تێگەیشتنی ئیسلام و زانستیی ئاین دووربێ، خوای مەزن فەرموویەتی ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ: کەس گوناهی کەس هەڵناگرێ.﴾[2]

گروپەکانی شیبوونەوە(الحلولیة) و یەکبوون (الاتحادیة) و نادیاری (الباطنیة) و هەرەیی(الاباحیة) کە پەرستنەکانیان پەکخستووەو ئەوانەی وای بۆ دەچن کە حەقیقەت و شەریعەت و دیار و نادیار جیان، هەروەها ئەوانەی پیاوچاك(ولي) بەبێ گوناە و لە پێغەمبەر بەگەورەتر دەزانن، ئەوانەی بڕوایان بە لە ناوچوونی ئاگرەو، موسڵمان و گاور لەئەنجامدا بە یەکسان دەزانن، ئەمەو گەلێ قسەی ترو گەلێ چین و تاقمی تر کە دژی وشەی یەکخواپەرستین و، بەهۆی دژایەتیکردنی دەقە چەسپاوەکان لەئاین دەردەچن، ئەم کارەی وان دڵی هیچ موسڵمانی پێی قایل نابێ و تەنیا دەروونی ستەمکاری وەك خۆیان ئارەزووی لێدەکا تا بەر ئاگر بکەوێ.

موسڵمان کەبڕوای بەئیسلام هێناوە بۆ بەیەك زانینی خوای مەزن و پەیرەویکردنی پێغەمبەرﷺ، بۆیە نابێ لەپیسترین دەرگای کوفر و زەندیقیەوە لە ئیسلام دەربچێت، دەبێ وەڵامی موسڵمان بۆ ئەوانە وەکو وەڵامی ئەو ئەو تاقمە یارەی پێغەمبەر بێ کە لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ فەرمانیان پێکرابوو کە گوێرایەڵی

---

١ سەیری ( فتاوی ابن تیمیة) بکە ( ب ١٠ ،ل٨، ١٦).

٢ الاسراء /١٥.

گەورەی خۆیان بن، گەورەکەیان فەرمانی پێکردن کە خۆیان بخەنە ناو ئاگرەوە، گوتیان: ئێمە لە ترسی ئاگر بەرەو پێغەمبەرﷺ رامان کرد، ئێستا چۆن خۆمانی تێدەخەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((**لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا،إنّما الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ**: گەر خۆیان بخستایە ناو ئاگرە کە لێی دەرنەدەچوون، چونکە لە چاکە گوێرایەڵی دەکرێ.))[1]

+ بەڵێ، ئەو گروپانەی خۆیان خزاندە ناو صۆفیەکان و بەمەکرو فێڵ هەندێ گوتەی گومانداریان خستە ناو کتێب و وتارو شیعرەکانیان تا پاکانیشیان شێواند، نابێ ئەمە پەردەیێ دروست بکا لە نێوان ئێمەو صۆفیە بەویژدانەکان بۆ ئەوەی گوتە راست و چەوتەکان جیا بکەینەوەو سوودی لێ وەرگرین و چاکەکەی بناسین و لە خراپەکەی دوور کەوینەوە، ئیبن تەیمیە[2] -رەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێ: ((هەندێ گرووپی بیدعەچی و زەندیق دراونەتە پاڵیان بەڵام بە بۆ چوونی صۆفیە لێکۆڵەرەکان ئەوانە لەمانە نین)).

ئیسلام فێری تیۆریی دابڕانی هەق لە بێژەرەکەی و خێر لە بکەرەکەی کردین، حەق و چاکە و خێر بە چاوپۆشین لە خاوەنەکەی حەق و چاکە و خێرە، هەروەها خراپەش خراپەیە.

ئەوەتا حەسانی کوڕی سابیت بە قەسیدەیەکی (مطعم کوڕی عدی) دەلاوێنێتەوە کە لە سەر بێبڕوایی مردووە و سوپاسی کارە چاکەکەی کردووە کەوا پەنای پێغەمبەریﷺ داوە تا چووەتە مەککە، ئەو ڕۆژەی کە قورەیش نەیهێشت لە (تائیف) بگەڕێتەوە، لە شیعرەکەدا دەڵێ:

پەنای پێغەمبەری خوات دا لە ناویان تاکو بوونە
بەندەت تا حاجی لەبەیك دەڵێ و ئیحرام دەبەستێ
هێشتا خۆری ڕووناك لە سەریان دەرنەکەوتووە
وەکو ئەو کە لە هەموویان بەڕێزترو مەزنتر بووە

---

[1] سیرة ابن كثير ( ج ٣ – ص ٤٢٧).
[2] مجموع الفتاوي ( ج ١١ – ص ١٨).

+ پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی بەدردا فەرمووی ((**لو كان المُطْعِمُ بنُ عـــديّ حيـاً ثم سألَني في هؤلاء النَّتْنى لو هبتُهُمْ له**: ئەگەر موتعیم کوڕی عەدی زیندووبایە داوای ئەو بۆگەنانەی بکردایە هەموویانم پێی دەبەخشی.))[1] مەبەستی ئەوەیە کە تکاکاری ئەوی دەربارەی هەموو دیلەکانی بەدری قبوڵ دەکرد، ئەمەش لە تۆڵەی ئەو چاکەیەی کە لەگەڵ پێغەمبەری کردبوو و لەسەر کوفریش بوو.!!!

+ پێغەمبەرﷺ ستایشی ئاکاری جاهیلیەکانی کرد کە بتپەرست بوون، فەرمووی ((**يَا عَلْي، أَيَّةُ أَخلاَقٍ لِلْعَرَبِ كَانَتْ فِي الجَاهِلِيَةِ ؟ مَا أَشْرَفَهَا ! بِهَا يَتَحـــاجَزُونَ فِي الحَيَاةِ الدُّنيَا**: ئەی عەلی، عەرەب لەجاهیلیدا چ ئاکارێکیان هەبوو ؟ چەند بەرز بوو ! بەم ئاکارەوە لە ژیانی دنیا هەڵس و کەوتیان دەکرد و لەسەری مکوڕ بوون.))[2]

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەرﷺ زەمی شیعری دەکرد، بەشان وباڵی نیو بەیتە شیعری هەڵگوت و فەرمووی ((**أَشْعَرُ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَتْ بِهَا الْعَرَبُ كَلِمَـــةُ لَبِيـــدٍ**: چاکترین وتەی شیعری کە عەرەب گوتبێتی وتەی لەبیدە)). بەشێوەیەکی تر ((**أَصْدَقُ بَيْـــتٍ قَالَهُ الشَّاعِرُ– أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ– إِنَّ أَصْدَقَ بَيْتٍ قَالَتْـــها الشُّـــعَرَاءُ**: چاکترین بەیت یان وشە کە شاعیر گوتوویەتی:)) ((**أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَـــلاَ اللَّـــهَ بَاطِلٌ**: هەموو شتێ بێ خوا بێهودەیە.))[3]

ئەم ستایشەش هەر لەبەر ئەوەیە کە گوتەکەی لەگەڵ حەق و واقیع دەگونجێ. هەروەها ستایشی شیعری (أمية کوڕی أبي الصلـــت)ی کرد لەگەڵ بڕوانەهێنانی، پێغەمبەر فەرمووی ((**آمَنَ شِعْرُ أُمَيَّةَ بِن أَبِي الصَلْت وَكَفَرَ قَلْبُـــهُ**: شیعری ئومەییە

---

١ سيرة ابن كثير ( ج ٢، ص ١٥٤).

٢ سيرة ابن كثَير ( ج ٢، ص ١٦٩) ئاماژەی پێ کرد کە فەرموودەیەکی غەریبە.

٣ گێڕانەوەکان هەمووی لە (صحيح مسلم) ە (ج ١، ص ١٧٦٨) کتێبی شیعر.

بڕوای هێنا و دڵی بڕوای نەهێنا.))[1]، کوفرەکەی ئەو پێغەمبەرﷺی قەدەغە نەکرد لەوەی کە ستایشی شیعرەکەی بکات، چونکە ئیمان و یەکخواپەرستی لە شیعرەکانیدا شەپۆلی دەدا، لە (صحیح)ی موسیلم هاتووە ((**وَكَادَ ابْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ**: هێندەی نەمابوو ئومەییە موسڵمان ببێت.))[2]

لەکۆتاییدا : ئایا ئەو نموونانەی کە هێنامانەوە بۆ گێرەشێوێنەکان سەلمێنەر نین کە ویژدانی هەبێ و پەیڕەویی ڕێگەی بەویژدانەکان بکا ؟!

﴿أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ: ئایا فەرمان دەدەن کە خەڵك چاکە بکەن و خۆشتان لەبیر دەکەن ؟!﴾[3]

+ گەر ئێمە داوای پەیڕەویکردن لەخەڵك بکەین و خۆشمان پەیڕەوی نەکەین، کەواتە ئێمە چین ؟ ئێمە زانیمان کە بێلایەنی لەگەڵ دەقەکان و ئەوەی لە پێشینان وەرگیراوە نییە، یا پەیڕەوی کردن یاخۆ بیدعە پەیدا کردن، پلەی مام ناوەندی لەم نێوانەدا نییە و ناو بڕە لە نێوان ئەم دوو حاڵەدا نییە و ئەعراف لەنێوان بەهەشتی پەیڕەویکردن و دۆزەخی بیدعە کردن نییە، یا بۆ لای ئەوانە، یا بۆ لای ئەمانە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە وەکو ئەوانە مەبن کە گاور بوون.﴾[4] ئاکاری گاورەکان ئەوەیە، کە لە لای دوژمنیان دان بەحەق و خێر دانێن، هەر لەبەر ئەوەی دوژمنیانە، هەر چەند ئەگەر بشزانن، کە دوژمنەکەیان هەندێ لەسەر حەقە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَـٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ : جولەکە گوتیان

---

١ سیووتی لە (الجامع الصغير) هێناویەتی (ج ١، ص ٤).

٢ سەیری (صحيح مسلم) بکە (ج ١، ص ١٧٦٨).

٣ البقرة / ٤٤ .

٤ آل عمران /١٥٦

دیانه‌كان له‌سه‌ر هیچ نین، دیانه‌كانیش گوتیان جوله‌كه له‌سه‌ر هیچ نین، هه‌ر دوو لایان كتێبی ئاسمانی ده‌خوێننه‌وه. ﴾[1]

هه‌روه‌ها خوای مه‌زن ده‌فه‌رموێ: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا: هه‌رچه‌نده له دڵه‌وه بڕوایان به‌نیشانه‌ی ئایه‌ته‌كان هه‌بوو، به‌ڵام له‌رووی سته‌مكاری و خۆبه‌زل زانینه‌وه ئینكاریان ده‌كرد. ﴾[2]

+ بڕوادار شایانی ئه‌وه‌یه خوو به‌ئاكاری قورئان بگرێ، نه‌ك به‌ئاكاری گاوره‌كان، قورئانی پیرۆز له‌باسكردنی ئاره‌قیش دادگه‌ر بووه كه ده‌فه‌رموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ: ئه‌ی محه‌مه‌دﷺ له‌باره‌ی ئاره‌ق و قومار پرسیارت لێده‌كه‌ن، بڵێ تاوانێكی گه‌وره‌یان پێوه‌یه و هه‌ندێ سودیشیان بۆ خه‌ڵكی هه‌یه. ﴾[3]، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی ئاره‌ق (دایكی گوناهه‌كانه) به‌ڵام سوده‌كانی دیاریكردووه، ئینجا حه‌رامكردنی هه‌ڵبژاردووه ﴿وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا: گوناهه‌كانیان له‌سوده‌كانیان گه‌وره‌تره. ﴾.. هه‌روه‌ها گاور بوونی فیرعه‌ون وداوای خوایه‌تی كردنی له‌ته‌رازووی رێز گرتنی دانه‌به‌زاند و فه‌رماندرا كه به‌نه‌رمی قسه‌ی له‌گه‌ڵ بكرێ و به‌كونیه بانگ بكرێ: ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ: جا به‌نه‌رم و نیانی قسه‌ی له‌گه‌ڵدا بكه‌ن به‌ڵكو بیر بكاته‌وه یا له‌خوا بترسێ. ﴾[4]، گوتی: به‌كونیه[5] بانگی بكه‌ن، پێی بڵێن: ئه‌ی باوكی (مُرّه).أ.هـ .

---

[1] البقرة /١١٣ [2] النمل /١٤

[3] البقـرة /٢١٩ : مه‌به‌ست له‌سود ئه‌و قازانجه‌ی كه له بازرگانیه‌كه‌ی به‌ده‌ست دێت، به‌ڵام خواردنه‌وه‌ی به ته‌واوی زیان به‌خشه، بۆ زانین خواردنه‌وه‌ی و بازرگانیه‌كه‌ی به‌پێی قورئان و فه‌رمووده حه‌رامه.

[4] طه /٤٤

[5] التدريبات الادارية—للكتاني (ج١—ص٣٩٠)، وبدائع الفوائد— لأبن القيم ( ج ٤ - ص ١٢٢).

+ ئای ئەو کەسانەی کە دوژمنایەتیی ئەم ناوەو ئەهلەکەی دەکەن چەند دوورن لەئاکاری قورئان هەرکە پشت لەکۆمەڵە ڕاستی و زانستیٚ دەکەن، کە تایبەتن بە صۆفیەکان و لە جەرگەی ئیسلام هەڵقوڵاون و کاکڵەی ئەون، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بیٚ ئاگان لە هەندیٚ لایەنی شەریعەتی ئیسلام و داواکاریەکانی، یا لەڕاستیی زانستەکانیان نەگەیشتوون و بەجۆرە کینایەو وەرگرتن و خوازە، یاخود بەلقەکانی روونبیٚژی و ڕەوانبیٚژی و واتا بیٚژیی تیٚگەیشتوون. ئەم هەردوو نەزانینە دوژمنایەتیان لیٚ دەتکیٚتەوە هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ : هەندیٚ لەئامۆژگاریەکانیان لەبیر بردەوە، جا لەبەر ئەوە تارۆژی بەپابوونەوە دوژمنایەتیمان لەنیٚوان دیانەکان سازدا﴾[1]..

+ ئەوانەی بەئاشکراو ڕاستەو خۆ سیٚیەکی ئیسلام بەدیواردا دەدەن، ئەوانە لەهەموو کەسیٚ زیاتر دوژمنی ئەوانەن، کە گرنگی بەم سیٚیەکە دەدەن کە (ئیحسانە)، ئیحسانیش ئەوەیە: تۆ خوا بپەرستی وەك ئەوەی کە ببینی، گەر تۆش ئەو نەبینی ئەو (خوا) تۆ دەبینی، ئیحسان یەکیٚکە لەو سیٚ بنەمایانەی کە لەفەرموودەیەکی جبریل هاتووە ((هَذَا جِبْرِيلُ جَاءَكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ: ئەمە جبریلە و هاتووە ئاینەکەتان فیٚر بکات.))[2].

+ موسڵمان پرسیار دەکا گەیشتنە ڕاستی ئیحسان چۆنە ؟ کام لەزانای موسڵمانەکان ئەم ڕاستییەی زانیوە و لەرووی زانست و فیٚرکردن و ڕیٚگا و حاڵ و چەشتن گرنگی پیٚداوە ؟! یاخود قسەی لەسەر کردووە و ئاماژەی پیٚداوەو لەدەورو بەری هاتووەو چووە و تەمەنی خۆی لەپیٚناو گەیشتندا چواندووە ؟!

ئەگەر ئاکار چاکی خیٚری دنیا و ڕۆژی دوایی برد، کیٚن ئەوانەی گرنگییان بەزانستی ئاکارو پاککردنەوەی دەروون و لیٚپرسینەوەی داوەو چەندەها دانراویان

---

١ المائدة / ١٤

٢ سەیری کتیٚبی (العبودیة - لأبن تیمیة) بکە ص ٤٣، الدین وایمان واسلام واحسان.

لەسەر داناوەو ئەم زانستەو تیۆرییەکانی و بنەماکانیان پاراستووەو لەم لایەنەوە دەست پێشخەرییان کردووە. زانستەکەیان شتی رووت نەبووە، بەڵام چاترین ئاکارو تەواوترین ئەدگاریان هەبووەو چەندەها نەوەو میللەتیان لەسەر ئەمە پەروەردە کردووە. لە هەر گۆڕەپانێ دەستیان پێی گەیشتبێ شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییان لەسەر ئاکارە بۆگەنەکان ناوەتەوە و چەندەها کۆمەڵگاو میللەت و گەلان گۆڕانێکی ئاکارییان لێوە بەرپا بووە.

+ پێغەمبەرﷺ جیاوازیی کرد لە نێوان ئایندار و ئاکارەکەی، فەرمووی: ((**إذا أتاكُمْ مَنْ تَرْضَونَ دينَهُ وخُلُقَهُ فزَوِّجُوه**: ئەگەر یەکێ هاتە لاتان، بە ئاین و ئاکاری قایل بوون ژنی بدەنێ.))،[1] چونکە هەموو ئاینداریێ ئاکاری چاك نییە، نەبە خوا هەموو خاوەن ئاکارێکیش ئایندار نییە.

+ ئەگەر هاوبەش پەرستی لەو کەسەدا دیارو نادیار بێ، کێ لە زاناکانی موسڵمان لەو هاوبەش پەرستیەی کۆڵیوەتەوە و لێی ورد بووەتەوە، کە لەخشپەی مێروولە نهێنیترە لە گەندەڵکردنی ئیخلاس و لاڕێی دڵی بڕوادار لەویست و مەبەستی، کە بینینی خوای مەزنە، ئەو زانایانە کێن، کە لە زانستی ئیخلاس و سیفەتی موخلیسەکان دانراویان هەیە؟ ئەوانەی کە خوای مەزن لەبارەیانەوە دەفەرمووێ: ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾: بەیانی و ئێواران پەروەردگاری خۆیان بانگ دەکەن و قایلبوونی ئەویان دەوێ.))[2]

+ ئەگەر بڕوادار تەنیا بە نوێژی گوێدێری(خاشع) سەردەکەوێ، ئەدی ئەوانە کێن کە گرنگی بە زانستی گوێدێری(خشوع) و چۆنیەتیی وردبوونەوە لێی دەدەن و لەهەموو ختووراتێکی خافڵبوون لە خوا لە خۆیان دەپرسنەوە، هەروەك چۆن زاناکان لەتەرك کردنی بنەمایەکی نوێژ دەپرسنەوە و؟ هەرچیی هەیانە دەبەخشنەوە بۆ ئەوەی رکعەتە نوێژێکی پڕ گوێدێری ئەنجام بدەن، کە تەنیا خوایان لەگەڵ بێ.

---

[1] ترمزی و ئبن ماجە و حاکم گێراویانەتەوە هەروەك لە (الجامع الصغير ج ١، ص ١٦) هاتووە.
[2] الكهف/٢٨.

+ دوایی ئەو کۆمەڵەی ئوممەتی ئیسلام کێیە کە بە بەردەوامبوونی یادکردنەوەی خـوا بەناوبانگـەو بـەم پەرستنە سـووکەی لەسـەر زمـان و گـران لـە تـەرازوو وخۆشەویست بۆ ڕەحمان و ڕەها لـە کات و شوێن و حـاڵی مـرۆڤ[1] ناسـراوە، ئەم کۆمەڵە پەیڕەوی پێغەمبەریانﷺ کردووە چونکە ((**كَانَ رَسُولُ اللَّـــهِ ﷺ يَذْكُــرُ اللَّهَﷻ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ**))[2]، ئای لـەقورئانی پیرۆزو فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ چـەند هانی یادکردنەوەی داوە، ئای فەزڵ و پاداشت و تایبەتیـەکانی(سیفەتەکانی) چـەند مەزنە؟!

ئەگـەر ئێمـە زانسـت و گوتـەو دانـراوی ئـەو کۆمەڵانـەمان لەفەرهـەنگی ئیسـلام بەدەرناو، لەکتێبخانەی ئیسلامیمان لابـرد، هـەر لەبەر ئـەوەی دەدرێتـە پاڵ ئـەوان، کوا بریتییان لەدانراوەکانی ئیسلام و کلتورەکەی ؟!

ئەگـەر ئـەو کۆمەڵانـەمان لـەژیانی موسـڵمانەکان و مێژوویـان و بزووتنـەوە چاکسازییەکان و داواکردنە خواییەکان دوور خستەوە، ئەدی پەیڕەویی کێ بکـەین و بەدوای کێ بکەوین لە جێبەجێکردنی گەلە دەقێکی قورئان و فەرموودەکە لەسەر ژیـانی خۆیـان ئـەنجامیان داوە، کۆمەڵـە دەقێکـی زینـدوو بـوون لەسـەر زەوی دەڕۆیشتن.

دەبێ کەسێ هەبێ جێگرو بریتیی ئەوان پێ بناسێنێ ؟؟!

چەند ڕاستە گوتـەی شـاعیر لەوانـەی کـە سەرزەنشتی صۆفیـەکانیان کـردووە و زۆر دوورە لەپەیڕەوی کردن، کە دەڵێ:

أقِلـُّوا عليـــهم لا أبـــا لأبيكُمُ      من اللَّوم أو سدوا المكان الذي سعدوا

+ ئەگـەر سەلمێنرا کـە هیـچ شتێ وەرنـەگرین گـەر لەگـەڵ نـاوەڕۆکی دەق یـەك

---

[1] یـاد کردنـەوە(زیکـر) تـەنها لەسـێ حاڵـەت قەدەغـە دەکـرێ: لـەکاتی چوونـە ئـاو دەسـت، لـەکاتی جوتبون، لە شوێنی پیس.

[2] الجامع الصغير ( ج ٢، ص ١١٧)، موسلیم و ئەبو داود و ترمزی گێڕاویانەتەوە. أ. هـ

نەگرێتـەوە، ئـەوا لـەکار خسـتنی دەقـەکان لـەناوەڕۆکی دەق نییـە، ئیـبن تەیمیـە گوتوویەتی (ئەوەی ڕێبازی یەکێ لـەزاناکان یـا زاهیـد و خواپەرستەکان لـەڕێبازی یارانی پێغەمبەرﷺ باشتر بزانێ، ئەوە هەڵەی کردووە و گومڕاو بیدعە چیە.[1]

## پەناگەی هێز:

خوای گەورە لەسەر زمانی حەزرەتی لوط فەرموویەتی:

﴿لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ: ئەگەر لەبەرانبەر ئێوەدا هێزو توانام هەبوایە یا پشتیوانێکی بەتینم هەبایە دەتان زانی چیم لێ دەکردن﴾.[2]

پێغەمبەرﷺ فەرمووي ((**وَرَحْمَةُ اللّٰهِ عَلَى لُوطٍ، لَقَدْ كَانَ يَـأْوِي إِلَـى رُكْـنٍ شَدِيدٍ-يَعْنِي اللّٰهﷻ-**: ڕەحمەتی خوا لە سەر لوط بێ بەڕاستی هانی بۆ پشتیوانێکی گەورە برد واتا: پەروەردگاری مەزن)).[3]

+ پەناگەی هێز لای صۆفیگەریی، ڕەگی زانستەکانیان و بنـەماکانی لـەقورئان و فەرمودەیە، نهێنی تایبەتێتییان لە یادکردن وپەیڕەویکردنە.

+ لەقورئانی پیرۆزدا بیروباوەڕ و حوکم و ئاکار هەیە، زاناکانی یەکخواپەرستی تایبـەتن بـەبیروباوەڕ، زاناکـان (فقیـە) تایبـەتن بـە حوکمـەکان، صۆفییـەکان تایبـەتن بەئاکارەکان.

لەقورئانی پیرۆزدا یاد کردن و هزر و گەڕان و زوهد و ئیخلاس و ئیحسان هەیە، صۆفییەکان گرنگیان پێدان و پێیان لەسەر داگرت، تا بوونە تایبەت پێیانەوە.

+ لەقورئانی پیرۆزدا باسی ڕۆژەکانی خواو نیشانەکانی خواو نیعمەتەکانی خـوا

---

١ مجموع الفتاوى ( ج ١١، ص ١٥).

٢ هود / ٨٠

٣ تەفسیری ئیبن کەثیر لای ئایەتی ناوبراو.

کراوە،[1] صۆفیەکان گرنگیان بەم لایەن داوە، بەمجۆرە چی بۆ قورئانی پیرۆز دەگوترێ بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ دەگوترێ.

بەڵام پەناگەی هێزی ئەم کۆمەڵە و نهێنیی تایبەتێتیەکەیان بۆ بەردەوامیی یادکردن و هاوڕێیەتی ڕاست و وردیی پەیڕەویکردن دەگەڕێتەوە .

+ یاد کردن هێندە سودی هەیە کە لەژمارە نایەت، (ابن القیم)[2] لە سەد سوود زیاتری نووسیوە و لە سودی دەیەمیندا دەڵێ: یاد کردن چاو دێری بەیاد کەر دەبەخشێ، تادەگاتە دەرگای ئیحسانەوە و خوا دەپەرستێ وەك ئەوەی ببینێ، ئەوەی لەیاد کردن خافڵ بێ ڕێگەی بە پایەی ئیحسان ناکەوێ، وەك چۆن دانیشتوو ڕێگەی بە گەیشتنەوە ماڵ ناکەوێ.

+ هەروەها لە دوازدەمین و سێزدەمیندا دەڵێ: یاد کردن نزیکی لەخوا بەیاد کەر دەبەخشێ، نزیکیەکەی بەپێی یادکردنەکەیەتی و دەرگایەکی گەورەی خواناسینی بۆ ئاوەژۆ دەکرێ، هەر چەندە یادکردنەوەی زیاتربێ ناسینی زیاتر دەبێت.

+ لەسوودی چل و دووەمدا[3] دەڵێ: یادکەر نزیکە لە یادکراو(الله)، یادکراو بە نزیکی و ویلایەت و خۆشەویستی و سەرکەوتن لەگەڵیەتی، وەك فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ : خوا لەگەڵ ئارام گرەکانە﴾، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ: خوا لەگەڵ بڕوادارەکانە﴾، ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا: مەترسە خوا لەگەڵمانە﴾، یادکەر بەشێکی زۆری لەم لەگەڵبوونەدا هەیە هەروەك لە فەرموودەی قودسی هاتووە ((**أَنَا مَعَ عَبْدِي مَا ذَكَرَنِي وَتَحَرَّكَتْ بِي شَفَتَاهُ**: من لەگەڵ بەندەی خۆمم تا یادم دەکاتەوەو لێوەکانی بەناوی من دەجووڵێ))، لەفەرموودەیەکی تر هاتووە ((**اَهلِي أهلُ ذِكْرِي وَأَهلُ مُجَالَسَتِي**: کەس و کارم

---

١ سەیری (الفوز الکبیر) ی شا ولی‌الله ی دەهلەوی بکە، ل ٢.

٢ کتێبی (الوابل الصیب) ص ٦٦٣ لە سوودەکانی یاد کردن.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩٢.

ئەوانەن کە یادم دەکەنەوەو لەکۆڕی من دادەنیشن.)).

+ گوتی: ئەو لەگەڵ بوونەی بۆ یادکەر(ذاکر) پەیدا دەبێ لەگەڵبوونێکە هیچ شتێ پێی ناچێ و زۆر لەو لەگەڵبوونە تایبەتی ترە، کە بۆ چاکە خوازو لەخواترس پەیدا دەبێ. جۆرە لەگەڵبوونێکە هیچ دەربڕینێ تێی ناگاو هیچ سیفەتێ وەرناگرێ، تەنیا بەچەشتن فێردەکرێ و جێخلیسکی پێیەکانە، ئەگەر بەندە نەیتوانی جیاوازی لەنێوان کۆن و تازە پەیدابوو و خواو بەندەو داهێنەرو داهێنراو و خواپەرست و پەرستراو بکات. أهـ.

+ یادکردن ئەو گۆشە بەتوانایەیە کە صۆفیەکان لەسلوکیاندا پەنای بۆ دەبەن، چونکە بنچینەی هەموو مەقام وحاڵ و چەشتن و سۆزو زوهد و ئیخلاس و چاودێری و بینین بە دڵ وناسین و ویلایەت و پێشبینی و تایبەتێتییەکە، هەر ئەو پەنگرو ئاگری خۆشەویستی لەدڵان هەڵدەکاو گەرماتی پەیڕەویکردن بەدی دێنێ، بە هاوڕێیەتی فێری ڕۆیشتن بەرەو یادکراو دەبێ کە خوای مەزن و باڵایە.

+ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**والَّذي نَفْسِي بيَدِهِ لَوْ تَدُومُونَ عَلَى مَا تَكُونُونَ عِنْدِي، وَفِي الذِكْر، لَصَافَحتْكُمُ المَلائِكَةُ عَلَى فُرُشِكُمْ وَفِي الطُرُقَاتِ**...: سوێند بەوەی گیانی منی لەدەستە ئەگەر بەردەوام دەبن لەسەر ئەو شێوەیەی کەلای منن و لەیاد کردنن، فریشتەکانی خوا لەسەر نوێن و ڕێگاو بانتان دەستتان دەگوشن))[1].

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ: تۆ هەر لەگەڵ ئەوانە بە کە سبەینەو ئێوارە بۆ دیدەنی خوا لە نزادان و چاو لەوانە هەڵ مەبوێرە.﴾[2]

بەڵام لە پەیڕەویکردندا ئەوانە لەسەر ڕێبازی کوڕی عومەرن﷛ کە لەبارەیەوە

---

١ موسلیم گێڕاتیەوە.. هەروەك لە ( مشكاة، ج ٢، ص ٧٠١).

٢ الكهف /٢٨

گوتراوه: کەسەیری کوڕی عومەر بکەیت لەکاتی پەیڕەویکردنی پێغەمبەرﷺ دەڵێی: ئەمە شێتە. ! ئەبو نەعیم لە (الحليَة)دا لە نافیع دەگێڕتەوە و ئەویش لەکوڕی عومەرﷺ: کەوا کوڕی عومەر لە ڕێگەی مەککەدا لە سەر پشتی ولاخەکەی سەری شۆڕ دەکردەوە بەڵکو پێی ولاخەکەی بکەوێتە سەر پێی ولاخی پێغەمبەرﷺ.[1]

لە بارەی مکوڕ بوونیان لەسەر پەیڕەویکردن بەوە ناسرابوون کە کار بەفەرموودەی لاوازیش دەکەن، ئەمە تایبەتێتیی ئەم کۆمەڵەیە و خەوشێك نییە لێیان، چونکە جگە لەوان کەس ئەم توانایەی نییە. ئەوەی دڵنیا بوو لەوەی کە فەرموودەکە لاوازە توانای کار پێکردنی نییە، داوای ناکات، چونکە بەگشتی کاروبارە شەرعییەکان لە سەر دەرونی مرۆڤ قورسن، جا ئەگەر فەرموودەیێ لاوازیی تێکەوت ئەوا بیانووی وازلێهێنانی لەگەڵ خۆیەتی، تەنیا کار بە فەرموودە ڕاستەکان دەکا. لەڕاستیدا تەنیا دڵداری جۆشگرتوو توانای کار کردنی بە فەرموودەی لاواز هەیە هەر کە ئاگری دولبەری بۆ دەردەکەوێ بۆی دەچێ، هەروەك یەکێ لە شایەرەکانیان دەڵێ:

ئەوا تاریکی شەو هات، ئاگریان برووسکەی دا
شایەر لەخۆی بێزار بوو، رابەریش سەری شێوا
کەتێی رامام بەوردی، بەهاوڕێیەکەی خۆم گــوٚ
ئەم ئاگرە ئاگری، لەیـــــــلایە دە بۆی بـــڕۆ

ئەوانە لایان وایە (فەرموودەیەکی پیرۆزە)، خۆی لەخۆیدا لاوازیشە، بەڵام لاوازیەکەی پەیوەندی بە خۆشەویستەوەﷺ نەپچڕاوە، گەر وانەبێ دەیانگوت هەڵبەستەیە(موضوع).

صۆفیەکان خەرمانێکی مەزنیان لەو فەرموودە لاوازانەی کەدەدرێنە پاڵ

[1] تەماشای (حياة الصحابة) ج٢ ل٦٥٥ بکە.

پێغەمبەرﷺ پاراستووەو لە گوتەو هەڵسو کەوت و کردەوەکانیان پەیڕەوییان دەکەن[1]، ئەمەش یەکێکە لە پەرجووەکان(معجزات)ی ئیسلامی نەمر و تەواویی پێڕەوایەتی محەممەدی و چاکیی ئەم میللەتە، چونکە کامڵبوونی ئاین بەکامل بوونی پەیڕەویکردن و تەواویی نیعمەت و ڕاستیی قایلبوونە، هەروەك خوا دەفەرمووێ:

﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا : ئەمڕۆ ئاینم بۆتان کامڵ کردو نیعمەتم بەسەرتان تەواو کردو قایل بووم بەوەی ئاینتان ئیسلام بێت. ﴾.[2]

+ هەروەها پەیڕەوی کردنی ئەم فەرموودانە لە ڕاستیی خۆشەویستیی پێغەمبەرﷺ و تەواویی لێبووردنەوە هاتووە، خوا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ : ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: گەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، پەیڕەویم بکەن، خوا خۆشتاني دەوێ و گوناهەکانتان دەبووڕێ، خوا لێبووردەو دڵسۆزە. ﴾[3]

کارکردن بە فەرموودەي لاواز جۆرە پاراستنێکە بۆ فەرمودەي ڕاست و قورئاني پیرۆز، وەکو پارێز گاریکردني سوننەتەکانە بۆ فەرزەکان. لە بابەتي نوێژدا زاناکان گوتوویانە: سوننەتي پێش نوێژ تەماعي شەیتان دەبڕێ و دواي نوێژ بۆ پڕکردنەوەي کەم و کوڕتیەکان. لەم بارەیەوە شێخ عبدالقادر (وەبەر میهری خوا کەوێ) لە کتێبي (الغنیة) لەکۆتایي کتێبي ئاداب، کە فەرموودەي لاوازي زۆری تێدایە

---

١ ئیمامی نەوەوی لە (اذکار) ل ٧ گوتوویەتی: زانا فەرمودەناسەکان و شەرع ناسەکان و هیتر گوتوویانە: واچاکەو دروستە لە کاری چاك و ڕەغبەت پێدان و ترساندن کار بە فەرموودەی لاواز(ضعیف) بکرێ گەر هەڵبەستراو نەبێ، بەڵام لە حوکمەکانی وەکو حەڵاڵ و حەرام و کڕین و مارەبڕین و تەلاقدان و شتی تر تەنیا کار بە فەرموودەی ڕاست یان چاك دەکرێ، بەڵام گەر لە فەرموودەیەکی لاواز(ضعیف) هەندێ کڕین و مارەبڕین چاك نەبوو، واچاکە وازیان لێ بهێنرێ بەڵام وازهێنانەکە پێویست نابێ. أ. هـ.

٢ المائدة/٣

٣ آل عمران/٣١

فەرمویەتي: پێوستە مرۆڤ هەمو دابو نەریتەکاني دەستنویژ و نویژ و کڕین و فرۆشتن بپاریزێ. لەشیکردنەوەي ئەوەدا گوتویەتي: ئەگەر مرۆڤ واز لە ئاداب بینێ شەیتان تەماعي لەسونەتەکان ئینجا لە فەرزەکان دوایي لە ئیخلاس و ئینجا لە دلنیایي(یقین) دەکات.[1] ..أ.ە.

## شێخ عبدالقادر و ئیسلام :

هەر کەناوي ڕێبازەکي دێت، ناوي ئەویش دەبرێت، لە هەر شوێنێ ڕێبازەکەي بلاو بووبێتەوە و ناوبانگي دەرکردبێ ناویشي بەم شێوەیە بلاو بۆتەوە، ناوبانگي صۆفیەتییەکەي بە سەر ناوبانگیی زانستییەکەیدا زالە، کەسێتیي پەروەردەییەکەي بەسەر کەسێتیي فێرکردنەکەیدا زالە، هێزي کەسێتییەکەي لە بلاو کردنەوەي ئایین و ئامۆژگاري کردني موسلمانان–بە گشتي و تایبەتییەوە– دیارە، ئامۆژگارییەکاني بە تواناو دەسەلات بووە، کەم کەس هەبووەو بەدەگمەن، کە تواناي گوێگرتنیان بووبێ، شێخ–ڕەحمەتي خواي لێ بێ– خۆي هەستي بەمە کردووە و گوێي لێ بگرە کە دەلێ: ناشیرینییەکم هەیە کە بۆ ئایني خوا دەگەڕیتەوە، بە دەستێکی زبري پاك پەروەردە کراوم.[2]

+ لەبەر ئەوە ئەو ئامۆژگاریکەرێکی ناوێ، کە بەنوکتەیێ خەلکی بێنێتە پێکەنین، یان قسەیەکی ناوێ، کە دلیان پێی بکرێتەوە، بەلکو دەیەوێ بەوشەی قورس لەسەریان بدا، دەفەرمووێ: ((هاوار بۆ تۆ، لەم شوێنە دادەنیشی و ئامۆژگاریی خەلکی دەکەیت و جا لەنێوانیاندا پێدەکەنی و حەکایەتي گالتە ئامێزیان بۆ دەگێڕیتەوە، بێگومان سەر ناکەوێ و سەرناکەون، ئامۆژگاریکەر مامۆستاو پەروەردیارە، گوێگرەکان وەکو ساوان، مندالێ بە توندوتیژی و گرژی فێر دەبێ، تاك تاکەیان نەبێ، کە خواپێداون بەهێمنی فێردەبن))أ.ە.[3]

---

١ ج ١، ص ٢١٥ .

٢ الفتح الرباني، ص ٢٦ .

٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٦ .

لەگفتوگۆیەکانی لەگەڵ خەڵکیدا توندو تیژییەکەی بەدیار دەکەوێ، گوێی لێ بگرە لەکۆڕی (٢٩) لە (الفتح الربـاني)دا دەڵێ: دووڕووەکان گوێگرن ئەی ئەوانەی هاوبەش بۆ خوای مەزن پەیدا دەکەن، هیچ دەنگوباسێکتان لە خواو پێغەمبەری خواوە بۆ نەهاتووە، موسڵمان بن و پەشیمان بینەوە و دڵسۆزبن لە کردەوەکانتان ... هاوار بۆ تۆ تۆ هاوبەش پەیداکەری و دووڕووی ونیسك ئاسای و بێباری و زندیقی، هاوار بۆ تۆ خۆت لەسەر کێ هەڵدەکێشی، لەسەر کێ ﴿يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ﴾أ.ه.[1] بەزۆری بەم وشانە ئامۆژگاریی خەڵکیی دەکرد.

+ شێخ (ڕەزای خوای لێبێ) باوەڕی بەئیسلامەتی خۆی هەبوو، شوێن پێی خۆی تێیدا دەزانی، هەروەها پایەی خۆی لای خوای گەورە دەزانی، کە دڵی بێگەردیی ئیلهام و ڕاستیی دڵنیایی دەکردەوە، بۆیە دەبینی دەڵێ: ((ئەی ڕۆڵە: بمکە ئاوێنەت، بمکە ئاوێنەی دڵت و نهێنیت، ئاوێنەی کردەوەکانت، لێم نزیك بەوە تۆ ئەوەی لەدەرونی خۆت دەیبینی گەر لێم دوور بێ نایبینی، گەر لە ئایینت پێویستیت هەبوو وەرە لام، من لە ئایینی خوا مەراییت بۆ ناکەم .... دنیات لە ماڵەوە دانی و لێم نزیك بەوە، من لەسەر دەرگای ڕۆژی دوایی وەستاوم، لام ڕاوەستە و گوێم لێبگرە .... هتد))[2].

+ غیرەتە ئیسلامیەکەی بەرەو بالایی و سەرکەشی دەچوو لە دڵی موسڵماندا بەرگریی لەئیسلام دەکردو پێی دەگوت: ((هاوار بۆ تۆ کراسی ئیسلامت دڕاوە، شەمەکی بڕوات گلاوە. تۆ رووت و قووتی، دڵت نەزانە، نهێنیت لێڵە، دڵت بۆ ئیسلام نەکراوەتەوە، هەناوت کاولە و رووکەشت ئاوەدانە و لاپەڕەکانت ڕەشە، ئەو دنیایەی تۆ خۆشت دەوێ بەجێت دێڵێ، گۆڕ و ڕۆژی دوایی بۆت دێن، ئاگات لە کارو فەرمانت بێ...))[3].

+ هەروەها زۆر دڵسۆز بوو لەسەر موسڵمانەکان و بەهیوای ئەوە بوو، کە

---

١ الفتح الرباني، ل ١٠٠.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٦.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٦.

بتوانێ هەموویان ڕزگار بکات و دەفەرمووێ: ((بەپیرتانەوە دێم، بۆ خوا لێتان وەردەگرم، گەر لەرووی ڕەحمەت و دڵسۆزی پێتانەوە.بمتوانیبایە لەگەڵ هەمووتان دەهاتمە گۆڕ و وەڵامی فریشتەکانم دەدایەوە))[1].

+ زۆر لە لەناوچوونی ئیسلام و میللەتی ئیسلام و ئاکاری ئیسلام دەترسا، گوێی لێ بگرە دەفەرمووێ: ((ئیسلام دەگرییێ و پەنادەبا، لەبەر ئەو تاوانبارو فاسیق و گومڕاو بیدعەچی و زۆردارو دەمامك لەسەرء سەرقۆزی بن ئاڵۆز بەچەپۆك لەسەری خۆی دەدا، سەگ ئاگاداری و پاسەوانیی خاوەنەکەی دەکەتات لەڕاوکردنی و کشت و کاڵی و مەڕو ماڵاتی و ئێشککگری ... داخۆ ئێواریێ تیکەیێ یا چەند تیکەیێ یاشتێکی کەمی دەداتێ، تۆ لە نیعمەتەکانی خوا دەخۆی، لێی تێر دەبێ و ئەوەی پێویستە نای دەیتێ، مافەکەی جێبەجێ ناکەی، فەرمانی ڕەد دەکەیتەوە، سنووری ناپارێزی))[2].

+ غیرەتی شێخ لە سەر ئیسلام و موسڵمانەکان و ئەم دلێرییەی لە سەر ئاینی خواو ئەو ورە بەرزییەی لە چاککردني خەڵك، کە لە خۆی و شارەکەی-پایتەختی جیهاني ئیسلامي- رەتي داو گەیشتە هەموو وڵاتـي ئیسلام و ئاییني ئیسلام و سوور بوو لە سەر ڕێنماییکردني ناموسڵمانەکان. وەك بڵێي ئەو هیواو ژان و ژوارە و ئەو نیازپاکییە بۆ چاککردني خەڵك واي کرد، کە بەردەوامي بداتە داواي بەرەوخواچوون و مانەوەي ناوي بەدرێژاییی ڕۆژگار، چونکە هەر ساختمانێ لە سەر ناوي خوا بنیات بنرێ و بە ڕاستي و دڵسۆزي بۆ ڕووە پیرۆزەکەي بێت بێگومان بەردەوامە،خوا دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ : کاتێ ئیبراهیم وئیسماعیل پایەکانی کەعبەیان دادەناو دەیانوت: خوایە ئەم خزمەتەمان لێ وەرگرە بەڕاستی هەر تۆ گوێ بۆ پاڕانەوەی خەڵك ڕادەگری و بەڕازی نهێنی هەموو کەس زاناو ئاگای.﴾[3]

---

١ الفتح الرباني، ل ٢٩٧

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠١

٣ البقرة /١٢٧

## شێخ عبدالقادر و ئامۆژگاریی :

لەدانراوەکانی شێخدا بەزۆری باسی کۆڕە ئامۆژگارییەکانی دەکرێ، لە کتێبی (الغنية)[1] چواردە کۆڕی هەیە لە (٦٤٦) لاپەڕەدا، لە کتێبی (الفتح الرباني) شەست و دوو کۆڕی تێدایە لە (٣٠٠) لاپەڕە زیاتر.

+ لە زۆربەی ئامۆژگارییەکانی پێ لەسەر کردەوەکانی دڵ و کاروبارە ئیمانیەکان و دڵنیایی بوون و دڵسۆزی دادەگرێ، کە بنچینەی ئاینن. ئیبن تەیمیە-ڕەحمەتی خوای لێ بێ- لەسەرەتای (كتاب علم السلوك)[2]دا دەڵێت: ئەمە چەند گوتەیەکی کورتە لە کردەوەکانی دڵ-کە پێیان دەگوترێ حاڵ و مەقامەکان- کە بنچینەی ئیمان و دەستووری ئاینن، وەکو خۆشەویستیی خواو پێغەمبەر، پشت بەستن بە خواو ئیخلاسی ئاین بۆ ئەو، سوپاس کردن بۆ ئەوو ئارامگرتن لەسەر بڕیاری و ترسان لەو و تکاکردن لەو، لەگەڵ ئەوەی بە دوای ئەوانەدا دێ .... دەبێژم: هەموو ئەم کردەوانە لەسەر خەڵك پێویستن، کە لە بنەڕەتدا فەرمانیان پێکراوە بەپێی ڕێککەوتنی ئیمامەکانی ئاین.. أ هـ.

+ پێشتر گوتمان شێخ-ڕەحمەتی خوای لێبێت- تواناو هێزێکی وای درابوێ لە ئامۆژگاری کردن، کە بەکەم لەو کەسانە درابوو کە لە کۆڕی یادکردنەوەدا ئەم گرنگییە ئەنجام دەدەن، تۆ لە هەموو پەڕە و لاپەڕەیەکی کۆڕە ئامۆژگاري لەسێ بنەماوە هەڵقوڵاوە، کە کەسێتیە مەزنەکەی لەسەر بەندەو گیانی پیرۆزی پێی پابەند

---

١ ئەم کتێبە لەم دواییەدا مامۆستا فرج توفيق الوليد پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە کۆلێژی شەریعەی زانکۆی بەغدا ساغی کردەوە و سوودێکی زۆری بە کتێبەکە و خوێنەرانی گەیاند-خوا پاداشتی خێری بداتەوە-، گەلێ شتی بۆ زانست خوازەکان زیاد کرد، سەرەڕای دەستنیشانکردنی فەرموودەکان و ژمارە دانانی ئایەتەکان، ژیاننامەی کەسێتیەکانی نووسیوە و ناوی هەندێ بەڵگەی حوکمەکانی هێناوە و وشە غەریبەکانی ڕوونکردۆتەوە. هەروەها لە پێشەکیی کتێبەکە کورتەی ژیانی شێخی نووسیوە خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە. کتێبەکە سێ بەرگەو (١٥٠٩) لاپەڕەیە لەگەڵ پێڕستی هەموو بابەتەکانی. ئومێدوایە خوای گەورە هانی یەکێ بدات کەبەم جۆرە خزمەتی کتێبی (الفتح الرباني) بکات.

٢ تەماشای.(ج١-ص٥) لة مجموع الفتاوى لابن تيمية بكە.

بووه، بنەماکان ئەمانەن: هێزی ئیمـان لەگەڵ خۆگرتن، ئەز بەر کردن(حفـظ)، هێزی ئیلهام. ئەوی خاوەنی ئەم سیفەتانە نەبێ ناتوانێ وەکو شێخ لەگەڵ خەڵکی بدوێ، هەروەها ناتوانێ داوای ئەو دەعوایانە بکا، کە شێخ داوای دەکرد بەرامبەر خەڵکی، تەنیا ئەگەر زۆر دووڕوو و زمان پاراوبێ، لەگەڵ ئەوەش دوای کەمێ ئابرووی دەڕژێ و ڕێز و شکۆمەندیی لەدڵی خەلکیدا نامێنێ، زاناکانیش ڕێزی ناگرن و دانی پێدا نانێن هەروەك چۆن خەلکی رەمەکی و تایبەتی گەواهییان بۆ شێخ دا-رەحمەتی خوای لێبێ-، هەر وەکو شاعیر گوتوویەتی:

مرۆڤ هەر ئاکارێکی، لا بێ گەر وابزانێ
لەخەڵکی بزر دەبێ، هەموو کەسێ دەیزانێ

+ ئەوەی بڕوای بەو شتە نەبێ کە داوای دەکاو پێی پابەند نەبێ ولێی دڵنیا نەبێ کە لەسەر ڕێگەی ڕاست و شەرعی محەممەدی و ڕێبازی خواییە، بەقەد پەنجەی مێروولە لێی دەرناچێ و بەقەد خاڵ و داوی وردی سەر دانە وازی لێ ناهێنێ و پێی پابەند دەبێ.

+ئەوەی لەگوناهو لاسارییەکان پارێزراو نەبێ، زاتێ ئەوەی نابێ قەدەغەی کەس بکا لەو کردەوانەی، کە دەیکا-بەم هێز و توندوتیژییە- هەتا ئەگەر تۆبەشی کردبێ، کەساسی گوناهو ڕووڕەشییەکەی سەربەرزیی نەفسی دەکوژێنێتەوە و شانازی و شکۆمەندی و دەسەڵاتی لەسەر گوێگر کەم دەکەنەوە. مرۆڤی تاوانبار چۆن دەتوانێ وەکو شێخ بدوێ، خۆ کاتژمێرێ پێش ئێستا لەلاساری بووە ؟! تاریکی گوناه زیندەگیی وشە لە دەروونی ئامۆژگاریکەر دەکوژێ و توانای کز دەکاو رووناکی دەکوژێنێتەوە و کاریگەری و دەسەڵاتی لەسەر نەفسەکاندا نامێنێ و رەوانبێژیی لەناو دەبات. یاخۆ دەڵێی: لەگەڵ گوناه وشە واتاکەی بزر دەکات.

+ ئەوەی بەهێزی ئیلهام و پاکیی دڵ و هەستکردن بەنزیکی وچێژی نزاو ڕوونی وەڵامدانەوە لەمەقامی ئیحسان پایەی خۆی لای خوای مەزن نەزانێ، زاتی ئەوە ناکا قسەی وەکو شێخ بکا یاخود داوای داوا کاریەکانی ئەو بکات.

+ لەپەندا گوتوویانە: ئەگەر ویستت پایەی خۆت لای خوای مەزن بزانی سەیر کە لەچیدا تۆی وەستاندووە.

+ هەر وەك لـەبارەی ئیلهامەوە گوتویانـە ((ئیلـهام تیشکێکە لـەچرای غەیبـەوە دەکەوێتە سەر دڵێکیپاکیبێگەردی بەتاڵ)) واتـــــا: بەتاڵ لە هـەموو شتێ جگـە لەخوای مەزن.

لەگـەڵ ئـەو هـەموو هـێزو تواناو دەسـەڵاتەی لەسـەر گوێگـر لـە ئامۆژگـاریدا و لەگـەڵ ئـەم لێدان و سەرزەنشت کردنـەدا، دەبینی گیـانی شـێخ پـڕە لـەزەلیلی و خۆشکاندنەوە بەرامبەر پـەروەردگاری بـەتوانا، دەبینـی ئـەو ڕەحمـەت و دڵسۆزی و حەیایەی کەلەگیانی هەڵ دەقوڵێ لەو پەڕی ناسکی دایە، گوێ لەسەعدی شـیرازی ڕابگرە کە لەکتێبی گوڵستاندا چۆن گەواهی بۆ شێخ دەدات و دەڵێ: عبدالقـادری گـەیلانیم لـە کەعبـە دیـت سـەری خستبووە سـەر چـەند وردە بـەردێ و دەیگــوت: خوایە.بمبوورە هەرچەندە شایانی سزادانم، لەڕۆژی بەپابوونەوەدا بـەکوێری حەشـرم بکە تا لە شەرمەزاریی بینینی ڕووی پیاوچاکان نەتوێمەوە.[1]

ئینجا سەعدی گوتی:-

کەبا هەڵ کاتە سەر خۆڵ، ڕووم لە خۆڵ دەگەوزێنم
تا تۆ لە بێ توانایی و کەم و کورتیم دەبووری
ئەی ئەو کەسەی کەوا دڵ بە یادی تۆ خەریکە
ئاهۆ یادێکم لەلات ماوە شادیم بەردەوام کـــــا

لـەکۆتاییدا: بـرای موسـڵمانم ئامۆژگـاریت دەکـەم کـە کـۆڕە ئامۆژگاریـەکانی شێخ بخوێنیتەوە. بۆ ئەوەی ڕاستیی قسەکانم ببینی و بۆ خێزانەکەشت بخوێنەوە. هـەر لەم ساتەوە لەگەڵ کتێبی دانەر-خـوا پاداشتی چاکـەی بداتـەوە و کەسـێکی وا بـۆ ئـەم میللەتـە بنـێرێ کەسـەر لـەنوێ گیـانی ژیـان و دەعـوەو نوێکردنـەوەی بـە بەردابکاتەوە- جێت دەهێڵم، خوای گـەورە توانـای بەسـەر هـەموو شتێکدا هەیـەو سوپاس بۆ خـوای جیهانـەکان، درودو سـەلام و ڕێز و بەخشـندەیی لەسـەر مـەزنمان محەممەد و هەموو خاوو خێزان و یاوەرانی.

**محمد بشير الشفقة**

---

١ (١) کتاب روضة الورد ( گلستان)، ص ٨٥.

# پێشەکی

سوپاس بۆ خـودا سوپاسێك کـە نیعمەتـەکانی بگرێتـەوە و پاداشتی زۆر تریشی پێوەبێت، سوپاس بۆ خوای شکۆدار، کە فەرموویەتی: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ : ئەوانـەی بڕوایـان هێناوە و زانستیان پێدراوە خوا پایەیان بەرز دەکاتەوە، خوا ئاگادارە بەو کـردەوەی کە دەیکەن.﴾[1]

﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ: ئایا ئەوانەی کە ئـەرکی خۆیـان دەزانـن وەکـو ئەوانـەن کـە نـازانن؟ بەڕاستی تـەنیا ژیرەکان ئامۆژگاری وەردەگرن.﴾[2]، ﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ : لەنێو بەندەکانی خودا بەڕاستی تەنیا زاناکان لە خوا دەترسن، خوا بەتـوانا و لێبووردەیـــە.﴾[3]، ﴿ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ : ئەگـەر نازانن لە ئاگادارو زانایان بپرسن.﴾[4]

ئینجا درودو سەلام لـەسەر پێغەمبەر و نـاز ڕەوامـان گـەورەمان محەممـەدﷺ ئـەوەی کە خوای گەورە بەمژدەدەرو ترسێنەر ناردویێتی و بەئیزنی ئەو داوای خـەڵکی دەکـا بۆ حەق و چرایەکی ڕووناکە و درود لـەسەر خاوو خێزان و یاران و مـیراتگرانی بێ

---

[1] المجادلَة / ١١.
[2] الزمر / ٩.
[3] فاطر / ٢٨.
[4] النحل / ٤٣.

لەزانایان، خوایە سەلامێکی زۆریان پێ بگەیەنە.

خوای مەزن دەفەرموێ ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ: ئێمە قورئانمان هەنارده خوارەوە و هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین.﴾[1]، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((**إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ، إِنَّ الأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَ لاَ دِرْهَمًا إِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَ بِهِ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ**: زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەرانیش دینار و درهەمیان بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو زانستیان جێ هێشتووە، هەرکەسێ وەری بگرێ بەشێکی گەورەی وەرگرتووە.))[2]. نوری ئیسلامی روناك و کانیاوە بێگەردەکەی لەمەککەی پیرۆزەوە هەڵقەڵاوە و هێدی هێدی و بەپاکی مەدینەی رووناك کەرەوەی گرتەوە، هەر کە لەوێ خۆی گرت و کەوتە سەر پێ و هاژەی لێوەهات بەرەو بیابان و دۆڵ و دەشت و شاخ هەڵکشاو وەکو لافاوێ هیچ شتێ بەری نەگرت، تا لە سەدەیێ کەمتر گەیشتە سنوری چین لە ڕۆژهەڵات و چیای (بیرینیە) و زەریای ئەتلەسی لە ڕۆژئاوا.

پێغەمبەرﷺ تا لەژیاندا بوو پەیامی راگەیاند و ئەمانەتەکەی جێبەجێکرد و ئامۆژگاریی موسڵمانانی کرد. پێش ئەوەی خوای گەورە گیانی لێ بسێنێتەوە فەرموی: ((**تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا، كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ**: دووشتم بۆتان بەجێهێشتووە، گەر کاریان پێبکەن گومڕا نابن، قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا.﴾[3]. بەڵام قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ پێویستیان بەیەکێکە، کە ئەنجامیان لێ هەڵ بهێنجێ، لەدوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ هەندێلەیارە بەرێزەکانی ئەم کارە گرنگەیان ئەنجام دا، دوای ئەوانیش پەیڕەوان و زانایان دڵسۆزەکان کە میراتگری پێغەمبەرانن سەلامی خوایان لێبێت. پێغەمبەرﷺ

---

[1] الحجر /٩.

[2] بوخاری و ئەبوداود و ترمزی و ئیبن ماجە گێراویانەتەوە.

[3] مالك لە (موطاء) دەیگێڕتەوە: جامع الاصول، ج١، ص ٢٨٧.

ئەو ڕێگایەی دەستنیشان کرد کە دەبێ میللەتی موسڵمان و زاناکان لەسەری بڕۆن. عبداللە ی کوڕی مەسعود دەگێڕتەوە، کە پێغەمبەرﷺ ((**خَطَّ خَطًّا وَخَطَّ خُطُوطًا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: هَذَا سَبِيلُ اللَّهِ، وهَذِهِ سُبُلٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ، وقَرَأَ: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾**[1] : پێغەمبەرﷺ هێڵێکی ڕاستی ڕاکیشا و چەند هێڵێکیشی لەلای ڕاستەو چەپی خۆی کردو فەرموی: ئەمە ڕێگای خوایە، ئەوانەش کۆلەڕێن و لەسەر هەرێکێکیان شەیتانێ هەیە و بانگەوازی بۆ دەکا، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ئەمە ڕێگای ڕاستی منەو پەیڕەویی بکەن، کۆلەڕێیەکان مەگرن چونکە لەڕاستی منتان لادەدات.)).[2]

زانا دڵسۆزەکان لەسەر ئەم ڕێگایە ڕۆیشتن و چەندەها دەستوریان لە قورئان و فەرموودە هەڵێنجا دوای ئەوەی بارو زرووف گۆڕا و چەندەها شت پەیدا بوو کە لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ نەبوو، بەم کارە شورەیەکیان بۆ ئەم ڕێگایە کرد نەخۆ موسڵمانەکان کۆلە ڕێ بگرن و شەیتانەکان بیانرفێنن و لەناویان ببەن، بەلام بە درێژی ڕۆژگار و دوور کەوتنەوە لەیەکتری ئەم شورەیە بەرە بەرە لەدەرونی خەڵکی دەرماو لەڕێگا ڕاستەکە لایان دەداو شەیتانەکان بۆ ئەم لاو ئەولا تێیان هەڵ دەدا جگە لە ڕێگەی ڕاست، بەتایبەتی دوای ئەوەی دنیا باوەشی بۆ کردنەوە و پێی تێکچوون و ڕاستە ڕێیان لەبیر کرد.

بەلام پەروەردگاری مەزن دەستەبەریی پاراستنی ئاینەکەی و قورئانی کردووە، پێغەمبەرایەتی بەمحەممەدﷺ کۆتایی پێهێنرا، بۆیە کاری ئەم پاراستنە دراوەتە زانا دڵسۆزە کاراکان، کە میراتگری پێغەمبەرانن، ئەوانەی پێغەمبەر گرنگیی پێداون لەو فەرموودەیەی کە ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە: ((**إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى**

---

١ الانعام / ١٥٣ سەیری واتای ئایەتەکە بکە لە (ابن کثیر و خازن).

٢ ئیبن ماجەو ئەحمەد و بەزاز گێراویانەتەوە.

**رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا**: خـوای گـەورە سـەرەتای هـەر سـەد ساڵێ زانایێ بۆ میللەتی موسڵمان دەنێری کە ئاینەکەیان بۆ نوێ بکاتەوە)).[1]

مەرج نییە نوێکەرەوە کە یەك کەس بێت، چونکە وشەی (من) بـۆ تـاك و کۆیـە. بەمجۆرە بەدرێژایی ڕۆژگار زانای وا پەیدا بـوون، کـە ئەو پەیمانـەی بـەخوایان دابـوو جێبەجێیان کـرد، چرایان گرتـە دەسـت بـۆ رونـاك کردنـەوەی ڕێگـەی ڕێبـواران و گێڕانەوەی سەر لێ شێواوان و ڕێنمـاییکردنی گومڕایـان و ئـەو نەفسـانەیان زینـدوو کردەوە کەنزیکی مـردن بـوون و ئـەو لاشانەیان دەرهێنـا کـە چیـی نـەمابوو بکەونـە تاریکاییی دۆزەخەوە، ئەمـەش بەمـەزنترین جیـهاد دادەنـرێ لـەپێناوی خـواو پێنـاوی زیندوو کردنەوەی ئاینەکەی وگێڕانەوەی هاوسەنگییەکەی، هـەروەها گـەورەترین نزیکبوونەوەیە لەخوای مەزن و تەنیا ئەو کەسـەی لەلایـەن خـواوە زانسـت و نـوری هۆش و پەندیاری لـە بیرکردنـەوە و هـەڵس و کـەوتی پێدرابێ دەتوانـێ ئـەم کـارە بکات.

سوپاس بـۆ خـوا ئـەم کەڵـە زانایانـە لـە میللـەتی محەممـەدیی زۆرن؛ لەوانـە گـەورە یـارانی پێغەمبـەرﷺ گـەورە پەیڕەوکـەرانی وەکـو: سـەعیدی کـوڕی موسـەییەب و حەسەنی بەصری و شەعبی و ئیبن سیرین و عوروەی کوڕی زوبێر و سەعیدی کوڕی جوبێر و عومـەری کـوڕی عبدالعزیـز و تاوسـی کـوڕی کیسـان و هیـتر، هـەروەها لەوانەش ئیمامی چوار ڕێبازەکە: ئەبو حەنیفەو مالك و شـافیعی و ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەل، هەروەها سوفیانی ثەوری و فوضـەیلی کـوڕی عـەیاض و لـەیثی کـوڕی سەعد و ئەسەدی کوڕی فـورات و عبـداللە ی کـوڕی موبـارەك و عزالدینـی کـوڕی عبدالسلام و نەوەوی و مونذیری کوڕی سەعیدی بەلوطی و ئیبن تەیمیـە، هـەروەها: محەممەد کوڕی عەلی سەنوسی لەلیبیا و ئیبن بادیس و بەشیری ئیبراهیمی لە جـەزائیر، نەورسی لە تورکیا، بەدرەدین ئەلحەسەنی و محەممەد ئەلحامید لەشـام، گـەلێکی تریـش ڕەحمەتی خوایان لێ بیت. ئەمانە ئەوانەن کە (ابن القیـــم) لەبارەیانـەوە گوتویـەتی:

---

[1] ئەبو داود لەکتێبی (الملاحم) گێڕاویتیەوە.

((کۆڵەگەی ئایین بەزانست و جیهادە، لەبەر ئەمە جیهاد دوو بەشە؛ جیهادی بەدەست و نوکی شمشێر، جیهادێکیش بە بەڵگەو زمان پاراوی، ئەمە جیهادی تایبەتەکانی پەیڕەوانی پێغەمبەرانە، ئەوە جیهادی ئیمامەکانە و لەهەردوو جیهادەکە باشترە، چونکە سوودی گەلێکە و تویێشووی بە هێزەو دوژمنی زۆرە)).[1]

یەکێ لەو لووتکەو کەڵە زانایانە شێخ عبدالقادری گەیلانییە-رەحمەتی خوای لێبێ- لەسەدەی شەشەمی کۆچی هاتووە دوای ئەوەی تەرازوی کۆمەڵگای ئیسلامی زۆر لەنگ بووە و خەڵکی بەگوڕ بەرەو دنیا چوون و ڕۆژی بەپابوونەوە زۆر پشتگوێ خرا، دوای ئەوەی ئاکار بۆگەن بوو و رەوشت هەرەسی هێناو هەندێ تووشی قەپۆز بەرزیی دەوڵەمەندی بوون و هەندێکیش کەوتنە ریسوایی هەژاری. شێخ لەچەقی ڕێگا وەستاو چرای گرتەدەست و بانگی دەکرد: سەرلێشێواوەکان وەرنە لام، گومڕاکان وەرنەلام، ڕێگەی ئیسلام لێرەوەیە، وەرنەوە سەری پێش ئەوەی شەیتانەکان بچنە ناختان و ئارەزووتان لە ناوتان بباو دنیا بتان خەڵەتێنێ، هەر بەم شێوەیە مایەوە بە درێژایی تەمەنی کە ٩٠ ساڵ بوو لە ٤٧١ك. تا ٥٦١ك. شتی دیاری دەکرد و فەرمانی بە چاکە دەکردو قەدەغەی لە خراپە دەکرد، لە خوا نەبێ لەکەس نەدەترسا و لەسەر حەق گوێی لەلۆمەو سەرزەنشت نەبوو، هەزارەها کەس لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوون و دەیەها هەزاریش تۆبەیان کرد و تەرازووەکە پارسەنگی بۆ گەڕایەوەو بیدعە لەبەرچاو نەما و ڕێگە ڕۆشن بوویەوە.

هێشتا دانەرێکم نەدیوە بەتێرو تەسەلی لەم شێخ و زانایە مەزنە بکۆڵێتەوە و مافی خۆی بداتێ، زۆر لە نووسەرە کۆنەکان لەسەریان نووسیوە، بەڵام هەندێکیان بەناوی چاکە مۆری خراپەیان پێوە لکاندووە بەهۆی هەندێ لەو کەرامەتانەی کە داویانەتە پاڵی و هۆش و ژیر قەبوڵی ناکات، هەروەها ئەو دانەرە تازانەی کە لەسەریان نووسیوە نوسینەکانیان کورتە، وەکو: شێخ یونس سامەڕایی و مامۆستا فەخری گەیلانی، یاخود لە گەل نووسینی تر تێکەڵیان کردووە و باسێکی

١ مفتاح دار السعادة، ص ٧٠.

سەربەخۆیان لەسەر نەنووسیوە، وەکو: ئەبو حەسەنی نەدوی و دکتۆر ماجید عورسان گەیلانی-خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە.

بۆیە ویستم ئەم لێکۆڵینەوەیەی لەسەر بنوسم-رەحمەتی خوای لێبێ- بۆ ئەوەی هەندێ لەو مافانەی بدەمێ کە شایانێتی، لەو باوەڕە نیم ئەم توانایەم هەبێ، ئەو زۆر لەمە گەورەترە و فراوانترە، بەهەر حاڵ ئەگەر هەندێ چاکەم کردبێ ئەوە لە خواوەیە، کە خاوەنی منەت و فەزڵە و شایانی سوپاس و ستایشە، هەرکەسێ یارمەتیمی دابێ و ڕێگەی لێکۆڵینەوەی بۆم روناك کردبێتەوە شایانی سوپاسە، خوا پاداشتی خێرو چاکەیان بداتەوە، ئەگەر لەهەندێ لایەنیش کەوتبمە هەڵەوە ئەوا لەمنەوەیە و داوای لێبوردن لەخوای مەزن دەکەم.

ئەو ڕێبازی لێکۆڵینەوەیەی کە لەسەری دەڕۆم بەمجۆرەیە:

دەروازەی یەکەم/

تیشکێکی جوگرافی، تیشکێکی مێژوویی، تیشکێکی کۆمەلایەتی، تیشکێ لەژیانی رۆشنبیری.

دەروازەی دووەم / لەدایك بون و پێگەیشتن و قۆناغی خوێندن:

بەشی یەکەم: لەدایکبوونی شێخ عبدالقادر و پێگەیشتنی، بنەماڵەی، ماوەی منداڵێتی.

بەشی دووەم: گەشتەکەی بۆ بەغداو یەکەم ئەزمونی.

بەشی سێیەم: شێخ عبدالقادر لەبەغدا، کاتی وانە خوێندنی، شێخ و مامۆستایەکانی، ژیانی لەبەغدا.

دەروازەی سێیەم / قۆناغی وانەگوتنەوەو خۆئامادەکردن بۆ رابەرایەتی و چاکسازی:

بەشی یەکەم: سیفەت و ئاکارەکانی شێخ عبدالقادر.

بەشی دووەم: زانستی پاککردنەوەی دەرون؛ سەرهەڵدانی و

پەرەسەندنی و پێویستیتی بۆ کۆمەڵگا.

سەرهەڵدانی زانستی پاککردنەوە(التزکیة) ڕاستییەکەی. گوتەی کەڵـە صۆفیـەکان لەبارەیـەوە. گوتـەی زاناکـان لەبارەیـەوە. ئایـا صۆفیگەریی بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی پێویستە؟ صۆفیگەری لە مێـژووە درێژەکەی چیی بۆ ئیسلام کردووە؟ ئەنجام.

دەروازەی چوارەم / قۆناغی دەسەڵات و پەروەردەکردنی ڕێبواران.

بەشی یەکەم: زانست و وانەکانی.

بەشـی دووەم: بیروبـاوەڕی، پـەیڕەویکردن، یەکخواپەرسـتی، کێشەی سیفەتەکان، قەزاو قەدەر، پشت بەستن بـەخوا و کـردەوە، وەرع، فەرمانکردن بەچاکە و قەدەغـە کـردن لـە خراپـە، جیـهاد، پەشـیمان بوونـەوەو داوای لێبـوردن، ئیخـلاس، تـرس و تکـا، بـیروبۆچونی لـەبارەی گروپـە گومڕاکان، گێڕانەوەی فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ.

بەشـی سـێیەم: ڕێبازەکـەی: ئـارامگری، سوپاسـگوزاری، خاسکاری(التواضع)، ڕاستگۆیی و ئیخلاس، پشت بەسـتن بـە خـوای مـەزن، زوهـد لـە دنیـا، قـایلبون، خۆشەویسـتی، کۆششکردن، بەزەیی، گوێگرتن، شێخی رابەر، بنەماکانی ڕێبازی قادریی.

بەشی چوارەم: پێشبینیەکانی شێخ عبدالقادر.

دەروازەی پێنجەم /

بەشی یەکەم: مردنی و ڕاسپاردەکانی.

بەشی دووەم: ژن و منداڵ و نەوەکانی.

بەشی سێیەم: بڵاوبوونەوەی خانەوادەی گەیلانی.

بەشی چوارەم: قوتابیەکانی شێخ عبدالقادر.

بەشی پێنجەم: قوتابخانەکەی شێخ عبدالقادر دوای مردنی.

بەشی شەشەم: گوتەی زاناکان لەبارەی شێخ عبدالقادرەوە.

بەشی حەفتەم: ئەو نوسەرانەی کەباسی شێخ عبدالقادریان لە کتێبەکانیان کردووە.

بەشی هەشتەم: کتێبەکانی شێخ عبدالقادر، پەخشانی، شیعری.

پوختە.

# سەرەتا

ژینگە و دەوروبەر کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر پێکهاتەی کەسێتیی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە دروستە لەمەو دوا باسی تیشکێکی جوگرافی و مێژویی ناوچەی گەیلان بکەم. ئینجا تیشکێك لەبارەی حاڵەتی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری لەو سەردەمەدا.

## تیشکێکی جوگرافی:

لەکتێبی (مراصد الاطلاع على أسماء الامكنة والبقاع)[1] ی(صفي الدين عبد المؤمن البغدادي) کە لە ٧٣٩ك مردووە و کورتەی کتێبی (معجم البلدان)ی یاقووتی حەمەوییە. هاتووە:

وشەی (جیلان) عەرەبیەو لە گەیلانەوە وەرگیراوە، ناوی وڵاتێکی زۆرە لەپشت وڵاتی (طبرستان)، بریتیە لەکۆمەڵە گوندێك لەنێوان گوڵ و گوڵزار و شاخەکان لەسەر لێواری دەریای (طبرستان یا دەریای قەزوین).

گەیلان: نەتەوەیەکە لە فارس خەڵکی (اصطخر) لەلای بەحرین دابەزین، تیرەیەك لە (بني عجل) چوونە لایان و تێکەڵیان بوون، ئەوانە پێیان دەگوترێ جیلان.

---

١ ل ٣٦٨.

الجيل: خەڵكی گەیلان. (الجيل) گوندێکە لە گوندەکانی بەغدا لە سەر کەناری دیجلە و پێی دەگوترێ (الكيل).

لەکتێبی (الانساب)[1]ی ئیمام ئەبی سەعد عبدالكريم محمد السمعانی هاتووە: الجیلانی: نیسبەتە بۆ جەیلان، ولاتێکی ناسراوە لە پشت (طبرستان)، بەناوی بنیاتنەرەکەی ناونراوە لە نەوەی (یافثی کوڕی نوح)، هەروەها (جیلان) داریکی رەقە لە درەختی (العناب).

لەکتێبی (معجم البلدان)ی یاقوتی حەمەوی هاتووە:

جیلان: ناوی ولاتێکی زۆرە لەپشت ولاتی (طبرستان)، شاری گەورە لە جیلان نییە، بەڵکو چەند گوندێکی ناو سەوزایی و گوڵزارە لە نێوان شاخەکان، جیلانی و جیلی نیسبەتی بۆ ئەو دەدرێ، عەجەمەکان دەڵێن: گەیلان، نیسبەتەکەی (گەیلانی)یە.

بەڵام ئەبو حەسەنی نەدوی لە کتێبی (رجال الفكر والدعوة في الاسلام) کە لە (دائرة معارف البستاني)ی وەرگرتووە دەڵێ: جیلان یان گەیلان هەروەها پێی دەگوترێ ولاتی (دەیلەم) کە دەکەوێتە بەشی باکوری ڕۆژئاوای ولاتی فارس، لە باکورەوە سنوری تالیّسی روسییە، لە خواروی ڕۆژئاوا چیاکانی (ئەلبوز) کە دەکەوێتە نێوانی و نێوان ئەزربێجان و عێراقی عەجەم، لە خواروی ڕۆژی هەڵاتی مازندەران، لە باکوری ڕۆژهەڵاتی دەریای قەزوین.

بەجۆرە جیلان یان گەیلان ناوچەیەکە دەکەوێتە خواروی ڕۆژئاوای دەریای قەزوین.

بەڵام کتێبە جوگرافیا نوێیەکان[2] دەڵێ: ئێران بەسەر چواردە ناوچە دابەش

---

[1] ٥/ ١٤٦/٢.

[2] کتێبی جوگرافیای پۆلی یەکەمی دواناوەندی لە کوێت، ل ١٤٣

بووە، یەکێ لەوانە ناوچەی گەیلانە، کە دەکەوێتە خوارووی ڕۆژئاوای دەریای قەزوین، ئەو ناوچەیە بارانی زۆرە، ڕووباری زۆرە، خاکێکی بە پیتی هەیە، دانیشتوانی زۆرە، هەموو جۆرە دانەوێڵەکی لێ دەچێنرێ لەگەڵ چەوەندەر و چای و میوە و سەوزەوات. گرنگترین شاری (رشت)ە لەسەر کەناری دەریای قەزوین، لەساڵی ١٩٩٠ لەو ناوچەیە زنجیرەیێ بومەلەرزەی لێ پەیدابوو، کە زیاتر لە سی هەزار کوژراو بوونە قوربانی.[١] درێژی ناوچەی گەیلان (٢٢٥) کم و پانیی لەشارەوە تا دەریا لەنێوان (٢٥) کم و (١٠٥) کم.

## تیشکێکی مێژوویی:

لەساڵی هەشتەمی کۆچی پێغەمبەرﷺ نامەی بۆ پاشاکانی دورگەی عەرەبی و ولاتەکانی دەوروبەری هەنارد، لەوانە نامەیەك بۆ کیسرای پاشای فورس کە عبداللە ی کوڕی حوذافەﷺ بۆی برد، هەر کە کیسرا نامەکەی خوێندەوە پارچە پارچەی کرد. جا کە پێغەمبەرﷺ بەمەی زانی فەرمووی: ((**اللّـــهُمَّ مَـــزِقْ مُلْكَـــهُ**: خوایە دەوڵەتەکەی پارچە پارچە بکەی))، خوای گەورەش داواکەی قەبووڵ کرد.

لەتبوونی دەوڵەتی کیسرا لەڕۆژی مەهران یان ڕۆژی (النخیلة) لە ساڵی(١٥ك) دەستی پێکرد، سەرکردەی موسڵمانەکان (جەریر کوڕی عبداللە) و (موثەننای کوڕی حاریثەی شەیبانی) بوو، مەهران هەندێ لەدەست و پێوەندەکانیانی کوشت، دوایی جەنگی قادسیەی بەدوا داهات لە (١٦ك) بە سەرکردایەتی (سەعد کوڕی ئەبی وەقاص)ﷺ کە چوار ڕۆژی خایەند و ڕۆستەم و زۆربەی سەرکردە فورسەکان کوژران و پاسەوانەکانی تایبەتیی ڕۆستەم کە (جند شاهنشـــاه) بوو و ژمارەیان (٤٠٠٠) کەس بوو خۆیان دایە دەست و بەگەڵ موسڵمانەکان کەوتن و

---

[١] لە ١٩٩٠/٦/٢١ بوومەلەرزەیەکی توند لەو ناوچەیە ڕوویداو قوربانییەکانی (٢٥,٠٠٠) کوژراوو (١٠٠,٠٠٠) بریندار زیاتر بوو.

دوایی بوونه موسڵمان.[1]

ئینجا جەنگی مەدائین لە (١٦ك) دەستی پێکرد، مەدائین پایتەختی کیسرا بوو، لەسەر لێواری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەیە و ناوی (طیســـفون) بوو، عەرەبەکان ناویان لێنا مەدائین لە بەر زۆریی گەڕەکەکانی، عەرەبەکان بەسەرکردایەتی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) لەم جەنگەدا سەرکەوتن، ئینجا جەنگی جەلەولا لە (١٦ك) یاخود (١٧ك) بە سەرکردایەتی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)، ئینجا جەنگی نەهاوەند یا (فتح الفتوح) لە ساڵی (١٩ك) یان (٢٠ك)[2] بە سەرکردایەتی (نوعمانی کوڕی موقرین)ﷺ کە لەم جەنگەدا کوژراو دوای ئەو (حوذەیفەی کوڕی یەمان)ﷺ سەرکردایەتی گرتە دەست و موسڵمانەکان لەم جەنگەدا بەسەر کەوتن و سوپای فارسەکان زۆربەی لەناوچوو، گەلێکیان کوژران و گەلێکیان بەدیل گیران و لەدوای ئەم جەنگە وڵاتی ئێران بۆ موسڵمانەکان کرایەوە و شار لەدوای شاریان رزگار کرد، هەمەدان لە (٢٣ك)، قوم و قاشان و ئەصبەهان لە (٢٣ ك) یان (٢٤ ك).

دوو مانگ دوای جەنگی نەهاوەند موسڵمانەکان شاری (ڕەی) تارانی ئێستایان بەسەرکردایەتی (بەراء کوڕی عازیب)ﷺ رزگار کرد، هەروەها بورجی قەزوین و گەیلان و بەبەرو طەیلەسان و زنجانیان رزگارکرد کە لە ناوچەی دەیلەمەن.[3] ئەم ناوچانە لەژێر دەستی موسڵمانەکان رادەپەرین و دووبارە دەیانگرتەوە.

دوایی بەسەرکردایەتی (حوذەیفەی کوڕی یەمان)ﷺ لەساڵی (٢٠ ك) یان (٢٢ ك) ئەزربێجانیان رزگار کردو دووبارە گەیلانیان رزگار کردەوە و دیسان راپەرین و ئەمجارە (سەعیدی کوڕی عاص) رزگاری کردەوە و زۆربەی دانیشتوانەکەی

---

٥ موسوعة التأقیخ الاسلامي للدکتوقا احمد شلبي، ج ٨ ، ک ٥٥ .

٨ فتو ذ البلد اذ للبلا ذقه، ک ٤٩٢.

ی سەرچاوەی پێشوو ، ک ی٥ی.

بوونە موسڵمان و قورئانیان خوێند.[1]

بەڵام (یەزد گورد)ی دوا پاشـای فارسەکان لـە دوای جەنگی نەهاوەند هەڵاتـە (ئستەخر) و لەوێوە چووە خوراسان، دوایـی بەرەو (مەرو) ڕۆیشـت و لـە (٣١ ك) لەوێ کوژرا، بە مردنی دەوڵەتی ساسانی کۆتاییی پێهات و لەت لـەتبوو بـە دوعـای پێغەمبەرﷺ دوای ئەوەی کیسرای پاشایان نامەکەی پێغەمبەری دڕاند.

موسـڵمانەکان لـە وڵاتـی فارسـدا بڵاوبوونـەوە، زۆریـان لـەوێ شـەهید کـران. هەروەها زۆر لەوێ نیشتەجێبوون و ژنی فارسیان هێنا، (بلازری)[2] دەڵـێ: حەسەن و حوسەین هـەردوو کـوڕی ئیمـامی عـەلیؓ لـە سـوپای (سـەعیدی کـوڕی عـاص) بـوون، هـەر کـە (طبرسـتان) و گـەیلانی ڕزگـار کـرد، دوای ئەمـە حوسـێنؓ (شابانوو)ی کچی (یەزدگورد)ی دوا پاشای فارسی[3] مارەکرد، ئینجا فارسەکان بە تاك و کۆمەڵ دەهاتنە ناو ئیسلام و.عـەرەب تێکـەڵی فـارس بـوون و زمـانی عەرەبـی لەوێدا بڵاو بوویەوە. هێشتا گـۆڕی هـەندێ کەڵـە پیـاوی عـەرەب گـەواهین لەسـەر بڵاوبوونەوەیان لەو وڵاتە و دیارترینیان گۆڕی (قەسم کوڕی عەباس)ؓ کـە هێشـتا لـە شـاری سـەمەرقەندەو زیارەتگایـە،[4] هـەروەها (حوذەیفـەی کـوڕی یـەمان)ؓ لەمەدائن مردووە و لەوێ نێـژراوە، سەلمانی فارسیؓ لـەگوندێکی نزیـك مـەدائین مردووە و لەوێ نێژراوە، ئێستا پێی دەگوترێ (سلمان پاك) نیسبەت بـەو، خـەڵکی تریـش لــەیاران و شـوێنکەوتوان و ئەوانــەی شـوێنی ئەمانــەش کــەوتوون لـــە موسڵمانەکان ئەو وڵاتەیان پێ خۆش بووەو لێی نیشتەجێ بوونـە و لـەوێ مردوونـە، تـەنیا لـە ئێران نـا بـەڵکو لـە پاکستان و هینـد و ئەفغانستان و شـوێنی تریـش، کـە ڕزگاریان کردووە لەوێ ماونەتەوە. بۆیە سەیر نییە کە هەندێ خانـەوادەی عەرەبـی لەو شوێنانەن، هەرچەندە ئێستا بـە فارسـی و ئۆردی و بلووشـی دەدوێـن و هیـچ لـە عەرەبی نازانن.

---

٥ فتو ف البلد ان للبلا ذرە، ل ٣٢٠. ٨ سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢٦.

ی موسوعة التأريخ الاسلامي لأحمد شلبي، ج ٨ ، کی٥.

ی فتو ف البلد ان للبلا ذرە، ک ٩٨ی.

لەسەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچییەوە -واتـــا: لـە خەلیفایـەتی مـەئموون- هـەندێ ویلایـەتی دووری ئـێران لـەژێر دەسـەڵاتی بـەغدای پایتـەخت دەرچــوو و سەربەخۆیی وەرگرت و تەنیا بە ناو سەر بە بەغدا بوو، لەخوراسان دەوڵەتی تاهیری دروست بوو، کە بۆ (تاهیری کوڕی حوسـێن)ی سـەرکردەی سـوپاکانی مـەئموون دەگەڕێتەوە لەساڵی (٢٠٥ك)، پایتەختەکەی نیشابوور بوو. ئـەم دەوڵەتـە هـەوڵی دا دەست بگرێتە سەر (طبرستان) و گـەیلان، بـەڵام نـەیتوانی. خـەڵکی (طبرســـتان) و گەیلان داوایان لە پیاوێکی شیعە کرد لەشاری (ڕەی) کـە نـاوی (حەسـەنی کـوڕی زەید کوڕی محەممەد) بوو لە نەوەی (حەسـەنی کـوڕی عـەلی کوڕی ئەبو تالیب)ﷺ لەساڵی (٢٥٠ك) تا (٣١٦ك).[1] لەگەڵ (حەسەنی کوڕی زەید) هەردوو ئامۆزای: (ئیدریسی کوڕی موسا) و برایەکەی (داودی کوڕی موسا) و (کوڕی عبـدالله) کـە باپیری چوارەمی شێخ عبدالقادری گەیلانییە.[2]-هەر وەك لەدواییدا باسی دەکەین- ، ئینجـا دەوڵـەتی (زیـاری) کـە بـۆ (مـەرداویچی کـوڕی زیـار) دەگەڕێتـەوە کـە لــە (دەیلەم)ن شوێنی دەوڵەتی (زەیدي)ی گرتەوە لە (٣١٦ ك) تـــا (٤٣٣ ك).

ئاماژە بـەوە دەکـەین، کـە دامەزرێنـەری دەوڵـەتی زەیدیـی عەلـەوی (حەسـەنی کوڕی زەید) ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئیسـلام لـەوڵاتی دەیلـەم و گەیلاندا، هەروەها زانای مەزن (حەسەنی کوڕی عەلی) کە بە (ئەتروش) بـەناوبانگ بوو ڕۆڵێکی مەزنی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە (طبرستان) و وڵاتی هیند.[3]

ئینجـا دەوڵـەتی بوەیهیـەکان لـە (٣٢٠ ك) تـا (٤٤٧ ك) پێکـهات، بوەیهیــەکان بەڕەسەن لە وڵاتی دەیلەمن، کە لـە سـەر ڕێبـازی شیعە بـوون و جگـە لـە گـەیلان و بەشێك لە (طبرستان)، کە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی زیاری بوون- دەسـتیان بەسـەر هەموو ناوچەکانی ئێراندا گرت و دەسەڵاتیان گەیشتە بەغدای پایتـەختی عەباسـی و

---

٥ موسوعة التأريخ الاسلامي، ج ٨ ، ک ئ‌ۆ / تاريخ ابي الغداۀ، ج ەە،ی‌ی.

ە الكامل لأبن الأثير، ج ٧ ، ک یی٥- ی‌ی٥

ی مرنج الذهب للمسعو دە، ج ٤ ، ک ی‌ەە.

بەویستی خۆیان خەلیفەکانیان لادەداو دایان دەنان، خەلیفەی عەباسی هیچی لەدەست نەبوو تەنیا ناوی لە خوتبەی ڕۆژی هەینی دەهات لەگەڵ ناوی سوڵتانی بوەیهی، پایتەختی بوەیهییەکان شاری شیراز بوو لە خواروی ئێران.

لەساڵی (٤٣٢ ك) دەوڵەتی سەلجوقیەکان دامەزرا کە تا ساڵی (٥٨٣ ك) بەردەوام بوو، ئەم دەوڵەتە شوێنی دەوڵەتی سامانی و غەزنەوییەکانی گرتەوە لەخوراسان و پشت ڕووبار(وراء النهر)، هەروەها شوێنی بوەیهییەکان لە ئێران و عێراق، هەروەها گەیشتە ڕۆم لە ئاسیای بچوك(ئەنادۆڵ)، بنەچەی سەلجوقیەکان لە هۆزەکانی تورکی (الغـز)ن کە لە وڵاتی تورکستانەوە کۆچیان کرد و بوونە موسڵمان و لەسەر ڕێبازی سوننی بوون بە پێچەوانەی بوەیهیەکان، دەستەڵاتی سەلجوقیەکان فراوان بوو، تا لە ساڵی (٤٤٧ ك) بەسەرکردایەتی (توغرول بەگ) چوونە بەغدا دەوڵەتی بوەیهییەکانیان لەناو برد، پایتەختی رامیاریی سەلجوقیەکان شاری (ڕەی) ئینجا (ئەسفەهان) بوو، (توغرول بەگ) پێش ئەوە لە (٤٣٣ ك) دەوڵەتی (زیاري)ی لەناو برد کە لە (طبرستان) و گەیلان بوو.[1]

یەکێ لە لوتکەکانی شاخ لە ڕۆژئاوای ناوچەی گەیلان، کە دەکەوێتە (ئەزربێجان) قەڵایەکی سەخت هەبوو پێی دەگوترا (ئالووت) کە وشەیەکی دەیلەمییە و بەواتای (لانەی باز) دێ، پیاوێ هەبوو بە ناوی (حەسەن کوڕی سەباح) بەهێزترین ڕا لەسەر ئەوە بوو، کە فارس بوو وخەڵکی شاری (طـوس، مەشهەدی ئێستا) بوو، هەرچەند خۆی لەگەڵ ئەم بۆچونە نەبوو.[2] بڕوای بە ڕێبازی ئیسماعیلیی (بـاطنی) هەبوو، لەکۆشکی مەلیکشای سوڵتانی سەلجوقی کاری کردووە، لەگەڵ وەزیرەکەی (نیزام ئەلمولك)، ئینجا لەساڵی (٤٦٩ ك) لەڕەیەوە بەرەو ئەسفەهان و ئەزربێجان ڕۆیی، جا سەری لە وڵاتی شام داو لە (٤٧١ ك) چووە میسر، لەوێ لەشاری قاهیرە لە (دار الحكمـة) کە (حـاكم بـأمر الله)

---

١ سلاجقة ايران و العراق للدكتور عبد المنعم محمد حسين، ص ٣٥.

٢ موسوعة التأريخ الاسلامي، ج ٨، ص ١١٨.

دایمەزراندبوو ڕێبازی ئیسماعیلیی خوێند. لە (٤٧٣ ك  ١٠٨٠ ز) گەڕایەوە ئێران و دەستی بە بڵاوكردنەوەی ئەو ڕێبازە كردو خەڵكێكی زۆر دوای كەوتن. خۆی و گروپەكەی لەساڵی ٤٨٣ بە زۆر و فڕوفێڵ توانیان دەست بەسەر قەڵای (ئالموت) بگرن لە خاوەنە عەلەوییەكەی و دەوڵەتی (حشاشین فدّاویة)ی تێدا دامەزراند، (ماركۆپۆلۆ)ی گەڕۆكی ئیتالی دەگێڕتەوە، كە دەست و پێوەندەكانی خۆی لەسەر هەندێ حەشیشی دیاریكراو ڕادەهێنا، ئەم وشەیە (حشاشون) گەیشتە زمانە بێگانەكان و بووە (ass  assins)، دوایی واتاكەی بووە پیاوكوژ و خوێنڕێژەكان، چونكە (حەسەنی سەباح) دوژمنەكانی خۆی بەدزی و فرت و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و زیرەكی لەناودەبرد، تا وای لێ هات ترس و تۆقاندنی خستە دڵی هاوچەرخەكانی و دایكان منداڵەكانیان بە شێخی ناو شاخ دەترساند، تا ئەو نزیكانەش لەوڵاتی شام ئەمە بەردەوام بوو، ئەم حەشاشانە دەستیان گرتە سەر سەد(١٠٠) قەڵا زیاتر، كە لە چیاكانی (ئەلبورز) بڵاوببوونەوە، كە لە ئەزربێجان درێژدەبوونەوە، تا خواروی قەزوین بەلای ناوچەی كرمانەوە، ئەم قەڵاتانە دەسەڵاتیان بەسەر ڕێگای هاتوچۆ و پۆستە و كاروانەكانەوە هەبوو، مەترسییان خستە دڵی خەڵكەوە و باج و سەرانەیان لەسەر دادەنان و كاروانەكانیان ڕوت دەكردو ئەوەی لەپێشیان بوەستابایە دەیانكوشت، سەلجوقیەكان هەوڵیان دا لەناویان ببەن، بەڵام لەبەر سەختی قەڵاكانیان نەیانتوانی، زۆر جار گەمارۆی قەڵاكانیان دەدا، بەڵام لەبەر زۆریی ئاوو خۆراك لەناو قەڵاكان هیچیان پێ نەدەكرا و سەرەڕای ئەمەش باو باران و بەفرو سەرمای زستان ناچاری دەكردن گەمارۆكە بشكێنن. لە دەی ڕەمەزانی ساڵی (٤٨٥ ك - ١٠٩٢ ز) وەزیری گەورە (نظام الملك)یان كوشت، كە وەزیری مەلیكشای سوڵتانی سەلجوقی بوو، لە دوای مانگێ سوڵتان بەژەهركراوی مرد، هەروەها لە (٤٩٢ ك) ئەمیر (أنَرْ)یان كوشت، هەروەها لە (٥٠٠ ك) وەزیر (فخر الملك)یان كوشت[١] و گەلێكی تریش، دووجاران هەوڵیان دا سوڵتان صلاح الدین ئەییوبی لە وڵاتی شام بكوژن، دوای ئەوەی كە

---

١ سلاجقة ایران والعراق، ص ٩٠.

قەلاّکانی (مسیاف) و (ڕەسافە) و (قەدمووس)یان گرت، بەلاّم خوای مەزن لە دەستیانی ڕزگار کرد، (حەسەنی سەباح) نازناوی (داعي الدعاة)ی لەخۆی نابوو و پەرستنەکانی لەسەر دەست و پێوەندەکانی لابردبوو، هەروەها یەکێ بوو لە لایەنگیری گروپی نزاریی ئیسماعیلی، کە لە دوای مردنی (المنتصر بالله)ی نەوەی (الحاکم بأمر الله) لە (٤٨٧ ك) لە دەولەتی فاتمی هەلگەڕایەوە لە میسر، ئەم (حەسەن)ە کوڕێکی ساوای لەدوای خۆی جێهێشت کە ناوی (المستعلي) بوو، ئەمە کوڕی خوشکی (الافضل بن بدر الجمالي)ی ئەرمەنی بوو، کە سەرکردەی سوپاکان بوو، (الافضل) نزاری بەدیل گرت و بەندی کرد و (المستعلي)ی کوڕی خوشکی لەجێی دانا، بەم جۆرە ئیسماعیلیەکان بونە دوو گروپ: (نزاریی) و (موستەعلیی). (حەسەنی سەباح) لە (٥١٨ ك) مردو خەلیفەکانی لەجێگای دانیشتن و بەردەوام بەرەنگاریی دەولەتی سەلجوقی و هێرشەکانیان دەکرد، تا دەولەتەکەیان بێ هێز بوو و کۆتاییان لە ئێران لەسەر دەستی هۆلاکۆ بوو لە (٦٥٤ ك ١٢٥٧ ز)، هەر کە بەناو ئێران کەوت و قەلاّکانیانی تێکداو دەربەدەری کردن لە ولاّت، هەروەها کۆتاییان لە شام لەسالّی (٦٧٠ ك ١٢٧٢ ز) لەسەر دەستی (زاهیر بیبرس) بوو کۆمەلّەکانیان چونە هیند، هەندێ لە بەکرێگیراوەکانیان بەئاغا خان دەناسران، لەسالّی (١٢٣٣ ك) ئاغا خانی یەکەم، ئینجا دووەم و سێیەم، ئێستاش ئەوانە لەژێر دەسەلاّتی (کریم)ی ئاغاخانی چوارەمن.

لەو سەردەمەی کە لە گەرمەی ئاژاوەی رامیاری و سەربازی و بیروباوەڕی مەزهەبیدا بوو، شێخ عبدالقادری گەیلانی لە (٤٧٠ ك ١٠٧٧ز) لەدایکبوو، واتا لەسەردەمی مەلیکشای سولّتانی سەلجوقی و وەزیرە مەزنەکەی (نظام الملك) لە دایکبووە. هەر کە تەمەنی گەیشتە سێزدە سالّ ئیسماعیلیەکان بەسەرکردایەتی (حەسەنی سەباح) لە (٤٨٣ك) قەلاّی (ئالموت)یان گرت و دەستیان کرد بەبلاّوکردنەوەی ڕێبازەکەیان و باج و سەرانەیان لەسەر خەلّکی دادەنا، هەرچی دژیان بوایە دەیان تۆقاند و بەدزی لەناویان دەبرد، ئینجا دەسەلاّتیان بەسەر قەلاّکانی دەورو بەری چیای (ئەلبورز) داگرت کە دەڕوانێتە سەر ناوچەی گەیلان.

لەساڵی (٤٨٥ ك) مەلیك شای سوڵتانی سەلجوقی کۆچی دوایی کرد، بەمردنی ناکۆکی کەوتە نێوان هەردوو کوڕەکەی، کوڕە گەورەکەی (بەرکیارق) لەلایەك و (مەحموود)ی کوڕە بچوکی و (تورکان) خاتونی دایکی لە لایەکی ترەوە، هەروەها لە نێوان (بەرکیارق) و مامەکەی (تتش)ی تاجی دەوڵەت و والیی دیمەشق، لەم ناکۆکیەدا (مەحموود)و دایکی مردن و (تتش) لە جەنگێکدا لە نزیك ڕەی کوژرا، (بەرکیارق) لە ساڵی (٤٨٨ك)[1] کارەکەی جێگیر و دامەزرا، واتا لەو ساڵەی کە شێخ عبدالقادری گەیلانی نیشتمانی بەجێهێشت و بەرەو بەغدا ڕۆیشت. ئەمەو سەرەڕای ئەو ناکۆکیە ڕێبازییانەی نێوان پەیڕەوانی ڕێبازی شافیعی و پەیڕەوانی ڕێبازی حەنبەلی کە هەندێ جار دەگەیشتە رادەی کوشتن و بڕین و تالان و گۆڕ دەردان، ئەمانە رووی دەدا لەو کاتەی شێخ عبدالقادر بەرەو دنیا دەهات.

پێش ئەوەی باسی ژیانی شێخ عبدالقادر و گەشەکردنی بکەین، وا چاکە تیشکێك لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەی وڵاتانی ئیسلامی باس بکەین.

## تیشکێکی ژیانی کۆمەڵایەتی :

ئیسلام هێڵەپانەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی میللەتی موسڵمانی دەستنیشان کردووە، کە ژیانێکی ناوەندییە، بێ زیادەڕەوی و بەفیڕۆدان، بێ خەرجکردنی زۆرو قرچۆکی، هاوسەنگییەك لە نێوان دنیا و ڕۆژی دوایی هەبێ، لەگەڵ سەنگبونی تای تەرازوی ڕۆژی دوایی، چونکە فیتنەی دنیا گەورەترە ونەفس زێتر ئارەزوی لێیەتی، بۆیە دەبێ هەمیشە تای تەرازوی ڕۆژی دوایی سەنگین تر بێ، بۆیە پێغەمبەرﷺ زۆر جاران ئاگاداری یارانی خۆی لە دنیا و فیتنەکەی دەکردەوە، زۆر جار پێی رادەگەیاندن، کە ئارەزوبوون لە دنیا لەناویان دەبات، هەروەك ئەوانی پێش ئەمانی لەناوبردووە، دەیفەرموو: ((**إِنَّ مِمَّا أَخَافُ عَلَيْكُمْ بَعْدِي مَا يُفْتَحُ**

---

[1] سلاجقة ایران والعراق، ص ٨٨.

**عَلَيْكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَزِينَتِهَا...** : ئەوەی لەدوای خۆم لێتـان دەترسێم خۆشی و جوانیی دنیایە کە بۆتان دەکرێتەوە و دەڕازێنرێتەوە.))[1]

پێغەمبەرﷺ دەیزانی کە دنیا بۆ موسڵمانان دێتە پێش و ئاسان دەبێ، بۆیە سوێندی لەسەر ئەمە دەخوارد و بە یارانی خۆی دەگوت: ((**فَوَاللَّهِ مَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُـمْ وَلَكِنِّي أَخْشَى أَنْ تُبْسَطَ الدُّنْيَا عَلَيْكُمْ كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ قَبْلَكُمْ فَتَنَافَسُـوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا فَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ**: سوێند بەخوا لـە هـەژاری لێتـان ناترسێم، لەوەی دەترسێم دنیاتان بۆ بکرێتەوە هـەروەك چۆن بـۆ ئـەوانی پێش ئێـوە کرایـەوە، ئێوە پێشبڕکێی لەسەر دەکەن هەروەك ئەوان دەیان کـرد، لـەناوتان دەبـات هـەروەك ئەوانی لەناوبرد.))[2]

هەروەها پێی دەفەرموون: ((**إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ وَإِنَّ اللَّهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيـهَا فَنَاظِرٌ كَيْفَ تَعْمَلُونَ، أَلا فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ...**: دنیا سەوزەو شیرینە، خوا ئێوەی تێدا بە جێهێشتووە، سەیر دەکا چۆن هەڵس و کەوت دەکەن، خۆتـان لـەدنیا و ئافرەت بپارێزن..))[3]

هەروەها دەفەرمووێ ((**كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَـبِيلٍ**: لـەدنیادا وەکو ئاوارە و کۆچەر یان ڕێبوارێ بە.))[4]

یـارانی پێغەمبـەرﷺ بـاش لـەم وانەیـە گەیشـتن و لەبـەریان کـرد و لـە ژیانیـاندا جێبەجێیان کرد، هەروەها شوێنکەوتوان و ئەوانـەش کـە بەچاکـە شـوێنیان کـەوتن، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی ((**خَيْرُكُمْ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، قَـالَ**

---

١ بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە؛ جامع الاصول، ج ٤، ص ٥٠١.

٢ موسلیم گێڕاویەتەوە؛ مختصر صحيح مسلم رقم ٢٠٨٠.

٣ موسلیم و نەسائی گێڕاویانەتەوە؛ جامع الاصول، ج ٤، ص ٥٠٤.

٤ بوخاری گێڕاویتیەوە؛ جامع الاصول، ج ١، ص ٣٩٢.

**عِمْرَانُصين- فَلاَ أَدْرِي أَذَكَرَ بَعْدَ قَرْنِي قرنيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً، ثُمَّ إنَّ بَعْدَهُمْ قَوْماً يَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ وَيَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ وَيَنْذُرُونَ وَلاَ يُوفُونَ وَيَظْهَرُ فِيهِمْ السِّمَنُ:** چاكترینتان ئەوانەن كەلەسەردەمی مندا دەژین، ئینجا ئەوانەی لە دوایان دێن، ئینجا ئەوانەی لەدوای ئەوانەوە دێن، عیمران گوتی: نازانم دوای گوتنی (بعد قرني) باسی ئەوەی كرد یان سێ سەدە، لەدوای ئەم سێ چینە چینێ دێ كەشایەدی بەدرۆ دەدەن و شاهید نابن، خیانەت دەكەن و بە ئەمیندار دانانرێن، نەزرو خێر لەسەر خۆیان دادەنێن و جێبەجێی ناكەن و زۆرخۆری و قەڵەویان لێ پەیدا دەبێ.))[1]

ئەبوبەكر و عوسمانی كوڕی عەفان و عبدالرحمنی كوڕی عەوف و زەیدی كوڕی سابت و زوبێری كوڕی عەوام و تەلحەﷺ لە دەوڵەمەندە گەورەكان بوون، بەڵام دنیا لە دەستیان تێنەپەڕی و قەت نەگەیشتە دڵیان، ئەوەتا ئەبوبەكرﷺ هەموو سامانی خۆی دەكاتە خێر بۆ سوپای (العسرة-جەنگی تەبووك-)، هەروا عومەرﷺ نیوەیماڵی دەكاتە خێر، عوسمانی كوڕی عەفان سێسەد حوشتر بەبارەوە دەكاتە خێر، لەگێڕانەوەیەكی تردا هەزار دیناری كردە خێر و لەپێش پێغەمبەری دانا و پەرتی كرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی ((**مَا عَلَى عُثْمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ هَذَا:** عوسمان چیی لەسەرە؟ هیچ كارێكی تر وەكو ئەمەنییە.))، ئەوەتا عبدالرحمنی كوڕی عەوف لەشامەوە كاروانێكی بۆ دێ و هەموو جۆرە كەلوپەلی تێدایە، هەمووی لە ڕێگەی خوا دەكاتە خێر. ئەمە عومەری كوڕی خەتابﷺ دوای ئەوەی بووە خەلیفەی موسڵمانان و بەهێزترین كار بەدەست بوو لەسەر زەوی لەو كاتەدا، كیسرا و قەیسەر لێی دەترسان، نێردراوی كیسرا دێتە لای و دەبینێ لەژێر سێبەری درەختێ خەوی لێكەوتووە و جل و بەرگێكی پیناوی و كۆنی لەبەرە، لەم دیمەنە سەری سوڕ دەمێنێ و دەڵێ: بەڕاستی داد پەروەریت كردووە بۆیە بێترس نووستویت.

هەر كە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصﷺ مەدائینی ڕزگار كرد و دەستی بەسەر

---

[1] متفق عليه؛ سنن النسائي رقم ٣٨٠٩.

عومەریش لەمزگەوتی دانا و بەهەردوو دەستی هەڵگێڕ و وەرگێڕی پێدەکرد و دەیگوت: ((إن قوماً أدّوا هذا لأمنـــاء: ئەوانەی ئەمانەیان هێناوە دەستپاکن))، حەزرەتی عەلیﷺ پێی گوت: ((لقد عففت فعفوا، ولقد رتعــت لرتعــوا: تۆ پاك بووی و ئەوانیش پاکبوون، گەر خراپ بای ئەوانش خراپ دەبون)).

ئەبو حەنیفە و مالیکی کوڕی ئەنەس و لەیسی کوڕی سەعد و گەلێك لە شوێنکەوتوان و شوێنکەوتوی شوێنکەوتوان هەموو دەوڵەمەند بوون، بەڵام دنیا لەدەستیان تێنەپەڕی و نەگەیشتە دڵیان، ئەوان وانەی پێغەمبەریان لەبەر کردو بە گوتەو کردەوە جێبەجێیان کرد.

بەڵام هەندێ لەدوای ئەمانەوە هاتن و بەرە بەرە وانەکەیان لەبیر کرد و بەرەبەرە ڕۆژی دوایی لە دەستیان دەرچوو و بەرەبەرە دنیاویستی بەرەو دڵیان دەخشی، دنیا زۆر بەگوڕ بۆیان هات بە سوار و پیادە و سامان و رازاندنەوەکانی و زەخرەفەوە، ئەوەی لەسەرەتادا فێرکران لەبیریان کرد.

یەکەم لاسەنگی، کە پەیدا بوو لە ساختمان بنیاتنان و ئارایشتدان و زەخرەفە کردنی مزگەفتەکان بوو، دوای ئەمە بەرەو شانازی کردن لەجل وبەرگ و ناومالّی بەنرخ چوو، ئینجا بەرەو کۆکردنەوەی کۆمەڵێ ئافرەتی گۆرانیبێژ و کۆڕی رابواردن و خواردنەوە، هەتا لە شاری مەککەو مەدینەش کۆڕی رابواردن و گۆرانی و خواردنەوە رێك دەخرا.

هەر لەسەرتای دەوڵەتی ئەمەوییەوە کەم و کوڕی خۆی خزاندە ناو هاوسەنگیی دنیا و ڕۆژی دوایی، دوای ئەوەی فتوحات زۆر بوو و درێژەی کێشا، سامان لافاوی کردو کەوتە دەست خەڵکیەوە، بەڵام بڕوا زۆر بە توندی بەرامبەر سامان راوەستا و بەرەو شوێنی شیاو ئاڕاستەی دەکرد، هەرکە کزی و لاوازی خۆی خزاندە ناو بڕوای گەلێکیان، ئیتر نەفسیان بەرەو سەرکەشی و توغیان ملی نا ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ: وانیە، مرۆڤ، کە بینیی دەوڵەمەند بووە، پێی لەبەرە خۆی دەرەچێت، نەفسی تووشی تۆغیانی سامانداری دەبێ﴾[1]،

---

[1] العلق / ٦-٧.

تەرازووەکە بەرە بەرە لار دەبێ و بەرەو دنیا دەچێ، ئینجا تەرازووەکە بەرەو هاوسەنگی هاتەوە و تۆزێ بەرەو ڕۆژی دوایی لاربوویەوە لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز ﷺ هەژارەکان لە سەردەمی ئەودا خێر و سەدەقەیان وەرنەگرت و دەوڵەمەندەکان کەسیان بەدەست نەدەکەوت کە زەکاتیان بدەنێ، دوای وەفاتی عومەری کوڕی عبدالعزیز تەرازووەکە بە تەواوی لاسەنگ بوو، دەوڵەمەندەکان زێتر دەوڵەمەند دەبوون و هەژارەکان زێتر هەژار دەبوون، سامان لەشوێنی شیاوی خۆی خەرج نەدەکرا، ڕژدی لەناو خەڵك بەدیار کەوت، پارە بەشێوەیەکی لە رادە بەدەر لەوشتانە خەرج دەکرا، کە لە شەرعی خوادا نەبوون، لە کۆمەڵگای ئیسلامی دەوڵەمەندیی و هەژاریی لە رادە بەدەر سەری هەڵدا، بەتایبەتی لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچی، ئەم حاڵەتە بەرەبەرە لە زیادبووندا بوو بە تایبەتی لە سەردەمی یەزیدی کوڕی عبدالمليکی خەلیفەی ئەمەوی کە لە دوای عومەری کوڕی عبدالعزیز هات، هەروەها لە سەردەمی خەلیفە ئەمینی عەباسی کە لە ١٩٨ ك مردووە و لەسەردەمی مەئموونی برای کە لە ٢١٨ ك مردووە و لەسەردەمی موعتەزیدی خەلیفەی عەباسی کە کچی (خەمارە ویەی) والیی میسری هێنا، ئەو کچەی کە باوکی پارەیەکی هێندە زۆری لێ خەرجکرد کە لەوەوبەر نەبیستزابوو.

ئەم سامانە هەمووی لەناوو ناوبانگ و ریا خەرج دەکرا، یاخود دەدرایە شاعیر و ماستاو ساردکەران، یان بۆ خزم و کەسوکاری خەلیفە و کاروباری تر بوو، لە هەمان کاتدا خەڵکی رەمەکی لەبەر برسێتی و هەژاری و لانەوازی و گرانیناڵەیان لێوە دەهات.

## تیشکێك لە ژیانی رۆشنبیری :

کانیی بێگەردی ئیسلام لە مەککەی پیرۆز تەقییەوە، هەر کە خۆی گرت لە ساڵی یەکەمی کۆچی بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ و لەوێ پێگەیی و بووە خاوەنی هێز و توانا، ئینجا لەساڵی هەشتەمی کۆچی هەموو دوورگەی عەرەبی داگرت و دوایی بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکور خشی، لەڕۆژ هەڵات گەیشتە سند و هند و ئەودیو رووبار لەسنووری چین، لەباکور گەیشتە ئەزربێجان و ئەرمەنیە تا

گەماڕۆی قوستەنتینیەی‌دا، لە ڕۆژئاوا گەیشتە دەریای تاریك-زەریای ئەتلەسی-، ئینجا لە ڕێگەی جەبەل تاریقەوە بەرەو باکور چوو بۆ ئیسپانیا و فەرەنسا، تا گەیشتە شاری بواتیە، هەروەها دوورگەی سقلیەو کریتی گرتەوە.

ئەو روبارە لە ڕۆیشتنیدا گەلێ لقی هاتە ناو کە لەگەڵ کانگا رەسەنەکەی پەیوەندی نەبوو، ئەو لقانە هەندێکیان لە ژیاری فارسییەوە سەرچاوەی گرتبوو، هەندێکیان لە فەلسەفەی هیندی و هەندێکیان لە فەلسەفەی گریکی و یۆنانی، بەتایبەتی لەو کاتەی خەلیفەکانی موسڵمانان گرنگیان بە وەرگێڕان داو گەلێ کتێب و کولتووری ئەو میللەتە کۆنانەیان وەرگێڕا، بە جۆرێك کە خەلیفە مەئمون هەر کە بەسەر میشیلی سێیەمی ئیمپراتۆری بێزەنتی سەرکەوت پارەو باجی لەسەر دانەنا، بەڵکو لەسەری کرد هەرچی دەستنووسی بێزەنتی کۆنی لایە بیداتێ.

ئەو لقانەی دەهاتنە ناو روباری ئیسلام هەمویان رون نەبوون، بۆیە ئەو روبارە بە درێژایی ڕۆژگار، هەر کە لەو ولاتانە دەرۆیشت ئاوەکەی لێڵ دەبوو، بەڵام خوای گەورە چەند ئیستگەیەکی پالاوتنی بۆ ئامادەکرد، کە ناو بە ناو پاکی دەکردەوەو دەیگێڕایەوە سەر رونیی جارانی. ئەمەش ئاماژە بەو فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ دەکا، کە ئەبو هورەیرە لێی دەگێڕێتەوە: ((**إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا**: خوای گەورە بۆ هەر سەرە سەدەیەك، یەکێك بۆ ئەم ئوممەتە دەنێرێ، تا دینەکەیان بۆ تازە بکاتەوە.))[1]

ئەو فەلسەفانەی هاتنە ناو ئیسلام هەندێکیان شکۆمەندی بەگیان دەدا لەسەر حسێبی لەش و هەندێکیشیان شکۆمەندی بەلەش دەدا لەسەر حسێبی گیان، هەندێکی تریشیان مەزنی بەهۆش و ژیر دەدا، تەنیا دان بەو و بەحوکمەکانی دادەنێ، ئیسلامیش لەمانە هەمووی بەرییە، چونکە هەر یەکێ لەمانە مافی خۆی دەداتێ.

هەندێ لە بیریارە موسڵمانەکانی وەکو: واصیلی کوڕی عەتاء، عەمری کوڕی

---

١ ئەبو داود گێڕاویەتیەوە؛ جامع الاصول، ج ١١، ص ٣٢٠.

عوبێد و نیزام و عەللاف و هەندێکی تر بە فەلسەفەی یۆنانی کاریگەر بوون کە مرۆڤ ئەوپەڕی سەربەستی لە کردەوەکانیدا هەیە و بڕوایان بە قەزاو قەدەر نەدەکرد، واصیل لەحەسەنی بەصریی مامۆستای جودا بوویەوە، چونکە لەگەڵ بیروباوەڕەکانی واصیل نەبوو، بۆیە خۆی و گروپەکەی ناویان لێنرا (موعتەزیلە) و ڕێبازەکەیان لەسەردەمی مەئمون و موعتەصەم و واسیق بووە ڕێبازی ڕەسمیی دەوڵەت، بەڵام هێرشەکەیان لەلایەن ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە شکێنرا و دوای ئەمە ئەبو حەسەنی ئەشعەری (٢٦٠-٣٢٤ك) بەتەواوی لەناوی بردن.

لە بەرامبەر موعتەزیلە گروپی جەبرییەکان لەسەر دەستی جوهمی کوڕی صەفوان پەیدا بوو، بۆیە پێیان گوترا (الجهيمية)، ئەوانە لەو باوەڕەن کە مرۆڤ هیچ سەربەستییەکی نییە، وەکو پەڕێکی هەڵواسراوە لە هەوا و با بەویستی خۆی دەیجوڵێنێ.

هەروەها گروپی (مرجئة) لەسەر دەستی یونس کوڕی عەونی نومێری پەیدا بوو، بۆیە پێشیان دەگوترێ (یونســـية)، غەسانی کوفی و عوبێدی موکتەئیب لە سەرکردەکانیانن و یەکێ لە گوتەکانیان ئەمەیە: ((لا تضر مع الايمان معصية، كما لا تنفع مع الكفر طاعة: گوناه زیان بە بڕوا ناگەیەنێ، هەروەك خواپەرستی لەگەڵ کوفر سوود ناگەیەنێ.)).

سەرەڕای ئەمانە گروپی شیعە کە لەسەردەمی ئیمامی عەلیی کوڕی ئەبوتالیبﷺ پەیدابوو، ئەمەش چەند لقێکی لێ بویەوە وەکو: قەڕامتە و ئیسماعیلییە و گروپی (اخـــوان الصفـــا)، ئەبو حەییان التوحیدی لە کتێبەکەی (الامتناع والمؤانسة) باسی ئەم گروپەی (اخـــوان الصفـــا)ی کردووە، ئەمانە لەو بڕوایەن، کە هەر کاتێ فەلسەفەی یۆنانی تێکەڵی شەریعەتی ئیسلامی بکرێ شەریعەتەکە تەواو دەبێت، ئەم گروپە لەناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی پەیدابوو.

پەیدابونی ئەم گروپە جۆربەجۆرانە وای لە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە کرد، کە خۆیان بە فەلسەفە و زانستی ژیری چەکدار بکەن، بۆ بەرگریکردن لە

ڕێبازەکەیان، بەم جۆرە زانستی کەلام پەیدا بوو، ئەبو حەسەنی ئەشعەری (٢٦٠-٣٢٤ ك) دیارترین هەڵگری ئاڵاکەی بوو، ئەم زانایە لەسەرەتادا یەکێ بوو لە موعتەزیلەکان و لەسەر ڕێبازی (ابو علي الجبـلئي)ی مامۆستای بوو، دوایی وازی لێیان هێناو گەڕایەوە سەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە و هێرشی کردە سەر موعتەزیلەکان و بەڵگەو بۆچونەکانیانی پوچەڵ کردەوە و ڕێبازەکەیانی لەناوبرد.

دوای ڕزگارکردنی وڵاتی شام و عیراق و ئێران و ئەودیو روبار و سند و میصر و سەروی ئەفریقیا، هەندێ کاروبار سەریان هەڵدا، کە زانایەکان نەیانتوانی بەپێی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ چارەسەریان بکەن، بۆیە بەخێرایی چەند حوکمێکیان لە قورئان و فەرمووده و گوتەی یاران و کردەوەکانیان هەڵهێنجا، ئینجا بەرەو قیاس و ڕا ڕۆشتن، بەمجۆرە ڕێبازە فیقهیەکان پەیدابوون و لە یەکتری جودابوونەوە، وەکو: ڕێبازی ئەبو حەنیفە و مالیك و شافیعی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و سوفیانی سەوری و ئەبی سەور و ئەوزاعی و لەیسی کوڕی سەعد و کەسانیتر، دوای ئەمە موسڵمانەکان لەسەر ئەم چوار ڕێبازە ڕێك کەوتن: حەنەفی و مالیکی و شافیعی و حەنبەلی، ڕێبازەکانی تریش پشتگوێ خران، بەم چوار ڕێبازە گوترا: ڕێبازەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە، ئەم ڕێبازانە هەموو دژی گروپە گومڕاکان وەستان بەتایبەتی موعتەزیلەکان، دوای کزبونی دەوڵەتی ئیسلامی ئەم ڕێبازانە لەلایێ کەوتنە ناو یەکتری و لەلایەکی تر لەگەڵ شیعە کەوتنە کێشە. لە (٤٠٨ ك) کێشەیێ لە نێوان ئەهلی سوننەت و خەڵکی گەڕەکی کەرخی شیعی پەیدابوو، هەروەها لە ساڵانی (٤٣٣، ٤٤٤، ٤٤٥)ی کۆچیدا.[١] لەساڵی (٤٦١ ك) کێشەیێ لەشاری دیمەشق لەنێوان ڕۆژئاواییەکان (أصحاب الفاطميين) و ڕۆژهەڵاتییەکان (أصحاب العباسيين) پەیدا بوو، تا گەیشتە ئەو رادەیەی بە ئاگر ماڵی یەکتری بسووتێنن، ئەمەش بووە هۆی سوتانی مزگەفتی ئەمەوی لە دیمەشق.[٢]

لەساڵی ٣٢٣ ك حەنبەلییەکان هێرشیان کردە سەر حەنەفییەکان و دەستیان بە

---

١ سلاجقة ايران والعراق للدكتور عبد المنعم حسين، ص ١٧٥.

٢ الكامل لأبن الاثير، ج ١٠، ص ٥٩.

شکان و سوتان و تالان کرد تا خەلیفە رازی (٣٢٢- ٣٢٩ ك) ناچار بوو بەیانێ دەر بکا و هەڕەشەی کوشتنیان لێ بکا، هەروەها لە ٣٢٧ ك کێشە کەوتە نێوان حەنبەلییەکان و حەنەفییەکان، چونکە لەسەر واتای ئایەتی (٧٩) لەسورەتی ئیسراء رێك نەکەوتن.

﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا : بەشەو لەخەو هەستە و نوێژی سوننەت بکە هەندێ لایان وایە نوێژی شەو لەسەر ئەو واجب بووە تا پەروەردگارت بتگەیێنێتە پلەیەکی بەرزی پەسند کراو.﴾

لەسالانی ٤٦٩، ٤٧٠، ٤٧٥، ٤٧٨، ٤٩٥ گەلێ کێشەو هەرا لەنێوان حەنبەلییەکان و ئەشعەرییەکان لە بەغدا روویدا.

هەر کە ئەبو حەسەنی ئەشعەری لە ٣٢٤ ك وەفاتی کرد، یارانی ناچار بوون کە شوێنی گۆڕەکەی لە حەنبەلییەکان بشارنەوە لەترسی دەرهێنانی، چونکە حەنبەلییەکان لەو بڕوایە بوون کە ئەشعەری لەگەڵ موعتەزیلە دژیان دەوەستێ. لە (٤٤٧ ك) شافیعیەکان و حەنبەلییەکان بەهۆی جیاڕایی(اختلاف)یان لەسەر بە ئاشکرا خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحيم) لە نوێژدا هێرشیان کردە سەر یەکتر و لەیەکتریان کوشت و تالانی یەکترییان کرد، شافیعیەکان رایان وابو بەئاشکرا بخوێندرێ، بەلام حەنبەلییەکان لەگەڵ ئەمە نەبوون.[1]

لە (٥٤٦ ك) لە مزگەفتی مەنصوری شاری بەغدا ئاژاوەیەکی گەورە کەوتە نێوان حەنبەلییەکان و شافیعیەکان. ئەمانە هەمووی بەڵگەی خۆپەرستیی هەندێ لە زانایانی ئەهلی سوننەت و نەزانیی خەڵکی رەمەکیی ئەو سەردەمەن.

* * *

لەم رەوشە تووش و پیسەی کە پڕ بوو لە ئاژاوەی رامیاری و سەربازی و کۆمەلایەتی و فیکریی، لەگەڵ ئەمەی رۆشنبیری لە لوتکە دابوو، شێخ عبدالقادری گەیلانی -رەحمەتی خوای لێبێ- لەدایکبوو.

---

١ الشيخ عبد القدر الكيلاني لمحمد العيني، استاذ جامعة استنبول سابقاً، النسخة الفرنسية، ص ٢٦.

# بەشی یەکەم

# لەدایك بوون و پێگەیشتنی شێخ عبدالقادر

مێژوونووسە کۆن و نوێیەکان لەسەر ئەوەن، کە شێخ عبدالقادری گەیلانی-رەحمەتی خوای لێ بێ- لەساڵی (٥٦١ ك) وەفاتی کردووە، بەڵام لە مێژووی لەدایکبوونی ڕایان جیایە، زۆربەیان دەڵێن لە (٤٧١ ك) لەدایك بووە، هەندێکیان دەڵێن لە (٤٩١ ك) لەدایك بووە، ئیمام شێخ حوسێن کوڕی محمدی دیاربەکری لە کتێبی (تأريخ الخميس في احوال أنفس نفيس)[١]دا دەڵێ: لەساڵی (٥٦١ ك) شێخی سەردەم ئەبو محمد عبدالقادر کوڕی صالحی گەیلانی ئامۆژگاریکەری فتوادەری ڕێباز حەنبەلیی زاهید لە نەوەت ساڵی وەفاتیکرد، واتا: لە (٤٧١ ك) لە دایکبووە.

ابن الجوزی لە کتێبی (المنظم)[٢] دەڵێ: شێخ عبدالقادری گەیلانی-رەحمەتی خوای لێ بێ- شەوی شەممەی هەشتی رەبیعی کۆتاییی ساڵی (٥٦١ ك) لە نەوەت ساڵیدا وەفاتی کرد، واتا: لە (٤٧١ ك) لە دایکبووە. هەروەها ابن الاثير لە کتێبەکەی (الكامل)[٣]دا هەمان شت دەڵێت.

زەهەبی لە کتێبەکەی (العبر في خبر من غبر)[٤]دا دەڵێت: شێخ عبدالقادری گەیلانی زاهیدی شێخی سەردەم و پێشڕەوی خواناسان لەساڵی (٤٧٠ ك) لە گەیلان لەدایکبووە.

---

١ (٢ / ٣٦٦)

٢ (١٠ / ٢١٩)

٣ (٩ / ٩٤)

٤ (٤ / ١٧٥)

هەروەها زەهەبی لەکتێبەکەی (سیر اعلام النبلاء)[1]دا دەڵێ: ابن نجار (محب الدین بن النجار) لە مێژووەکەیدا دەڵێ: شێخ عبدالقادر لەساڵی ٤٨٨ ك هاتۆتە بەغدا و نەوەت ساڵ ژیاوە (لە کتێبی-مرآة الزمان- ٩٢ ساڵ)، لە دەیەمی رەبیعی کۆتایی ساڵی ٥٦١ك وەفاتی کردووە.

شێخی ئیمام جمال الدین، کە بە (ابن الصابونی) ناسراوە لە کتێبەکەی (تکملة اکمال الاکمال في الانساب و الاسماء والالقاب) گوتوویەتی: (محب الدین النجار) لە مێژوویەکەیدا گوتوویەتی: عبدالقادری کوڕی ئەبی سالح کوڕی جەنگی دۆست خەڵکی گەیلانەو لە ساڵی (٤٨٨ ك) لە تەمەنی هەژدە ساڵی هاتۆتە بەغدا، لە (٤٧١ك) لە دایکبووە و لە شەوی شەممەی دەیەمی رەبیعی یەکەمی ساڵی (٥٦١ك) لە بەغدا وەفاتی کردووە.

بەڵام محەممەد کوڕی شاکری کوتوبی خاوەنی کتێبی (فوات الوافیات) دەڵێ: شێخ شمس الدین گوتوویەتی: عبدالقادری کوڕی ئەبی سالحی کوڕی جەنگی دۆست لە ساڵی (٤٩١ك) لەگەیلان لە دایکبووە و لەساڵی (٥٦١ك) لە بەغدا وەفاتی کردووە.

لەکتێبی (الذیل علی طبقات الحنابلة)ی ئیبن رەجەب لەسەر لە ژێر ژمارەی (١٣٤) هاتووە کە: عبدالقادر کوڕی ئەبی سالح شێخی سەردەم و پێشڕەوی خواناسان لە (٤٩٠ك) یان ساڵی (٤٩١ك) لە دایکبووە.

بەڵام مێژوونووسە نوێیەکانی وەکو: ساغکەرەوەی کتێبی (الفتح الرباني للشیخ عبدالقادر) لەسەر ئەوەن کە لە ساڵی (٤٧٠ك-١٠٧٧ز) لە دایکبووە و لە ساڵی (٥٦١ك-١١٦٥ز) وەفاتی کردووە، هەروەها (ابوالحسن علی الحسنی الندوی) لە کتێبی (رجال الفکر والدعوة في الاسلام) هەمان ڕای هەیە.

---

١ (٢٠ / ٤٤٣)

مامۆستا فەخری نورسی گەیلانی لە کتێبەکەی (الموجز في تأريخ القطب الغوث و الباز الاشهب الشيخ محي الدين عبدالقادر الكيلانی)دا دەڵێت: شێخ عبدالقادر لە یەکێ لە شارەکانی گەیلان (نیف) لە ساڵی (٤٧٠ ك-١٠٧٧ ز) لە دایکبووە.

دکتۆر ماجید هورسان گەیلانی لەکتێبەکەی (هکذا ظهر جيل صلاح الدين)دا دەڵێ: شێخ عبدالقادر لە ساڵی (٤٧٠ ك-١٠٧٧ز) لە گەیلان لە دایکبووە و لە (٤٨٨ ك-١٠٩٥ز) لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا هاتۆتە بەغدا و لەوێ ماوەتەوە تا مردنی لە ساڵی (٥٦١ ك).

شێخ یونس شێخ ئیبراهیمی سامەڕایی لە کتێبەکەی (الشيخ عبدالقادر الكيلاني قدس الله سرّه)دا دەڵێت: شێخ عبدالقادری گەیلانی لە (٤٧٠ك-١٠٧٧ز) لە دایکبووە و لەشەوی شەممەی هەشتەمینی مانگی ڕەبیعی دواییی ساڵی (٥٦١ك-١١٦٥ز) لە بەغدا وەفاتیکردووە.

بەڵام مەوسوعەی (اللاروس)ی فەرەنسی دەڵێ: لە ١٠٧٧ز لەدایکبووە و لەساڵی ١١٦٦ز وەفاتیکردووە.

مامۆستا محمد العيني-مامۆستای پێشووی زانکۆی ئەستەنبوڵ- لە کتێبەکەی (الشيخ عبدالقادر الگيلانی)ی نوسخەی فەڕەنسییە کە لە لاپەڕە (٣٢)دا دەڵێت: لە کتێبی (نتيجة التحقيق)دا هاتووە کە شێخ عبدالقادر لە یەکێ لە شارە بچووکەکانی گەیلان (نیف NIFF) لە ساڵی (٤٧٠ك-١٠٧٧ز) لەدایکبووە، هەندێکیشیان دەڵێن: لە ساڵی (٤٧١ك)، شێخ عبدالقادر بە موریدەکانی دەڵێ کە لە تەمەنی هەژدە ساڵێدا هاتۆتە بەغدا لەو ساڵەی، کە (ابو الفضل عبدالواحد التميمي)ی تێدا مردووە، ئەمەش بە پێی مێژووی (ابن كثير) لە ساڵی (٤٨٨ك) بووە لە سەردەمی (المستظهر بالله)ی خەلیفەی عەباسی.

بەهەرحاڵ، ڕەنگە بۆچونەکەی (ابن الجوزی) ڕاستترین بۆچون بێ لە کتێبی

(المنتظم)، چونکە (ابن الجوزی) یەکێك بووە لە هاوچەرخەکانی شێخ عبدالقادر، کە دەڵێ: لەساڵی (٥٦١ك) وەفاتیکردووە و تەمەنی نەوەت ساڵ بووە.

## ڕەچەڵەکی:

لە بارەی ڕەچەلەکی شێخ عبدالقادری گەیلانی چەند جیاوازییەکی کەم بەر چاو دەکەوێ، هەندێ ڕەچەڵەکی دەبەنەوە سەر حەسەنی کوڕی عەلی‌ﷺ، هەندێکی کەمیان دەیباتەوە سەر حوسێنی کوڕی عەلی‌ﷺ، بە هەر حاڵ ڕەچەڵەکەکەی دەچێتەوە سەر عەلی کوڕی ئەبو تالیب و فاتیمەی زەهرا ﷺ.[١]

ئیبن ڕەجەب (٧٣٦-٧٩٥ك): (زين الدين ابو الفرج عبدالرحمن بن شهاب الدين أحمد البغداي ثم الديمشقي) لە کتێبی (الذيل على طبقات الحنابلة)دا دەڵێ: شێخ عبدالقادری کوڕی ئەبی ساڵحی کوڕی عبداللّٰهی کوڕی جەنگی[٢] دۆستی کوڕی ئەبی عبداللّٰهی کوڕی عبداللّٰهیە و ڕەچەڵەکەکەی دەگاتەوە سەر حەسەنی کوڕی عەلی‌ﷺ، بەڵام (محب الدين النجلر) لە مێژووەکەیدا دەڵێت: عبدالقادری کوڕی ئەبی ساڵحی کوڕی جەنگی دۆستە و ڕەچەڵەکی دەگاتەوە حەسەن‌ﷺ.

مامۆستا مستەفا جەواد لە پەراوێزەکەی لە سەر کتێبی (تكملة اكمال الاكمال في الأنساب والأسماء و الألقاب) هەروەها سەفەدی لە (الوافي بالوافيات) دا دەڵێت: عبدالقادری کوڕی عبداللّٰهی ئەبی ساڵحی کوڕی جەنگی دۆستە و ڕەچەڵەکی بۆ

---

١ لە زنجیرە خەتمێکی نەقشبەندییەکان، کە بە عەرەبی نووسراوە، شێخ عبدالقادری گەیلانی بە کورد دادەنێ ((..... الشيخ حضرة سيد عبدالقادر الكيلاني الكردي....)) ژیناوەری زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامی، شەپۆل ل ١٥٣ .. ئەمەش ڕێی تێدەچێ چونکە شێخ کاتی خۆی بە کوردستاندا ڕەتبووە بۆ بەغدا و لە گوندی نەرگسەجاڕ لایداوە. بنەماڵەی زانیاران، مەلا عبدالکەریمی مودەڕیس، ل ٣١ (وەرگێڕ)

٢ وشەیەکی فارسییە بە واتای جەنگ خواز یان موجاهید دێت (كتاب القطب الغوث للاستاذ فخري الكيلاني ) یا بە واتای قەدر گەورەدێ (معجم الشيوخ ١/٥٢).

حەسەنی کوڕی عەلی‌ﷺ دەگەڕێتەوە. کەمال الدین عبدالرزاق کوڕی فوتی لە (تلخیص معجم الالقاب)دا گوتوویەتی: محی‌الدین ئەبو محمد عبدالقادر بن ئەبی سالح کوڕی جەنگی دۆستە، لە ڕەچەڵەکدا سەر بە کوڕەکانی حەسەنی کوڕی عەلییەﷺ.

لە کتێبەکەی سدیق حەسەن خانی قەنوجی کە بە ناوی (التاج المکلل من جواهر مآثر الطراز الآخر والأول)ـە نووسراوە: عبدالقادر کوڕی ئەبی سالحی موسای کوڕی جەنگی دۆستە و بنەچەی دەگەڕێتەوە سەر حوسێنی کوڕی عەلیﷺ.[1]

لە کتێبی (فوات الوافیات)ی محمدی کوڕی شاکری کوتوبی کە لە (٧٦٤ك) مردووە، دەڵێ: عبدالقادری کوڕی سالحی کوڕی جەنگی دۆستە و بنەچەی بۆ حوسێنی کوڕی عەلیﷺ دەگەڕێتەوە.

لە کتێبەکەی مامۆستا خیرالدین زەرکەلی (الاعلام) هاتووە: عبدالقادری کوڕی موسای کوڕی عبداللّٰهی کوڕی جەنگی دۆستی حەسەنییە.[2]

لەکتێبەکەی محمد العینی (عبدالقادر الکیلانی)[3] دەڵێت: ئەبو محمد عبدالقادری کوڕی ئەبی سالحی جەنگی دۆستی موسای کوڕی ئەبی عبداللّٰهی کوڕی یەحیای زاهیدی کوڕی محمدی کوڕی داودی کوڕی موسای کوڕی عبداللّٰهی کوڕی موسای ئەلجون کوڕی عبداللّٰهی ئەلمەحز کوڕی حەسەنی موسەننای کوڕی حەسەنی کوڕی عەلیی کوڕی ئەبی تالیبەﷺ، دایکیشی فاتیمەی کچی عبداللّٰهی سەومەعییە. شێخ عبدالقادر لە کتێبەکەی (فتوح الغیب) ڕەچەڵەکی دایکی بۆ حوسێنی کوڕی عەلیﷺ دەگێڕتەوە.

زانای فەرەزان (علی القاری) لە کتێبەکەی (نزهة الخاطر) بنەچەی شێخ

---

١ ل ١٦٦.　　٢ ل ٤ / ٤٧.　　٣ ل ٣٢ لە دانە فەرەنسییەکە.

عبدالقادر دەباتەوە سەر حەسەنی کوڕی عەلی‌ﷺ. شێخ یوونسی سامەڕایی لە کتێبی (الشيخ عبد القادر الكيلاني)دا لە بارەی بنەچەی دایکی شێخ، دەڵێت: دایکی ام الخير كچی جبار فاتیمەی كچی سەید عبداللهی سەومەعی زاهید، کوڕی ئیمام ئەبی جمال الدين سەید محمد کوڕی ئیمام سەید محمودە کوڕی ئیمام ئەبیل عەتاء عبداللهی کوڕی ئیمام کمال‌الدین عیسا کوڕی ئیمام سەید ئەبی عەلائەددین محمد الجواد کوڕی عەلی ئەلڕەزا کوڕی ئیمام موسا کازم کوڕی ئیمام جەعفەری سادقی کوڕی محمدی باقری کوڕی ئیمام عەلیی زەینول عابدینی کوڕی ئیمام حوسێنی کوڕی عەلی ئەبی تالیبە، ڕەزای خوا لەسەر هەموان بێ.

شێخ عبدالقادر حەزی نەدەکرد باسی ڕەچەڵەکی خۆی بکات یاخود شانازیی پێوە بکا،هەروەها بەمنداڵەکانیشی رادەگەیاند کە شانازی بە ڕەچەڵەکی خۆیان نەکەن، ئەمەش لەبەر خاسکاری و بێ‌فیزیی شێخ و جێبەجێکردنی ئەم گوتەیەی پێغەمبەرﷺ بوو کە فەرموویەتی: ((**مَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ**: ئەوەی کردەوەی چاکەی کەم بێت ڕەچەڵەك و باب و باپیری بە کەڵکی نایەت)).[1] هەر لەم بارەیەوە نەوەی شێخ عبدالقادر، کە عمادالدین نصر کوڕی عبدالرزاق کوڕی عبدالقادرە دەڵێت:

ئێمە لە ڕۆڵەکانی چاترینی دوو حەسەنین
ئەوەی کە دوو تاقمە موسڵمانی پێك هێنا
بنەچەمان لە سەرێ، بە هەڵبژێردراو[2] دەچێ
لای خوارێشی ئەوا بە، حەزرەتی حوسێن دەچێ
باوکمان کە بنەچەی بە نهێنی هێشتۆتەوە
وا گوتوویەتی کەوا هەژاری جوانییە[3]

ئەو لێرەدا دەیسەلمێنێ، کە ڕەچەڵەکیان بۆ حەسەن دەگەڕێتەوە نەك بۆ

---

١ كتاب جامع الاصول، ج ٦، ص ٥٦٢.
٢ مەبەست (محمد) ەﷺ( وەرگێر).
٣ كتاب تكملة إكمال الاكمال لآبن الصابوني، ص ٣٥٩.

شێخ یونسی سامەڕایی ڕای وایە، کە شێخ عبدالقادر لـە ڕەچەڵـەکدا پـەیوەندیی بە ئەبوبەکری سدیق و عومەری کوڕی خەتاب هەیە، لـەم بارەیـەوە دەڵـێ: داپیرەی شێخ عبدالقـادر (دایکـی بـاوکی) نـاوی: ئـوم سـەلەمەیە و لـە نـەوەی عبدالرحمنـی کوڕی ئەبو بەکری سدیقە، دایکی عبداللّٰەی مەحز، کە یەکێکە لـە باپیرەکـانی شـێخ عبدالقادر ناوی (حفصة)ی کچی عبداللّٰەی کوڕی عومەری کوڕی خەتابە‌ﷺ.

## منداڵیەکەی:

شێخ عبدالقادر لە شـارێکی بچوکـی هـەرێمی گـەیلان، کـە دەکەوێتـە بـاکوری ئێران و باشوری، دەریای قەزوین لە (نیف Niff)[1] لە دایك بووە، ئـەم ناوچەیـە زۆر بە پیتە و ڕووباری زۆرە و باراناوییە.

وا دیارە شێخ عبدالقادر دوا منداڵی باوکێتی و بە هەتیوی ژیـاوە و دوای بوونـی بە کەمێك باوکی مردووە، بۆیە لای باپیری (باوکی دایکی) عبـــداللّٰەی سـەومەعی، دوامنداڵی دایکێتی و کەمێ پێش تەمەنی شەست ساڵیدا بـەزگی کـەوتووە و ژنـانی قورەیش-چونکە دەڵێن ڕەچەڵەکی قورەیشییە- بەمجۆرە سکبوونە بەناو بانگن،[2] ئەم بۆچوونـە چ بەڵگەیـەکی نییـە، چونکـە خـەڵکی ئـەو سـەردەمە هێنـدە گرنگییـان بـە تۆمارکردنی تەمەنی پیاوان نەداوە، تـا بـە ژنـانی بـدەن، پێشـتر بینیمـان چۆن لەسـەر مێژووی لە دایکبوونی شێخ عبدالقادر جیاوازییان هەبوو، لە نێوان ساڵی (٤٧٠ك) و ساڵی (٤٩٠ك)دابوو، بە هەر حاڵ ئەمـە بەڵگـەی ئەوەیـە، کـە دوا منداڵـی دایکـی بووە، شێخ تەنیا برایەکی هەبووە، چونکە هەرکە خۆی بۆ بەغدا ئامادە کـرد دایکـی هەر سامانێکی هەبوو لـە نێوان ئەوو برایەکەی دابەشکرد، ئیبن عیمادی حەنبـەلی لـە

---

١ یاقوتی حەمەوی لە (معجم البلدان) دا دەڵێ: لە شاری بەشتیر لە دایکبووە.

٢ قلائد الجواهر، ص ٣.

(شذرات الذهب)دا دەڵێ: برایەکەی ناوی عبداللە بوو و لە شێخ گچکەتر بوو، پیاوێکی چاك بوو، لەگەیلان ژیاو بە گەنجێتی لەوێ مرد.[1] بەڵام دایکی چۆن ئەم منداڵەی بوو ئەگەر راست بێ، کە عبدالقادری لە شەست ساڵی بووە؟! بۆیە لەو بڕوایە دام، کە عبداللە لەو گەورەتر بووە.

دایکی ژنێکی چاکی لە خواترس بووە و لە پشتی چەند ئیمامێکی پاکەوە هاتووە، عبـــداللەی سەومەعی باپیرەی زاهید و خواپەرست بووە و ناویان لێناوە (صومعي)، باوکی پیاوێکی چاك بووە و دایك و باپیریشی هەر لە چاکان بوون، بۆیە باپیری لەسەر لەخواترسان و چاکە و ئاکاری چاك بە خێوی کردووە و بە خواپەرستی و چاکی و لە خواترسان گەورە بووە و زاهید بووە لە دنیا و روو لە رۆژی دوایی بووە، زۆر حەزی لە زانینی بنەماو لقەکانی شەریعەت بووە.

شێخ لە ناوچەی گەیلان تینوێتیی بە زانایانی زانستەکانی شەریعەت نەدەشکا، بۆیە زۆر جاران لە دڵی خۆی بیری لەوە دەکردەوە، کە بچێتە بەغدا کە لەو کاتەدا پایتەختی جیهان بوو. لەو سەر دەمەدا خەڵکی گەیلان لەسەر ڕێبازی حەنبەلی بوون،[2] دوای ئەو سەرکەوتنە مەزنەی کە لە سەر دەستی ئاڵاهەڵگری ڕێبازەکە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هاتە دی و ناوی لە وڵاتدا بڵاو بوویەوە و چووە ناخی دڵانەوە. لەبەر ئەوەی شاری بەغدا شوێنی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی خۆشەویستی خەڵکی گەیلان بوو، بۆیە شێخ زیاتر غەریبیی بۆ هەستا.

هەندێ لە نووسەران باسی هەندێ حاڵەتی شێخیان کردووە و لە تافی منداڵی و گەنجێتیی و بە کەرامەتیان[3] لە قەڵەم داوە، ئەمەش بەرزی و شکۆمەندی شێخ زیاد ناکەن و نەبوونیشی هیچ کەمییەك ناگەیەنێ، کەرامەتی گەورە ئەوەیە سوودی بۆ بڕوا و میللەت هەبێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ بە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی گوت:

---

١ ٤ / ١٩٩.

٢ کتێبی عبدالقادری گەیلانی، مامۆستا محەممەد عەینی، دانە فەرەنسییەکە، ل ٣٦.

٣ کرامات: کۆی کەرامەتە پێشبینی کارێکی لە رادە بەدەرە و لەگەڵ داوای پێغەمبەریتی بەراورد ناکرێ لە سەر دەستی پیاوێکی باوەڕدار ڕوودەدا.

((فَوَاللهِ لأَنْ يَهْدِيَ اللّٰهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِدًا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ:
سوێند بەپەروەردگار ئەگەر خوا لە سەر دەستی تۆ تاکە پیاوێ بێنێتە سەر ڕێی ڕاست بۆ تۆ لە سورە حوشتران چاترە))[1].

کە دەڵێین شێخ لە مانگی ڕەمەزان لە دایکبووەو بەڕۆژ مەمکی دایکی نەگرتووە چ گرنگی و سودێکی نییە، ئێمە هەر ئەوەندەی وەردەگرین، کە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٧٠ ك لە دایکبووە.

هەروەها کە گا لەکێڵگە قسەی لەگەڵ دەکات و پێی دەڵێ: تۆ بۆ جوتیاری نەخولقێنراوی، ئەمەش هێندە گرنگ نییە،[2] بەڵکو ئەمەی لێ وەردەگرین، کە لە گەیلان پارچە زەوەکیان هەبووە و خەریکی کشتوکاڵ بووە و گا و مانگایان هەبووە و خۆی بەخێویانی کردووە و زەویی پێ کێڵاون. بەڵام جارجار لە دڵی خۆیەوە دەیگوت: ئەم کارە بۆ ئەو ناشێ و ئارەزووی فێربوونی شەریعەتی دانامرکێنێ، لە کۆتاییدا نهێنی دڵی بە دایکی گوت و دایکیشی زوێر بوو و تا خوا حەز بکا گریا، چونکە هەستی بەوە کرد، ئەگەر کوڕەکەی بچێتە بەغدا جارێکی تر نایبینێتەوە، لە ئەنجامدا سەری بۆ ویستی کوڕەکەی دانەواند و هیوا و ئاواتەکانی کردە قۆچی قوربانیی ئاواتەکانی کوڕەکەی، پێی لە خەونەکانی خۆی نا لە پێناو خەونەکانی کوڕەکەی، ئەمەش هەردەم خوی دایکە، کە قوربانی دانە بۆ منداڵەکانی. لە بەر ئەوەی خانەوادەکەی شێخ دەست ڕۆیشتوو نەبوون و کشتوکاڵەکەیان هەر بەشی نانەسکێی دەکرد و بەغداش لەو سەردەمە پایتەختی جیهان بوو و نرخی شتی لێ گران بوو، شێخیش لە گەیلان لەسەر شتی هەرزان ڕاهاتووەو چۆن پێی بکرێ لە بەغدا بەم شێوەیە بژیت، بەغدا هەروەکو شاعیر دەڵێت:

---

١ بوخاری گێڕاویتیەوە، کتێبی (المغازي) ژمارە/ ٤٢١٠.

٢ قلائد الجواهر، ص ٣.

بـــەغدا شـــاریکی دیـــارو رووناکـــە
خـەرجکردن لێـی زەحمـــەت و تەنگـە
ئەگـــەر قـــاروونیش بچێتـــە نـــاوی
خـێری پـێ دەشـێ و حالـــەتی لەنگـە

بەڵام خـواردن و پۆشـاك و مـاڵ و سـامانی دنیـا بـۆ شـێخ هیـچ گرنگیـەكی نییـە، هـەموو ئـاواتی ئەوەیـە لـە كـۆڕی شـێخ و زانایـانی بـەغدا دابنیشـێ و فـێرو تـێر زانستەكانیان ببێـت و ئـارەزووی تینـووی دابمركێنێتـەوە و ئـەو خـەون و هیوایانـەی بێنێتە دی كە ختۆكەی دەدا.

# بەشی دووەم

## گەشتەکەی بۆ بەغدا و یەکەم تاقیکردنەوەی

دایکی هەرکە کەلوپەلی سەفەری بۆ کوڕەکەی ئامادە دەکرد هەناسەی هەڵکێشاو فرمێسکی داباراند، چونکە بە دڵنیاییەوە دەیزانی ئەمە جیابوونەوەی کۆتاییە، بەڵام چی بکا ئارەزووی کوڕەکەی لەسەر ئەوەبێ و ویستی خواش، کە گەڕانەوەی بۆ نییە لەسەر ئەوەی بێ، دوورنییە حیکمەتەکەی دوای کەمێك دەرکەوێت.

دایکی شێخ لەباوکی شێخەوە هەشتا دیناری بۆ بەجێمابوو، کە لە ماڵ و سامانی دنیا تەنیا ئەوەندەی هەبوو، ویستی هەمووی بداتە شێخ، بەڵام شێخ بەمە قایل نەبوو و تەنیا نیوەی بردو نیوەکەی تریشی بۆ براکەی بەجێهێشت، دایکی دینارەکانی خستە کیسەیەکەوە و خستیە بن هەنگلیەوە و دووریی بۆ ئەوەی لە چاوی دزو ڕێگران دوور بێت. چاوەڕوانی کاتی دەرچوونی کاروانەکە بوون لەگەیلانەوە بۆ بەغدا، ئیتر شێخی گچکە بەگەڵ کاروانەکە کەوت بێ ئەوەی هیچ شتێکی لەگەڵ خۆی بردبێ جگە لە نەفسێکی پڕ هاوتا و چل دینارەکەی ژێرهەنگڵی.

هەرکە دایکی کوڕەکەی بەڕێکرد ئامۆژگاریی کرد و پێی گوت: کوڕم نەکەی درۆبکەی، چونکە بڕوادار درۆناکا، کوڕم هەمیشە هەر ڕاستگۆبە، کوڕم هەر ڕاستگۆبە هەروەك پەروەردەم کردی، ئاواتم ئەمەیە لە تۆ.

کاروانەکە بەرەو شاری هەمەدان لەناوەڕاستی ئێران بەڕێ کەوت، هەر کە

گەیشتە ئەوێ چەند ڕۆژ پشوویان داو ئینجا بارگەیان تێکنا بۆ بەغدا لەساڵی ٤٨٨ ك، لە ڕێگادا شێخ تووشی یەکەم تاقیکردنەوەی بڕوا و ئاکار و ڕاستگۆیی خۆی بوو، لە تاقیکرنەوەکەدا زۆر سەرکەوتوانە دەرچوو، ئەمەش درێژەی تاقیکردنەوەکەیەتی:-

دوای ئەوەی کاروانەکە لە هەمەدان بەڕێکەوت و بەرە و بەغدا ڕۆیشت و بەشێکی ڕێگاکەیان بڕي، لەناکاو تووشی کۆمەڵێ دزو جەردە بوون و بەئەسپە تیژبەزەکانیان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی کاروانەکەیان داو داوای خۆ بەدەستەوە دانیان لێکردن.[1] کاروانچییەکان بەناچاری خۆیان دادەست و دزەکان یەکەیەکە هەموو بارو کاروانچیەکانیان پشکنی و ئەوەی سووك و بەنرخ بایە دەیان برد، شێخ دانیشتبوو و چاوەنواری پشکنین بوو، دزەکان، کە لە هەریەکێکیان دەپرسی چیت پێیە هەموویان دەیانگوت هیچمان پێ نییە، ئەوانیش دەیان پشکنین و چیان پێبوایە لێیان دەسەند، یەکێکیان گەیشتە شێخی گەنج و دیتی هێشتا مێردمنداڵە و ریشی تۆپ نەبووە، جل و بەرگێکی سادەی هەژارانەی لەبەردایە و بە بازرگانان ناچێت، ویستی لێی ڕەتبێ و بۆ لای یەکێکی تر بچێت، هەر لە ڕووەوە هەمان پرسیاری لێکرد، کە لە ئەوانی تری دەکرد، گوتی: چیت پێیە، لێی ڕەتبوو و سوڕ دەیزانی، کە وەڵامەکەی وەکو ئەوانیترە و دەڵێ: هیچم پێ نییە، بەڵام، کە شێخ وەڵامی دایەوە و گوتی: چل دینارم پێیە، دزەکە لە شوێنی خۆی ورتەیەکی لێوەهات و واقی وڕما لەم وەڵامە و بڕوای بە گوێی خۆی نەکرد، پرسیارەکەی دووبارە کردەوە و ئەویش دووبارە گوتی: بەڵێ چل دینارم پێیە، دزەکە وایزانی لاوەکە گاڵتەی پێ دەکا یا گاڵتەی لەگەڵ دەکا، دوای چەند گفتوگۆیەك بۆی دەرکەوت، کە لاوەکە ڕاست دەڵێ و زۆر سەری لەمە سوڕما و پێی گوت: لەگەڵم وەرە لای سەرۆکەکەمان. لەوێ سەرۆکی جەردەکان هەمان پرسیاری لێکردەوە، شێخیش هەمان وەڵامی دایەوە، چل دینارم لایە. پێی گوت: لە کوێیە ؟

---

[1] ئەوە لە خاکی (ربیك)ی نزیك هەمەدان ڕوویداوەو ژمارەی دزەکان شەست سوار بونە. قلائد الجواهر، ص٩.

لەبن هەنگڵی بۆی دەرهێنا، پیاوەکە سەری سوڕما، کە ژماردی سەیری کرد چل دینارە، بە شێخی لاوی گوت: تۆ بۆ دانت بەمەدا نا، خۆ لە جێگایەکی باشت شاردبۆوەو ئێمە لەو بڕوایە نەبووین، کە تۆ هیچت پێ بێ ؟ گوتی: چونکە دایکم پێی راسپاردم، کە هەرگیز درۆ نەکەم و ڕاست بڵێم، مرۆڤی بڕوادار درۆناکات، ئەم پیاوە لێی پرسیم: چیت پێیە؟ منیش درۆم لە گەڵی نەکرد. سەرۆکی جەردەکان، ئەم قسانە زۆر کاری تێکرد و چاوی مشت فرمێسك بوو، ئەو پیاوەی، کە لە ژیانی گریانی نەزانیوە، وا دیارە تۆزە بڕوایەکی تێداماوە، ئاوڕی لە شێخ دایەوە و پێی گوت: تۆ راسپاردەی دایکت دەپارێزی، ئەگەر چی هەموو سامانەکەشت لەکیس بچێت، ئێمەش چەندەها ساڵە ڕێگری دەکەین و ماڵ تاڵان دەکەین و خەڵکی دەتۆقێنین، بە خۆشمان دەڵێین موسڵمان، رۆڵە بەشایەد بە هەر لە ئێستاوە لەو هەموو کارانە تۆبەم کرد، بانگی هاوڕێیەکانی خۆی کردو ڕووداوی شێخی بۆ گێڕانەوە و ئەوانیش زۆر پێی کاریگەر بوون و لەگەڵ سەرۆکیان ڕێك کەوتن، کە تۆبە بکەن لە هەموو ئەو کارانەی کەدژی شەریعەتی خوایە. هەموو ئەو کەلوپەلانەی، کە لێیان ساند بوون بۆیان گێڕانەوە و کاروانەکە بە پاسەوانیکردنی ئەوان گەیشتە بەغدا، ئەمەش بە بەرەکەتی شێخی گچکە عبدالقادری گەیلانی بوو. ئایا ئەمە مەزنترین کەرامەتی ئەو نییە، ئایا لە نەگرتنی مەمکی دایکی لە ڕۆژی رەمەزان و قسەکردنی گا لەگەڵی چاکتر و سوودمەندتر نییە؟ ئەو بەم ڕووداوە چەند دڵێکی داخراوی کردەوە و چەند نەفسێکی مردووی زیندوو کردەوە، بەلای لەسەر میللەتی ئیسلام لابرد و بڕوای خستە دڵی هەندێ لەڕۆڵەکانی و پێغەمبەرﷺ لەم بارەیەوە فەرموویەتی ((**فَوَاللهِ لأَنْ يَهْدِيَ اللَّهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِدًا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ**)).[1]

ئەمە یەکەمین تاقیکردنەوە بوو بۆ شێخ، تاقیکردنەوەی هێزی ئیمانی لە خواترسانی و توانای کەسێتی و ویژدانی بوو، تاقیکردنەوەی سەرکەوتنی بوو بەسەر ئارەزوویدا، لە تاقیکردنەوەکەدا زۆر چاك سەرکەوت. ئەدگارەکانی

---

١ بوخاری گێراویەتیەوە، کتێبی (المغازي) / ٤٢١٠.

داهاتووی ئەو گەنجە تیشکی دەدایەوە و نیشانەی ئەوەبوون، کە لە دواڕۆژدا پلەوپایەی مەزنی دەبێت و سەدەها گاور و هاوبەشپەرست لەسەر دەستی دەبنە موسڵمان و هەزارەها تاوانبارو گوناهکاران تۆبە لەسەر دەستی دەکەن، ئەمە گەورەترین کەرامەتە، کە وەلییەك وەری بگرێ، ئەمە ڕێبازی پێغەمبەرانە.

کاروانەکە گەیشتە بەغدا، شێخ عبدالقادر لەساڵی ٤٨٨ ك گەیشتە بەغدا، لەو ساڵەوە کە ئەبو الفضل عبدالواحیدی تەمیمی وەفاتیکرد،[١] ئەو ساڵەیە، کە ئەبو حامیدی غەزالی وازی لە وانەگوتنەوە هێنا لە قوتابخانەی نیزامیە لە بەغدا و خووی دایە گۆشەگیری و بەرەو شام و حیجاز ڕۆیشت و براکەی ئەحمەدی غەزالی لە قوتابخانەی نیزامییە مایەوە، ئینجا بە فەرمانی سوڵتان بەرکیارق و وەزیرەکەی (فخر الملك بن نظام الملك)[٢] ئەبو عبداللّٰەی طبری لە قوتابخانەی نیزامییە مایەوە.

---

١ کتێبی (القطب الغوث) ی مامۆستا: فەخری گەیلانی، ل ٥.

٢ کتێبی (عبد القادر الكيلاني) ی مامۆستا: محەمەد ئەلعەیني، دانە فەرەنسییەکە، ل ٣٦.

# بەشی سێیەم

# شێخ عبدالقادر لە بەغدا

هەر کە شێخ عبدالقادر لە تەمەنی هەژدە ساڵی گەیشتە بەغدا لە ٤٨٨ ك، بـەغدا لەوپەڕی شکۆمەندی و هێز و فراوانی و دەوڵەمـەندی بـوو، هـەروەها لـە لووتکـەی پێشکەوتنی زانستی و رۆشنبیری بوو لەسەردەمی خەلیفە (المسـتظهر) کە لـە نێـوان (٤٨٧-٥١٢ك) فـەرمانڕەوایی کـرد، هـەروا لـە سـەردەمی بـەرکیارق کـوڕی مەلیکشای سولتانی سەلجوقیش، پێنج خەلیفە لە بەغدا هاوچەرخی شێخ عبدالقادر بوون، موستەزهەر و موستەرشـید لـە (٥١٢-٥٢٩ك) فـەرمانڕەواییان کـردووە، راشید لـە (٥٢٩-٥٣٠ك)، موقتەفی لـە (٥٣٠-٥٥٥ك)، موستەنجید لـە (٥٥٥-٥٥٦ك).

شێخ عبدالقادر حەفتاو سێ ساڵ لە بەغدا مایەوە لـە ساڵی (٤٨٨-٥٦١ك)، لـە سەردەمی ئەو گەلـێ ئاژاوە و شڵەژانی سەربازی و رامیـاری و رۆشـنبیری و فیقـهی روویـدا، خەلیفـەکانی عەباسـی تـەنیا ناویـان مابوویـەوە، فـەرمانڕەوایی ڕاسـتەقینە لەدەسـت سـوڵتانی سـەلجوقیەکان بـوو، ناخۆشـی و دووبـەرەکی کەوتـە نێوانیـان لـەدوای مردنـی مەلیکشـا لـە (٤٨٥ك)، جـەنگ کەوتـە نێـوان هـەردوو کوڕەکـەی مەلیکشا (بیرکیارق) و مەحمود، هەروەها لە نێوان (بیرکیـارق) و (تـەتش)ی مـامی، ئینجا لە نێوان (سنجەر)ی کـوڕی مەلیکشـا و برازایەکـەی مـەحمود کـوڕی محەممەد کوڕی مەلیکشا، ئینجا لە نێوان مەحمودو برایەکەی مەسعود، ئینجـا جـەنگ کەوتـە نێوان سوڵتانی موسـڵ و مەسعود و (المسترشـد بـالله)ی خەلیفـەی عەباسـی، جـەنگ لەسەر خەلیفە گەرم بـوو، خەلیفـە چاونـەترس و دوێنـەرێکی رەوان و خۆشەویستی

گشتی و تایبەت بوو، دوا خەلیفە بوو، کە دوێنەر بێت، بەڵام سوپاکەی بەرامبەر سوپای مەسعود لە ڕەمەزانی ساڵی (٥٢٩ک-١١٣٤ز) خۆی نەگرت و شکا، مەسعود خەلیفەی بە دیل گرت و لە سەربازگەکەی خۆی لە خیوەتێکی دانا و خەڵکی بەغدا شڵەژان بەهۆی دیلکردنی خەلیفە، تا (سنجەر) فەرمانی دایە مەسعودی برازای، کە ئازادی بکات، بەڵام یەکێ لە ئیسماعیلیەکان بوونی خەلیفەی لە ژێر خیوەت بەهەل زانی کە بێ پاسەوان بوو، لێی چووە ژوورەوە و کوشتی، ئینجا جەنگ لە نێوان مەسعود و (راشد باللە) نوێ بوویەوە و ئینجا لە نێوان مەسعود و (المقتضي لامر الله)، بەمجۆرە ئاژاوە و پشێوی کۆتایی نایەت. ئەمە و جگە لەو ئاژاوانەی کە دەکەوتە نێوان ڕێبازی ئەهلی سوننەت و دەبووە هۆی کوشتن و تاڵانکردن، ئاژاوە دەکەوتە نێوان حەنبەلی و حەنەفییەکان لەسەر لێکدانەوەی ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئان، یان لە پێناو خواردنەوەی ئاوی مێوژ، ئاژاوە دەکەوتە نێوان حەنبەلی و شافیعی لەسەر خوێندنی (بسم الله..) لەنوێژە ئاشکرایەکان، دوای ئەوەی ئەبو یەعلا-لە ٤٥٨ ك مردووە- کە یەکێك بوو لە زاناکانی حەنبەلییەکان کتێبی (الصفات)ی دانا، ئاژاوەکە زیاتر توند بوو، حەنبەلییەکان بە تۆمەتی بەرجەستەکردن(التجسیم) تاوانبارکران، واتا: ئەوانە ئەندام و جووڵانەوە بۆ خوا دادەنێن وەکو مرۆڤ، لە ئەنجامی ئەوە ڕێبازی حەنبەلی کز بوو و خەڵکی لێی دوور دەکەوتنەوە و چیی وای نەمابوو هەر لە ناو بچێت، گەر لەسەر دەستی شێخ عبدالقادر نوێ نەکرابایەوە.

دەتوانین ژیانی شێخ عبدالقادر لە بەغدا بکەینە دووبەش: یەکەم: لە چوونە ناو بەغداوە لە (٤٨٨ ك) تا وانە گوتنەوەی لە قوتابخانەکەی لە ساڵی (٥٢١ ك) واتا ماوەی وانە خوێندن و وانە گوتنەوە. دووەم: لەوانە گوتنەوەی لە قوتابخانەکەی ساڵی (٥٢١ ك)، ئەمە ماوەی وانە گوتنەوە و فێرکردن و ئامۆژگاری و ڕابەرایەتیکردن بوو.

## ماوەی وازهێنان و وانە گوتنەوە:

((پیاوێ لە ئیمامی شافیعی پرسي: ئەی ئەبو عبداللە کامەیان بۆ پیاو باشترە توانای بدرێتێ، یان تاقی بکرێتەوە؟ شافیعی گوتی: پیاو هەتا تاقی نەکرێتەوە توانادار نابێت، چونکە خوای گەورە نوح و ئیبراهیم و موساو عیسا و محمدی- سەلامی خوایان لێ بێت- تاقیکردەوە، هەر کە ئارامیان گرت ئینجا توانای پێ بەخشین.))

عەلیی کوڕی جوهم گوتی:

رەحمەت لە ئاوارە بێ لەو شوێنەی رووی تێدەکا
چیی لەگەڵ نەفسی خۆی کرد
خۆشەویستانی جێهێشت و سوودیان لە ژیان نەبینی
لەدوای ئەو و ئەویش سوودی نەدیت

بەمجۆرە شێخ عبدالقادری گەیلانی لەسەرەتای ژیانی لە بەغدا زۆر بەگرانی تاقیکرایەوە و تووشی گەلێ ئازاوەو هەژاری و برسێتی و بێبەشی بوو بە شێوەیەکی وا زۆر جاران بەگژوگیای لێو رووبارەکان دەژیاو بە پێخاوسی بەناو درکان دەکەوت و لە جۆگەو کاولگەکان دەنوست، تا پێیان دەگوت شێتە، زۆر جاران لە دڵی خۆی بیری دەکردەوە، کە بەیەکجاری بەغدا بەجێ بێڵێ، بەڵام هێندەی پێ نەدەچوو ورەی دەهاتەوە بەرو دەیگوت: هەر دەبێ رێگا کە ببڕم و بگەمە ئەو مەبەستەی کە بۆی هاتوومە.

کە شێخ عبدالقادر هاتە بەغدا، ئەو کاتە گەورەترین شاری جیهان بوو، دوو ملیۆن کەسی تێدا بوو، لەو ساڵەدا (٤٨٨ك). بەغدا هەمووی باسی بزر بوونی (ابی الحامد الغزالی)یان دەکرد لە قوتابخانەی (النظامیة)، غەزالیی مامۆستای گەورەی قوتابخانەکە بوو، لە ساڵی ٤٨٥ك (نظام الملك) پێش کوژرانی داوای لێکردبوو کە وانەی تێدا بڵێتەوە، بەڵام کەمێك پێش بزربوونی لە ٤٨٨ ك تووشی کێشەیەکی دەروونیی قووڵ بوو بوو بەهۆی بیرکردنەوە لە کاروباری ژیان و ڕاستییەکانی

گەردوون، سەری سوڕمابوو لە چۆنیەتی گەیشتنە حەقیقەت، ئایا بەڕێگەی هەستەکانەوە دەیگاتێ، خۆ هەندێ جار لەدەرخستنی ڕاستیەکانی گەردوون هەڵە دەکات و ڕێی لێ تێك دەچێ و خاوەنەکەشی گومڕا دەبێ؟ ئایا بەڕێگەی ژیر دەیگاتێ، کە هەڵە و ڕاستی هەستەکان دەستنیشان دەکا؟ بەڵام ئەویش جاروبار هەڵە دەکاو ڕێی لێ تێك دەچێ و خاوەنەکەشی گومڕا دەبێ، جا چ ڕێگایێ بگرێ؟ ئایا ڕێگەی زانایانی کەلام، یا ڕێگەی دەروونییەکان و ئیمامە بێ گوناهەکەیان، یا ڕێگەی فەیلەسووفەکان؟ هەموو ئەو ڕێگایانەی رەتکردەوە، بەڵام لەبارەی صۆفیگەریەوە گوتی: ((بۆم دەرکەوت کە یەکێ لە تایبەتیەکانیان-واتا: صۆفیەکان- ئەوەیە کە بەهۆی فێربوونەوە ناگەنە هیچ، بەڵکو بە حاڵ و چەشتن))، ((دڵنیا بووم لێیان، کە ئەوانە خودان حاڵن نەك گوتە، ئەوەی بەڕێگەی زانستەوە دەزانرێ، فێربووم، ئەوی بەڕێگەی گوێگرتن و فێربوونەوە نەگەیشتمێ بە سلوك و چەشتن دەیگەمێ، ئەممەش بە پەیوەندی پچڕانی دڵ لە دنیا و دووركەوتنەوە لێی و پەنا بردنەبەر ڕۆژی دوایی و رووكردنە خوا بە هیممەت و دووركەوتنەوە لە پلەوپایەو سامان و هەڵاتن لە هەموو پەیوەندیەکان دەبێ)). ((بە دڵنیاییەوە زانیم کە هەر صۆفییەکان ڕێبواری ڕێگەی گەیشتنە خوان، هەموو هەڵس و کەوتێکی دیار و نادیاریان لە نوری چرای پێغەمبەرایەتییەوەیە، جگە لەو نورە لەسەر رووی زەوی نورێکی تر نییە روناکیی لێ وەربگیرێت))[1]، ئیتر بەشەوو ڕۆژ کەوتە ناو گێژی بیرکردنەوە و وازی لە خواردن و خواردنەوە هێنا بایی ژین نەبێ، وازی لە قسەکردن هێناو توانای وانە گوتنەوەی نەما، لەقوتابخانە و کەسوکاری هەڵات و رووی کردە شام و لە گۆشەیەکی مزگەفتی ئەمەوی لە دیمەشق گۆشەگیر بوو و کەس نەی دەناسی. لە ئەنجامی بیرکردنەوەی گەیشتە ئەوەی کە ((بەڵگەکانی قورئان وەکو خۆراکن هەموو کەسێ سوودیان لێ دەبینێ، بەڵگەی زاناکانی کەلام وەکو دەرمانە تاکو تووك سوودی لێ دەبینن و زیانی بۆ زۆربەیان هەیە))، لە دیمەشقەوە بەرەو حیجاز رۆیی، لە ساڵی ٤٩٨ ك دوای دە ساڵ بزربوون گەڕایەوە بەغدا، بەڵام جارێکی تر نەهاتەوە قوتابخانەی نیزامیە بۆ وانە گوتنەوە، گەڕایەوە

---

[1] المنقذ من الضلال، ص ١٢٣، ١٢٦، ١٣١.

شاری نیسابوور و طوس[1] تا له ٥٠٥ ك وەفاتیکرد.

لەدواییدا دەبینین شێخ عبدالقادری گەیلانیش بەم کێشە دەروونییەدا ڕەتبوو، بەڵام غەزالی لە لووتکەی چالاکیی فیکریی تووشی بوو، کە لە گەورەترین قوتابخانەی ئەوسەردەمەی بەغدا مامۆستا بوو، کەچی شێخ عبدالقادر (٣٣) ساڵی پێچوو، لە ساڵی (٤٨٨-٥٢١ك)، لەبارەی ژیانی ئەو سەردەمەی زۆری لێ نازانین، چونکە زۆربەی ئەو کاتەی لە کاولگەکانی مەدائین و کیسرا دەبردە سەر و دوور بوو لە خەڵکی و خوێندن و پێیان دەگوت: عبدالقادری شێت.

شێخ عبدالقادر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لەتەمەنی هەژدە ساڵی هاتە شاری بەغدا، ئەو شارەی کە خەڵکێکی زۆری تێدایە و جەنجاڵە، گەنجێکی تازە پێگەیشتوو، کەس ناناسێ و فێری ئەم جۆرە ژیانە نییە و سەر و سامانی چل دینارەکەیە و چل دینار لە بەغدا چیی پێ دەکرێ. بەڵام شێخ خاوەنی بڕوایەکی بەتواناو ئاکارێکی ڕاست بوو، هەر لەو ڕۆژەی لە گەیلان دەرچوو بەمەبەستی ئەوەبوو کە ببێتە زانایەکی کارای دڵسۆز و خاوەنی ورەیەکی نەگۆڕ بوو بۆ گەیشتنە مەبەستی. گەر خاوەنی ئەو بەقا و ورەیە نەبوایە، ئەوا لەو گێژەنەی کە خۆی تێ خستبوو نقوم دەبوو، هەروەك ئێستا زۆر لەو کەسانە دەبینین، کە بۆ خوێندن بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆن، کەچی خۆیان ون دەکەن.

لەو ماوەیەی کە شێخ عبدالقادر لە بەغدا بوو گەلێ لە زانا موسڵمانەکان پەیدا بوون و گەلێ لە دانراوەکانیان بڵاوبوویەوە، سەرەڕای غەزالی و کتێبەکانی، ڕاغیبی ئەسفەهانی و (لە ٥٠٢ ك.-١١٠٨ز. مردووە) کتێبەکەی (المفردات) پەیدا بوو، ئەبو القاسم عبدالکریمی قەشیری و نجم الدین ئەبو حەفصی نەسەفی خاوەنی (التیسیر) و واحدی (لە ٤٦٨ ك مردووە) خاوەنی (البسیط و الوسیط و الوجیز)و زەمەخشەری (لە ٥٣٧ ك مردووە) خاوەنی (الکشاف) پەیدا بوون، هەروەها گەلێ لە کتێبەکانی حەدیس و پۆلێن کردنیان و ڕاستەکەی و موسنەدەکەی بڵاو

---

١ ئێستا شاری مەشهەدە لە ئێران.

بوویەوە و گەلێ کتێبی فیقهی لە سەر ڕێبازە جیاوازەکان بڵاوبوونەوە.

هەروەها ماوەردیی (لە ٤٥٠ ك.-١٠٥٨ز. مردووە) خاوەنی (الاحکـــــام السلطانية) و ئەبو حەسەنی ئەشعەری و باقلانی (لە ٤٠٣ ك. مردووە) و شەهرستانی پەیدابوون، کە لە زاناکانی زانستی کەلام بوون. لە فەیلەسوفەکانیش ئیبن سینا (لە ٤٢٨ ك مردووە)، لە ئەدیبەکان: حەریری (لە ٥١٦ ك مردووە) خاوەنی (المقامات) و طوغرائی (لە ٥١٥ ك مردووە) خاوەنی (لامیة العجـــم) دەرکەوتن. هەموو ئەم دانراوانە و دانراوی تریش لە بەغدا زانیاریان دەبەخشی و لەنێوان خەڵکی ئەم دەست و ئەو دەستی پێدەکرا.[1]

هەر لەو کاتەی شێخ عبدالقادر گەیشتە بەغدا پرسیاری قوتابخانەی زانای فیقهو فەرمووده گێڕەوەکان و ئەڵقەی مزگەفتەکانی دەکرد و سەری لێ دەدان و زانستی لێ وەردەگرتن.

## شێخ و مامۆستایەکانی:

لەلای ئەم زانایانە گوێی لە زانستی حەدیس بووە: ئەبو غالیب محەممەد کوڕی حەسەنی باقلانی، ئەبو بەکر ئەحمەد کوڕی موزەففەر، ئەبو قاسم عەلی کوڕی بەیان ئەلڕەزاز، ئەبو محەممەد جەعفەر کوڕی ئەحمەد ئەلسەراج،[2] ئەبو سەعد محەممەد کوڕی خوشەیش، ئەبو تالیب کوڕی یوسف. لەمانەش زانستی فیقهی وەرگرتووە: ئەبولوەفا عەلی کوڕی عوقەیل،[3] ئەبولخەتاب مەحفوز کوڕی ئەحمەد کەلوزانیی حەنبەلی، قازی ئەبو سەعد ئەلموبارەك کوڕی عەلیی ئەلمخەرەمی (لە ٥٢٨ ك

---

١ عبدالقادری گەیلانی، محەمەد ئەلعەینی، دانە فەرەنسییەکە، ل ٣٩.

٢ دانەری (مصارع العشاق) ە و لە ساڵی ٥٠٩ ك مردووە.

٣ شێخی حەنبەلییەکان بوو لە بەغدا و لە ساڵی ٥١٣ ك مردووە.

مردووه)،[1] ئەبولحەسەن محەممەد کوڕی قازی ئەبی یەعلا ئەلفەرائی حەنبەلی. ئەدەب و زانستی بەیان و ڕەوانبێژیی لای عەلی ئەبی زەکەریا یەحیای تەوریزی (لە ٥٠٢ ك مردووە)، وەرگرتووە و زانستی صۆفیگەریی لای ئەمانە خوێندووە: ئەبو محەممەد جەعفەری کوڕی ئەحمەدی سەڕاج (لە ٥٠٩ ك مردووە)، شێخ حەمماد کوڕی موسلیم ئەلموخەڕەمی کە ڕێبازی صۆفیگەریی لێ وەرگرتووە و فیقهیشی لێ فێر بووە و دوای خۆی لە قوتابخانەکەی ئەویش ماوەتەوە.[2]

قورئان و زانستەکانی و خوێندنەوەکانی و ڕاڤە(تفسیر)ی لای ئەبی وەفا عەلی کوڕی عوقەیلی حەنبەلی و ئەبی خەتاب مەحفوزی کلوزانی خوێندووە. هەروەها شێخەکانی ئەمانەن: ئەبو الغنائم محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی عەلی ئەلفورسی و عبدالرحمن کوڕی ئەحمەد کوڕی یوسف و ئەبو البرکات هبـــــةالله المبارك و ئەوانیتر... ئەم خوێندن و زانیاری وەرگرتنە بەردەوام بوو، تا لە هەموو زانست و لق و جۆری جیاڕاییەکان و زانستەکانی قورئان و ڕەوانبێژی و ئەدەب هەڵکەوت و زیاتر گرنگی بە لێکۆڵینەوەی ڕێبازی حەنبەلی داو لەگەڵ ئەمەش ڕێبازی شافیعیی خوێند. ئەم خوێندن و زانست وەرگرتنە سیو سێ ساڵی خایاند بەڵام لەسەر یەك نەبوو ناوە ناوە بە پێی باروزروف پچڕانی تێدەکەوت.

## ژیانی شێخ لە بەغدا:

شێخ عبدالقادر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) بەچل دینارەوە چووە بەغدا، چل دینار لە بەغدا چی دەکا؟ هێندەی پێ نەچوو چیی پێ نەما و ناچار بوو کاربکاو لەکاری دەستی خۆی نانی دەخوارد[3]. دەبێ چ کارێ بکا خۆ لە کشتوکاڵ زێتر چییتر

[1] عبدالقادری گەیلانی، محەممەد ئەلعەینی، دانەفەرەنسییەکە، ل ٤٦.
[2] (المنتظم)ی ئیبن جەوزی، (العبر في خبر من عبر) لەگەڵ (سير أعلام النبــلاء)ی ذەهەبی، (الذيــل على طبقات الحنابلة)ی ئیبن ڕەجەب، (فوات الوافيات)ی محەممەد کوڕی شاکری کوتوبی.
[3] فوات الوافيات، ج ٢، ص ٣٧٣.

نازانێ، کشتوکاڵیش لە بازاڕی بەغدا دەست ناکەوێ، بۆیە ناچار بوو حەمباڵی بکا بۆ پەیداکردنی خۆراکی ڕۆژانەی، دایکیشی بە پێی توانا ماوە ماوە بڕێ پارەی بۆ دەنارد، ئەو پارەیەش هەندێکی پێدە گەیشت و هەندێکی لەناو دەچوو، چونکە زۆر جاران خڕنوك و پاقلە گاگۆزە و گەڵای خاسی دەخوارد، کە لەقەراغ رووبارەکە شین دەبوون و دەستی بۆ کەس درێژ نەدەکرد و داوای شتی لەکەس نە دەکرد.

لە یەکێ لە کۆڕەکانی دا دەڵێ: ((خڕنوك و پاقلە گاگۆزە و گەڵای خاسم دەخوارد کە لە قەراغ رووبارەکە شین ببوون، گرانی هێندە بەغدای تەنگ کردبوو چەند ڕۆژێك بێ خواردن مامەوە و چووم قێزەوەرەکان بخۆم و دەچوومە هەر جێگەیێ خەڵکی تر لە پێش من گەیشتبوونێ، تا گەیشتمە مزگەفتی (یاسین) لە بازاڕی ڕیحانییەکان و هێندەم نەمابوو مردن دەستم بگوشێ، بینیم لاوێکی عەجەمی بەنان و برژاوەوە هاتە ژوورەوە و دانیشت و دەستی بەخواردن کرد، کە منی دیت گوتی: برام ناوی خوا بێنە، نەچووم، سوێندی دام و منیش کەمێکم خوارد، لێی پرسیم: خەڵکی کوێی ؟ چ کارەی ؟ گوتم: فەقێیەکی خەڵکی گەیلانم، گوتی: منیش هی گەیلانم، تۆ لاوێکی گەیلانی دەناسی کە ناوی عبدالقادری زاهیدە ؟ گوتم: من ئەوم، یەکسەر شڵەژاو ڕەنگی گۆڕاو گوتی: وەڵاهی گەیشتمە بەغدا و هەندێ پارە و پولم پێبوو، لە تۆم پرسیار کرد و کەس تۆی پێم نیشان نەداو ئێستاش پارەو پوولەکەم نەماوە، ئەمە سێ ڕۆژە نرخی خواردنم بەدەست نەکەوتووە و تەنیا ئەوەندەی تۆم لابوو، هێندەی نەمابوو بمرم، لە پارەکەی تۆ ئەم نان و برژاوەم کڕی، جا عافێتی بکەو ماڵی خۆتە و من ئێستا مێوانی تۆم دوای ئەوەی تۆ مێوانی من بووی. پێم گوت: ئەوە چییە ؟ گوتی: دایکت هەشت دیناری بەمندا بۆت نارد، منیش دڵم دایەوە و هەندێ زێڕیشم دایێ و وەری گرت و ڕۆیشت))[1]. بەجۆرە چاکەی لەبیر نەدەکرد، کە خۆشی لەوپەڕی پێویستی و بێبەشی دابوو، هەروەها

---

[1] سیرة اعلام النبلاء للذهبي، ج ٢٠، ص ٤٤٤، (الذیل علی الطبقات) ی ئیبن رەجەب لە ژێر ژمارەی ١٣٤، هەردووکیان لە بارەی مێژووی (ابن النحارن) ن.

دەی گوت: جوببەیەکی خوریم لە بەر بوو و پەڕۆیەکم لەسەر سەر بوو، بە پێخواسی بەناو دڕك و داڵدا دەڕۆیشتم و خڕنووك و پاقلە گاگۆزە و گەڵای خاسی لێو رووبارم دەخوارد و خۆم بە شێت و لاڵ نیشان دەدا))[1].

شێخ عبدالقادر دەیبینی خەڵك لە ڕۆژی هەینی گوێ لە دوانی دوێنەر دەگرن و لە مزگەفت و کۆڕەکان گوێ لە ئامۆژگاری دەگرن و دەچنە دەرەوە وەك بڵێی هیچیان گوێ لێ نەبووە، خاوەن دەسەڵاتەکانی دەبینی هەر خەریکی باج کۆ کردنەوە و بەیعەت وەرگرتن بۆ خۆیان و منداڵەکانیان بوون، دەیبینی زانایەکان خەریکی فتوا و دانانی کتێب بوون و خەڵکیان بەرەڵلای ناو ئارەزوو و گوناهەکانیان کردبوو، بەجۆرە خەڵکی رەمەکی لەکردەوەکانیان سەربەست بوون و بەناو ئارەزوویان کەوتبوون، وەکو مێگەلێکی بەردراو شوانێ نەبوو خڕیان کاتەوە، ویستی خوا پەرستیان لە دەروونیان کز ببوو و نەفسەکان دامرکابوو نەوە، ئینجا ئەو جیاوازیە گەورەیەی بۆ بەدیار کەوت، کە لە نێوان ژیانی پاك و سادەی گەیلان و ژیانی پڕ ئاژاوە و تاوانی شاری بەغدا هەیە، ئەو جیاوازیەی کە لە بارەی بەغداوە دەیبیست، کە گوایا شاری زاهیدەکانە و ئێستاش بووەتە شوێنی گوناهو کردەوەی خراپ، خەڵکی نوێژەکانیان لە گوناه نایان گێڕێتەوە، بەڕۆژوو دەبن بەڵام نەفسیان پاك ناکاتەوە و هەست بە ئازاری هەژاران ناکەن، پارە دەبەخشنەوە بەڵام بە پێی شەرعی خوا نییە، گوێ لە ئامۆژگاری دەگرن بەڵام کاریان تێناکات، زاناکان دەدوێن و ئامۆژگاری دەکەن، بەڵام کار لەکەس ناکات، لەم بەرەڵلاییە و ئارەزووپەرستییە ئەلقەیەکی بزربوو هەیە بۆیە وای لێهاتووە، ئەم ئەڵقەیە چییە؟ کە لە شەقامەکانی بەغدا دەڕۆیشت لە هەموو شوێنێ چاوی بە کاری خراپە دەکەوت، درۆ و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن، رەحم نەکردن بە ئاوارە و هەژاران، کۆڕی مەیخواردنەوە لە هەموو شوێنێ هەبوو، لە دەرگای ماڵەکانەوە گوێی لە دەنگی مۆسیقا و ژنی گۆرانی بێژ دەبوو، گوێی لێبوو گەنجەکان قەسیدەکانی (صريع الغواني وابي نواس) بە سروود دەڵێنەوە، هەروەها لەو ساڵەی، کە چووە بەغدا لە

---

١ الطبقات الكبرى، للشعراني، ج ١، ص ١٢٦.

مانگی رەبیعی کۆتایی بینی عبدالملیکی وەزیری خەلیفە (المستظهر) شوێنی رابواردن و سەماو گۆرانی لە نزیك بەغدا دەکاتەوە، بۆیە شێخی حەنبەلییەکانی ئەو کاتە شێخ ئیبن عەقیل زۆر بە توندی رەخنەی لەو کارە گرت.[1]

لە تافی لاوێتیدا ئەو هەموو شتە دەبینێ و هێشتا نەیتوانیوە ژن بهێنێ و ئەو هەموو خراپەکارییە بەدی دەکا، بۆیە بەغدای لێ تەنگ بوو و تووشی نا ئومێدی بوو و ویستی بەغدا بەجێ بێلێ و خۆی و ئاوێنەکەی رزگار بکات، بەلام چۆن بەجێی بێلێ خۆ هێشتا ئاواتەکانی نەهاتۆتە دی، ئەو هاتووە ببێتە زانایەکی کارای دلسۆز و هێشتا لەسەرەتای رێگادایە، جا چی بکا؟ لەبەر ئەمە تووشی کێشەیەکی دەروونی بوو، لە کۆتاییدا وای بەچاك زانی کە بەشێوەیەکی کاتی هەلبێ بۆ ئەوەی سەر لەنوێ بنیاتی گیان و کەسێتیی خۆی بکاتەوە بە شێوەیێ، کە لەگەل ئەو واقیعە نوێیەی بگونجێت و بچێتەوە سەر شەقامی راستی.

لەسەرەتادا هەولی دا بە یەکجاری لە بەغدا هەلبێ، بەلام پێش ئەوەی لە دەرگای (الحلبة)[2] رەتبێ هەستی کرد هێزێکی نهێنی دەیگێرێتەوە، کەوتە زۆرانبازییەکی دەروونی توند، خۆی وا دەهاتە بەر چاو، کە وەکو قورئانێکە لە مالی زندیقێ، یاوەکو سالحە لە سەمود، دەیەوێ هەلبێ لەهەمان کاتدا دەیەوێ رێگای راست بەو زەندیقە نیشان بداو ئەم خەلکە بەرەو چاکە ببات. جارێکیان بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ لە بەغدا دەرچوو ماوەی پازدە رۆژ لە بەغدا دوور کەوتەوە و خۆی لە ولاتی (تستر) بینیەوە، دووبارە گەرایەوە بەغدا و[3] وەك بلێی لە غەیبەوە دەنگێك پێی دەلێ: لە دوارۆژدا بەغدا سوودت لێ دەبینێ، هەندێ جاریش دلی تەنگ دەبوو تا لە هۆش خۆی دەچوو.

ئیبن نەجار لە مێژووەکەیدا گوتوویەتی: ((عبداللّٰەی کوری ئەبی حەسەنی

---

١ عبدالقادری گەیلانی، محەمەدی عەینی، دانە فەرەنسییەکە، ل ٤٢.

٢ دەرگایەك بوو لە شورەی بەغدا.

٣ عبدالقادری گەیلانی، دانە فەرەنسییەکە، ل٤٥.

جوبائی بۆی نووسیوم و دەڵێ: شێخ عبدالقادر پێی گوتم: جارێك شێتی گرتمی و بردمیانە بیمارستان و حاڵ گرتمی تا وایان زانیبوو کە مردوومە، کفنیان هێنابوو و لەسەر مردوو شۆر دایان نابووم، جا حاڵەکەم لە سەر لاچوو و هەستامەوە)).[1]

زۆر جاران دڵی تەنگ دەبوو و پڕ بە زاری هاواری دەکرد، ((گوتی: خەریکی زانست بووم، حاڵ دەیگرتم و ملم لە بیابان دەناو لە رووی خۆم دەدا، شەوێك هاوارم لێ هەڵسا و رێبوارەکان گوێیان لێم بوو و هاتن و ناسیمیان و گوتیان: عبدالقادر شێتە ! زەندەقت بردین))[2]. ((گوتی: جاری وا هەیە شتی هێند قورسم دێتە سەر، گەر بخرێتە سەر شاخ وردی دەکا، هەرکە ئەو بارە گرانەم لە سەر زۆر دەبوو تەنیشتی خۆم دەخستە سەر زەوی و ئەم ئایەتەم دەخوێند ﴿ فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا، إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴾، ئینجا سەری خۆم بەرز دەکەمەوە و بارگرانییەکەم لە سەر نامێنێ)).[3]

لە دواییدا پێی خۆشبوو لە بەغدا دوورکەوێتەوە روو لە بیابان و کاولگەکان بکا بەشێوەیەکی کاتی، تاکو دووبارە بە شێوەیێ بنیاتی کەسێتیی بکاتەوە کە لەگەڵ واقیعە نوێیەکە و کۆمەڵگا نوێیەکە بگونجێت و زیاتر کاریان تێ بکات، ئەم ماوەیە زۆری خایاند و هەندێکیان دەیگەیەننە بیست و پێنج ساڵ،[4] مامۆستا محەمەد ئەلعەینی بە چواردە ساڵی دادەنێ. عبدالقادر چەند ساڵێك لە بورجێکی چۆڵی نزیك بەغدا دەژیا تا ناویان لە بورجەکە نا بورجی ئاوارە، یا بورجی عەجەمی، هەروەها لە کاولگەکانی مەدائین و تاقی کیسرا چەند ساڵێ ژیاوە (١  ٣) ساڵ.

هەر کە هەستی کرد کەسێتییەکەی ئاسایی بۆ تەوەو نەفسی بەهێز بووە و توانای بەرگری و رووبەڕووبوونەوەی خراپەکاریی هەیە، سەر لەنوێ گەڕایەوە بەغدا و

---

١ سیر اعلام النبلاء للذهبي، ج ٢٠، ص ٤٤٤ / الطبقات الكبرى للشعراني، ج ١، ص ١٢٦.

٢ الذيل على طبقات الحنابلة، ئیبن رەجەب لە ژێر ژمارەی / ١٣٤.

٣ کتێبی (الطبقات) ی شەعرانی، ب ١، ل ١٢٦.

٤ سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٦.

ئەڵقەی وانەگوتنەوە، بەڵام بڕیاری ئەوەی دا، کە زانستی صۆفیگەری بخاتە سەر زانستەکانی فیقهو فەرمووده و ئەدەب و زانستەکانی قورئان. لەو کاتەدا لە بەغدا شێخ حومادی کوڕی موسلیمی دەباس (لە ٥٢٥ ك مردووە) ڕێبوارانی صۆفیگەریی پەروەردە دەکردو زۆربەی شێخەکانی بەغدا سەر بەو بوون، یەکێ لە گوتەکانی: ((القلوب ثلاثة، قلب يطوف في الدنيا وقلب يطوف في الاخرة وقلب يطوف بالمولى: دڵ سێ جۆرە: دڵێك لە دنیا خول دەدات، دڵێك لە ڕۆژی دوایی خول دەدات، دڵێك بەلای پەروەردگار خول دەدات)). هەروەها لە گوتەکانی: ((أقصر طريق الى الله تعالى هو حب الله تعالى: کورتترین ڕێگا بۆ خوا؛ خۆشەویستی خوایە)).[1]

هەر کە شێخ عبدالقادر چووە لای شێخە نوێیەکەی حەماد الدباس، شێخەکەی خێر و چاکەی لە دەم و چاوی بینی، بۆیە ویستی ئارام و ڕاستگۆیی و توانای تاقی بکاتەوە و بە توندوتیژی هەڵسوکەوتی لەگەڵی دەکرد، بنەچە و ئەصڵە ڕاستییەکەی ئاشکرا بکات و بزانێ بەرەو دوا دەگەڕێتەوە یاخۆی دەگرێت. سەیری کەن دەڵێت: ((ڕۆژێك بەرەو دەرگای (حەلەبە) چووم یەکێك پێی گوتم: بۆ کێ دەچی؟ پاڵێکی پێوە نام و بەری دامەوە، گوتی: بگەڕێوە خەڵك سوودت لێ دەبینن، گوتم: دەمەوێ ئاینم سەلامەت بێ، گوتی: سەلامەت دەبێ، ئینجا زانیم، کە حومادی دەباسە و دوایی لەوە گەیشتم، کە بۆچی کۆسپم دەخاتە بەر پێ، ئەگەر لێی بزر بام و بۆ خوێندن بچووبام و بگەڕابامەوە، دەیگوت: تۆ فەقێی، لای ئێمە چی دەکەی بڕۆ لای شەرع زانەکان. منیش ورتەم لێوە نەدەهات. لە ڕۆژێکی هەینیی مانگی کانونی دووەم، کە گەیشتینە سەر پردی جوولەکە لەسەر ڕووباری دیجلە، لەپشت شێخەوە دەڕۆیشتم، یەکسەر ڕاوەستا و پاڵێکی پێوەنام و خستمیە ناو ئاوەکەوە، لەبەر ساردیی ئاوەکە بەخۆمم گوت: شووشتنی هەینییە (بسم الله

---

[1] الطبقات للشعراني

الرحمن الرحيم) جوببەیەکی خوریم لەسەر شان بوو و هەندێ کاغەزی نووسراو لەناو ئەنگوچکم بوو، ئەنگوچکەکەم بلند کردەوە نەخۆ کاغەزەکان تەڕ بن، ئەوان بو بەجێیان هێشتم و رۆیشتن، منیش جوببەکەم گوشی و بەدوایان کەوتم، بەڕاستی سەرمایەکە زۆر کاری تێکردم))[1]. شێخ ئازاری دەدام، کە دەهاتم دەیگوت: ئەمرۆ نانێکی زۆر و پلودە(فالوذج)[2]مان بۆ هات خواردمان و هیچمان بۆت هەڵنەگرت. هاوڕێیەکانی شێخ تەماعییان تێکردم و گوتیان: تۆ شەرع زانی لێرە چ دەکەی، کە شێخ بینی ئازارم دەدەن، پێی گوتن: بۆ ئازاری دەدەن؟ بە خوا هیچتان وەکو ئەو نین، کە من ئازاری دەدەم بۆ تاقیکردنەوەمە و دەیبینم وەکو شاخ چەسپاوە و ناجولێت.[3]

لەم چیرۆکە دەگەینە چەند شتێ:

**یەکەم**: شێخ عبدالقادر سەرەتای فیقهی خوێندووە، ئینجا بەرە و صۆفیگەری چووە.

**دووەم**: لە خوێندنی فیقهیدا پێشکەوتوو بووە، شێخ حوممادو قوتابیەکانی دەیانزانی کە مەلایە و هەرکە کەوتە ناو ئاوەکەوە ئەمەی بە هەلزانی و نییەتی غوسلی لێهێنا تا پاداشتی شووشتنی هەینی پێ بگات، چونکە غوسڵ بێ نییەت نابێت و ئەمەش هەر لە مەلایێ دەوەشێتەوە.

**سێیەم**: شێخ حوممادئەوی تاقیدەکردەوە و لە تاقیکردنەوەکەش زۆر سەرکەوتوو بوو.

---

١ ئەمە لە کانوونی دووەمی نیوەی شەعبانی ٤٩٩ ك بوو. قلائد الجواهر، ص ٢٧.

٢ فالوذج: جۆرە حەلوایەکە لە ئارد و ئاو و هەنگوین دروست دەکرێت. بڕوانە: المنجد في اللغة والأعلام.

٣ سير اعلام النبلاء، الامام شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان الذهبي، ٤٣٩/٢٠ / کتێبی مامۆستا محمد العيني، ل ٤٨ بە دەستکارییەوە.

**چوارەم:** شێخ عبدالقادر زۆر هێمن و لەسەر خۆ بوو، گەر وانەبوایە زۆر لە شێخەکەی تووڕە دەبوو.

**پێنجەم:** مرۆڤێکی ئازاو دڵێکی خۆگری هەبوو.

**شەشەم:** شێخ عبدالقادر دەیویست هەر چۆنێ بێت بگاتە ئەو مەبەستەی کە بۆ خۆی وێنەی کێشا بوو، ئەگەر چی توشی کۆسپ و تەگەرە ببێت.

ئینجا شێخ عبدالقادر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: پیاوێك لە هەمەدانەوە هات ناوی یوسفی هەمەدانی بوو-لە موریدەکانی خوراسان لای ئەو پەروەردە دەکران و لە ساڵی ٥٣٥ك. وەفاتیکرد و لە (مەرۆ) ناشتیان(الطبقات الکبری للشـــــعراني)- پێیان گوتم قوتبە، لە خانەقایێ دابەزی و چوومە لای، کە منی بینی هەستاو دای‌نیشاندم، ئینجا باسی هەموو حاڵەکانی خۆی بۆ کردم و چ کێشەیەکم هەبوو بۆی چارە کردم، ئینجا پێی گوتم: قسە بۆ خەڵکی بکە، گوتم: قوربان من عەجەمم، چۆن قسە بۆ زمان پاراوەکانی بەغدا بکەم؟! پێی گوتم: تۆ فیقهو ئوسوڵ و جیاوازی و ڕێزمان و زمان و لێکدانەوەی قورئانت خوێندووە و ناتوانی قسە بکەی!

بڕۆ سەر کورسی و قسە بکە، من هێشوە خورمای بەڵح لە تۆدا دەبینم و دەبێتە دارخورما.[1]

لەم چیرۆکە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کە شێخ عبدالقادر بووەتە مرۆڤێکی کامڵ و زۆری نەماوە خوێندنەکەی بەربگرێ و دەست بەوانە گوتنەوە بکا، هەروەها ئەوەمان پێ ڕادەگەینێ، کە زمانی عەرەبی لە کز بوون دابووە لەبەر ئەو زمانانەی، کە هاتوونەتە ئێران لەسەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچیدا. چونکە تورکە سەلجوقیەکان فەرمانڕەواییان دەکرد. هەر کە یوسفی هەمەدانی داوای لە شێخ عبدالقادر کرد قسە بۆ خەڵکی بەغدا بکا، ئەویش گوتی من عەجەمێکی گەیلانیم و

---

١ العذق : هێشووی خورمای بەڵح.

ناتوانم، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە لەو کاتەدا زمانی عەرەبی لە گەیلان باو نەبووە.

لەساڵەکانی کۆتایی خوێندنی شێخ عبدالقادر بۆ خوێندنی فیقه هاتە لای قازی ئەبی سەعد، ئەبی سەعید-موبارەکی کوڕی عەلی موخەڕەمی (نیسبەتە بە موخەڕەم کە گەڕەکێکی بەغدا بوو و کۆشکی بوەیهیەکان لەوێ بوو، هەندێ دەڵێن: مەخزومی-کە هەڵەیە، لە ساڵی ٥٢٨ ك وەفاتیکردووە.[١]) هەتا مرد لای مایەوە و تەریقەتی لەو وەرگرت. موخەڕەمی قوتابخانەیەکی لە دەرگای (ئەزج) لە بەغدا دروستکردبوو، لە سەر ڕێبازی حەنبەلی فیقهی تێدا دەگوتەوە، هەر کە بەناو ساڵ کەوت داوای لە شێخ عبدالقادر کرد کە وانە کە بڵێتەوە لە سەرەتای ساڵی ٥٢١ك.[٢] - تا وەفات کردنی لە ساڵی ٥٢٨ ك.[٣] بەمجۆرە قۆناغی وانە خوێندن لە ژیانی شێخ عبدالقادر کۆتایی هات و قۆناغی فێرکردن و ڕابەرایەتی و چاکسازی لە ساڵی ٥٢١ کۆچییەوە دەستی پێکرد و لە دوای ساڵی ٥٢٨ ك ئەم فێرکردن و ڕابەرایەتی و چاکسازییە پێگەیشت و بەتین بوو، ئەمەش ماوەی دووەمی ژیانێتی لە شاری بەغدا.

---

١ کتێبی مامۆستا محەمەد ئەل عەینی، ل ٤٦.

٢ ذيل الطبقات الحنابلة لأبن رجب رقم ١٣٤ / فوات الوافيات للكتبي ٢:٣٧٣.

٣ تێبینی: شێخ ئەبو حەسەنی نەدوی لە کتێبەکەیدا (رجال الفكر والدعوة في الاسلام ص ٢٥٠)دا دەڵێ: ئەبو سەعید موبارەکی کوڕی عەلی موخەڕەمی مامۆستای شێخ عبدالقادر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) خاوەنی قوتابخانەی (باب الازج) کە لە دواییدا درایە شێخ عبدالقادری گەیلانی لە ٥١١ ك مردووە و ئەمەی لە کتێبی (البداية و النهاية)ی ئیبن کەثیر وەرگرتووە، دوای گەڕانەوە بۆ سەر کتێبی ناوبراو: ب ١٢، ل ١٨٥ چاپخانەی دار الفكر دەرکەوت، کە لە ٥١٣ ك مردووە نەك لە ٥١١ ك. بەڵام مامۆستا محەمەد عەلی العینی لە کتێبەکەیدا (شێخ عبدالقادری گەیلانی ل ٤٦)دا دەڵێ: لە ٥٢٨ ك مردووە، کەچی من لام وایە لە ٥٢١ ك تۆزێ پێشتر یان پاشتر مردووە، چونکە لە ٥١١ ك یان لە ٥١٣ ك مردبێ، تا ساڵی ٥٢١ ك کێ لەسەر قوتابخانەی (باب الازج) بووە، کە لەو ساڵە دا (٥٢١) شێخ عبدالقادر خەریکی وانە گوتنەوە بووە تێیدا؟ ئەگەر لە ٥٢٨ ك مردبێ، کە لەو ساڵەدا قوتابخانەکە دووبارە فراوان و چاك کرایەوە و، ئینجا درایە شێخ عبدالقادرو بەناوی ئەو کرا، ئەمە چۆن لە ژیانی موخەڕەمیدا کرا، کە خاوەنی ئەسڵی قوتابخانەکە بوو؟

وا دیاره باری دەروونی و مادیی شێخ چەند سالّی پێش ئەم ماوەیە باشتر بووە، بەلّگەش لەسەر ئەمە ژنهێنانێتی. سالّی ژنهێنانی نازانین و هەر هێندە دەزانین کە گەورەترین مندالّی عبداللّٰهیە، کە لە سالّی ٥٠٨ ك لە دایکبووە،[1] ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە سالّێ یا دوو سالّ پێش ئەم مێژووە ژنی هێناوە. دوای چەسپانی باری دەروونی و تەندروستیی چوار ژنی لەسەر یەك هێناوە.

سەهرەوەردی لە کتێبی (عوارف المعلوف) لە بەشی بیست و یەکەمدا دەلّێ: هەندێ پیاو چاکان بە شێخ عبدالقادریان گوت: بۆ چی ژنت هێنا؟ گوتی: ژنم نەهێنا تا پێغەمبەرﷺ -لەخەوندا- پێی گوتم: ژن بێنە، هەروەها گوتی: ماوەیەك بوو دەمویست ژن بێنم بەلاّم لەترسی تێکچوونی کات زاتم نەدەکرد ژن بێنم، هەر کە ئارامم گرت و کاتی خۆی هات خوای گەورە چوار ژنی بۆم پێکهێنا.

---

١ قلائد الجواهر ص٤٤.

# دەروازەی سێیەم

## قۆناغی وانەگوتنەوە و ئامادەبوون بۆ ڕێنمایی و چاکسازی

# دەستپێك

بۆ ئەوەی فێرکردن و ڕێنمایی و چاکسازی سەرکەوتوو بێ، دەبێ لەسەر چەند بنەمایەك دامەزرابن، شێخ عبدالقادر لەقۆناغی فێرکردن و ڕێنمایی و چاکسازیدا سەرکەوتنێکی مەزنی بە دەستهێنا، کەواتە بنەماکانی ئەم سەرکەوتنە چ بوون؟

بنەماکان ئەو سیفەت و ئەدگارانە بوون، کە لە خۆرسکەوە لە گەیلان لەسەریان پەروەردە بوو بوو و بە مانەوە هاتە بەغدا، ئینجا ڕێبازی پاکردنەوەی دەروونی، کە لە بەغدا وەری گرت دوای ئەوەی لە فیقهدا هەڵکەوت.

بۆیە پێش ئەوەی شارەزای قۆناغە تازەکەی ببین، کە بریتی بوو لە قۆناغی توانایی و ڕێنمایی و چاکسازیی و پەروەردەکردنی ڕێبوارانی صۆفیگەری، پێویستە ئەم بنەمایانە بپشکنین و شارەزایان ببین:-

١- ﴿وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ: سەربەرزی بۆ خواو پێغەمبەری خواو بڕوادارەکانە.﴾[1]

٢- ((**ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ وَازْهَدْ فِيمَا فِيمَا عَنْدَ النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّـــاس**: دنیا بەکەم بگرە، خوا خۆشتی دەوێ، واز لە سامانی خەڵکی بێنە خۆشتیان دەوێ.))[2]

٣- ((لو زهد العلماء في الدنيا لخضعت لهم رقاب الجبابرة: گەر زانایەکان دنیا

١ المنافقون/٨

٢ ئیبن ماجە گێڕاویتیەوە و فەرموودەیەکی (حسن)ە.

بەکەم بگرن، بێنن هەموو توانا دارەکانی دنیا ملیان بۆ کەچ دەکەن.))[1]

ئەمە ئەدگارەکانی قۆناغە نوێیەکەی ژیانی شێخ عبدالقادری گەیلانییە لە بەغدا، شانازی بە خواو پێغەمبەری خوا دەکا، لە کەس ناکات و زاهیدی بوو لە دنیا و دنیای سێ بەسێ تەڵاق دابوو، چاوی لە دەستی نەبوو و خەڵکی بۆی هاتن، بەناچاری دونیای بۆهات، خەلیفەو وەزیرو گەورەکان سەریان بۆی شۆڕکرد.

ئیبن رەجەب دەڵێ: ((شێخ عبدالقادر لە دوای ساڵی ٥٢٠ ك لە ناو خەڵك دەرکەوت و ئامۆژگاریی دەکردن و خەڵکی بەتەواوی پێی قایل بوون، گوتە و حاڵ و کەرامەت و پێشبینیەکانی دەنگی دایەوە و پاشاو گەدا لێی دەترسان)).[2]

بەمجۆرە گوتەو ئامۆژگاری و رێنماییەکەی وەکو دڵۆپێ دەستی پێکرد و دوایی بووە لافاو، دوای ئەوەی یوسفی هەمەدانی ئامۆژگاریی کرد، کە لەگەڵ خەڵکی دابنیشێ و بۆیان بدوێ، دەستی بەم کارەکرد، هەرچەندە ئەمە لە سەرەتادا شتێکی قورس بوو، بەڵام خوای مەزن بۆی ئاسان کرد، شێخ دەڵێت: ((قسە کۆمەڵەی لەسەر دەکردم و لەسەر دڵم کۆدەبوویەوە، گەر دەرم نەبڕیبایە دوور نەبوو بم خنکێنێ و نەم دەتوانی بێدەنگ بم، دوو پیاو، یان سێ لەلام دادەنیشتن، دوایی ناومیان بیست و لێم کۆبوونەوە، تا وای لێهات دانیشتووان دەبوونە حەفتا هەزار کەس)).[3]

ئیبن جەوزی دەڵێ: ((عبدالقادر لە قوتابخانەی موخەڕەمیی شێخی، وانەی دەگوتەوە و بەزمانی ئامۆژگاری قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، تا بە زوهد ناوی دەرکرد، قوتابخانەکە پڕی خەڵك دەبوو، لای شورەی بەغدا دادەنیشت و پاڵی بە تەکیەکە دەداو خەڵکێکی زۆر لە کۆڕەکەی تۆبەیان دەکرد)).[4]

---

١ لە گوتەکانی فوزەیلی کوڕی عەیاز.

٢ کتێبی (الذيل) لەسەر (طبقات الحنابلة) لە ژێر ژمارەی: ١٣٤.

٣ سير أعلام النبلاء للذهبي، ج ٢٠، ص ٤٣٩.

٤ کتێبی (التاج المكلل) لە ژێر ژمارەی : ١٥٩.

شێخەکەی قازی ئەبو سەعد (ئەبو سەعید) موبارەك کوڕی عەلی کوڕی حوسێنی موخەڕەمی لە (باب الازج) لە بەغدا قوتابخانەیەکی بۆ خۆی دروست کردبوو، لەسەر ڕێبازی حەنبەلی وانەی فیقهی دەگوتەوە، شێخ عبدالقادر لە سالانی کۆتایی خوێندنی چووەلای و دوایی لە وانەگوتنەوە یارمەتی دەدا، شێخ عبدالقادر زانستی صۆفیگەریی لەشێخ حوماد کوڕی موسلیمی دەباسی شێخی وەردەگرت، هەروەها وانەی فیقهی لە شێخەکەی موخەڕەمی وەردەگرت، هەر ئەمیش بوو کردیە ڕێبواری صۆفیگەری.

زنجیرەی تەریقەتی موخەڕەمی هەروەك (ابن الملقن) لە کتێبەکەی (طبقات الاولیاء)دا باسی دەکات بەجۆرەیە: ئەبو محەممەد عبدالقادر کوڕی ئەبی سالحی گەیلانی لە ئەبی سەعیدی موبارەکی کوڕی عەلی موخەڕەمی لە شێخ ئەبی حەسەن عەلی کوڕی محەممەدی کوڕی یوسفی کوڕی عبداللّەی قورەیشی لە ئەبی فەرەج عبدالرحمنی کوڕی عبداللّەی تەرسوسی، لە ئەبی‌فضل عبدالواحیدی کوڕی عبدالعزیزی تەمیمی لە باوکی شێخ عزالدین لە شبلی لە جونەید، لە سرِیی سەقەتی، لە مەعروفی کەرخی، لە داودی طائی، لە حەبیبی عەجەمی، لە حەسەنی بەسری لە عەلیﷺ لە پێغەمبەرﷺ. یان لە جونەید لە جەعفەری حەزاء لە ئەبی عەمری ئیستەخری لە ئەبی تورابی نەخشەبی لە شەقیقی بەلخی لە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە موسای کوڕی زەیدی راعی لە وەیسی قەرەنی لە عومەر و عەلیﷺ لە پێغەمبەری خواﷺ.[1]

بەلام مامۆستا محەممەدی عەینی زنجیرەیەکی تری ئەم ڕێبازە باس دەکا، کە بەم شێوەیەیە: شێخ عبدالقادر لە ئەبی سەعدی موبارەکی موخەڕەمی لە ئەبی حەسەنی عەلی کوڕی محەممەدی کوڕی یوسفی خاکیاری لە ئەبی‌فەرەج یوسفی تەرسوسی لە ئەبی فضل عبدالواحیدی تەمیمی لە شبلی لە ئەبی قاسم جونەید لە سرِیی سەقەتی لە

---

١ طبقات الاولیاء لابن الملقن، ص ٤٩٤.

مەعروفی سادق لە ئیمام محەممەدی باقر، لە ئیمام زەین العابدین لە ئیمام حوسەینﷺ لە ئیمام عەليﷺ لە پێغەمبەرﷺ.[1]

هەر کە شێخەکەی ئەبو سەعدی موخەڕەمی وەفاتیکرد، قوتابیەکانی لە شێخ عبدالقادر چاکتریان بە دەست نەکەوت، کە قوتابخانەکەی بدەنێ. شێخ عبدالقادر بۆ وانە گوتنەوە و فتوا و ئامۆژگاری و ڕێنمایی لە مزگەفتەکە دانیشت. بەڵام مزگەفتەکە تەنگ بوو بۆیە شێخ دەچووە دەرەوەی شوورەی بەغدا بۆ وانەگوتنەوە.[2] دوایی خێرومەندان قوتابخانەکەی موخەڕەمییان لە میراتگرانی کڕییەوە و سەر لە نوێ بنیاتیان نایەوە و فراوانیان کرد لە سەر شێوەی قوتابخانەو تەکیە بۆ ڕێبوارانی صۆفیگەری و قوتابیان، ئەم کارەش بە پارەو پولی دەوڵەمەندەکان و هێزو بازوی هەزاران جێبەجێ بوو. ئینجا ناوی بووە قوتابخانەی شێخ عبدالقادری گەیلانی و ئێستاش هەر ماوە لە بەغدا و پێی دەگوترێ قوتابخانەی قادری.

هێندە ئاسان نییە شێخ عبدالقادرێکی هەژاری گۆشەگیر، کە ڕووی لە بیابان و کاولگەکان دەکرد و پێیان دەگوت: شێت یەکسەر ببێتە زانایەکی تەواو و شێخێکی مەزن، خەڵکی فێربکا و ئامۆژگارییان بکا، ئینجا تەکیە و قوتابخانەیەکی بۆ دروست بکەن، کە تا ئێستا بە ناوی ئەوەوەیە، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە، کە شێخ عبدالقادر لە مرۆڤە دەگمەنەکان و خاوەن ئاکارە بەرزەکان بووە.

بۆیە پێش ئەوی بچینە نا ژیاننامەی شێخ عبدالقادر و ڕێبازەکەی لەوانە گوتنەوە و ئامۆژگاری و ڕێنمایی و چاکسازی، واچاکە باسی هەندێ لە سیفەت و ئاکار و هەڵس و کەوتەکانی بکەین بەپێی ئەو سەرچاوانەی باسی ژیانیان کردووە بۆ ئەوەی لە کەسێتیی بگەین و هۆی سەر کەوتنەکەی لەو کارەی کەمەبەستی بوو بزانین. خوای گەورە هەندێ پیاوی هەیە گەر بیانەوێ دەیەوێ؛ ((رُبَّ أَشْعَثَ مَدْفُوعٍ

[1] کتێبی عبدالقادری گەیلانی، محەمەدی عەینی، دانە فەرەنسییەکە، ل ٥١.

[2] کتێبی (التاج المكلل) لە ژێر ژمارەی (١٥٩) سير اعلام النبلاء ج ٢٠، ص ٤٣٩ (المنتظم)ی ئیبن جەوزی.

بِالأَبْوَابِ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ: قژ لولی تۆزاویی لە دەرگا دەرکراوی وا هەیە گەر سوێند بخوا بەخوا شتێکی بۆ بکا دڵی ناشکێنێ.))[1]

مێرمنداڵێکی تەنیای هەژار لە گەیلانەوە بێتە بەغدا و ماوەیێ لە چۆڵگەو کاوڵگاکان ژیان بەسەر بەرێ و دوایی پاشاو گەورە پیاوان لێی بترسن و تائێستاش بەرێزەوە ناوی لە سەر زاری خەڵکی بێ، بێگومان ئەو کەسە خاوەن سیفەت و ئاکارێکی تاك و دیارە. دەبا سەرێکی ئەو ئاکارانەی بکەین کە لەسەریان گەورە بووە و دوایی شارەزای زانستی پاککردنەوەی دەرون بین، چونکە بە هۆی ئەم دوو بنەمایەوە توانیی ببێتە ئیمامی پیاوچاکانی سەردەمی خۆی و ببێتە کەڵەپیاوێکی چاکە خوازی سەدەی شەشەمی کۆچی.

---

١ رواه مسلم: جامع الاصول، ج ٤، ص ٦٧٧.

# بەشی یەکەم

# سیفەت و ئاکارەکانی شێخ عبدالقادر

## سیفەتەکانی لەش و لاری:

مامۆستا محەممەدی عەینی کە کتێبەکەی لەسەر شێخ عبدالقادری گەیلانییە، دەڵێ: پیاوێکی مەیلەو درێژ بوو، گران و لەسەرخۆ و خۆگر بوو، ناوچەوانی پان و ئەسمەر بوو، قژی دەگەیشتە سەر شانەکانی، شانی پان و ئەدگار رێك بوو، دەنگی خۆش و نێر بوو، گوتەکانی دانسقەبوون، نیگای تیژ بوو و کەم کەس دەیتوانی چاو لە چاوی بڕی، ریشی درێژ و ناوەنجی بوو لە پڕی، دوای ئەوەی بەناو ساڵ کەوت ریشی خۆڵەمێشی بوو، کۆتاییەکەی ورد بوو، بەگشتی مرۆڤێکی سادەو ساکار و خۆشەویستبوو، هەروەها نەرم و نیان گران و جوان بوو.[1]

شێخ یونسی سامەڕایی لە کتێبەکەی (موفق الدين بن قدامة المقدسـي) باسی سیفەتەکانی دەکاو دەڵێ: ((عبدالقادری شێخمان لەش لاوازی بالا ناوەنجی بوو، سینگ پانی ریش پان و درێژ بوو، ئەسمەرو برۆتێکەلاو بوو، دەنگی نێرانە بوو، خاوەن سیما و رێزو زانست بوو)).[2]

---

١ کتێبی عبدالقادری گەیلانی، محەممەدی عەینی، ل ٦٢.

٢ کتێبی شێخ عبدالقادری گەیلانی، شێخ یونسی سامەڕایی، ل ١٠ .

بێگومان شێخ لە شێکی بەهێزو تەندروستییەکی چاکی هەبوو، پێشتر باسمان کرد چۆن کەوتە ناو دیجلە لە ڕۆژێکی ساردی زستان دا و جوبەیەکی خوریی لەبەر بوو، جوبەکەی گوشی و لەبەری کردو ڕۆیشت، توشی نەخۆشییەکی قورسیش نەبوو.

ئیبن نەجار لە مێژووەکەیدا دەڵێ: ((گوێم لە ئەبو محەممەدی ئەخفەش بوو دەیگوت: لە چلەی زستاندا دەچوومە لای شێخ عبدالقادر، تاکە کراسێکی لەبەر و کلاوێکی لەسەر بوو، ئارەقە لەلەشی دەردەچوو و باوەشێنیان لێی دەکرد وەکو هاوین))[1] ئاشکراشە، کە بەغدا لە زستاندا زۆر ساردە، ئەمەش نیشانەی لەش بەهێزی و توانا گیانییەکایەتی ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

## سیفەتە ئاکارییەکانی:

لەبارەی سیفەتە ئاکارییەکانی ئیمامی حافز ئەبو عبدالله محەممەد کوڕی یوسفی بیر زالیی ئیشبیلی دەڵێت: ((دوعای قەبوڵ بوو، زوو فرمێسکی دەهاتێ، هەمیشە لە یادکردنەوە بوو، بیری زۆر بوو، دڵی ناسك بوو، ڕووخۆش بوو، بەخشندە بوو، زانستی زۆر بوو، ئاکاری پیرۆز بوو، خوورەوشت چاك بوو، لە خواپەرستی و کۆششدا چەسپاو بوو)).[2] ((لەگەڵ شکۆمەندی و بەرزیی لەگەڵ گچکە و کەنیزە رادەوەستا، لەگەڵ هەژاران دادەنیشت و جلی پاك دەکردنەوە، لەبەر گەورەپیاوە دەسەڵاتدارەکان هەڵنەدەستایەوە و نەدەچووە بەر دەرگای وەزیر و دەسەڵاتدارەکان و گرنگیی پێیان نەدەدا)).[3]

ئەبوالفیداء لە مێژووەکەی دەگێڕتەوە کە خەلیفە (المقتفي) داوای لە وەزیرەکەی کرد، کە زانایەکانی عێراقی بۆ کۆبکاتەوە، کە ئامادەبوون خەلیفە لێی

---

١ کتێبی (الذیل) لەسەر (الطبقات) ی ئیبن ڕەجەب لە ژێر ژمارەی: ١٣٤ / سير اعلام النبلاء، للذهبي، ج ٢٠، ص ٤٤٩.

٢ قلائد الجواهر، ص ٩.

٣ الطبقات للشعراني، ج ١، ص ١٢٧.

پرسي: هەموو هاتوون؟ گوتی: بەڵێ، جگە لە شێخ عبدالقادر و عودەی کوڕی موسافیر، خەلیفە پێی گوت: کەواتە کەس ئامادە نەبووە. موفتیی عێراق محیّدین ئەبو عبداللە محەممەد کوڕی حامیدی بەغدادی گوتی: ((شێخ عبدالقادر دوورترین کەس بوو لە خراپە و نزیکترین کەس بوو لە حەق، ئەگەر سنوورەکانی خوا ببەزێنرابایە زۆر توند دەبوو، بۆ خۆی تووڕە نەدەبوو و بەرگریی جگە لە خوا نەدەکرد)).[1]

گەر لەو ئاکارانە بپشکنین، کە شێخ عبدالقادر لە گەیلان لە سەریان گەورە بووە و دوایی هێناویێتیە بەغدا دەبینین کە دیارترینیان ئەمانەن: راستگۆیی، بەخشندەیی، قوربانی، ئارامگریی، نەرم و نیانی، سەرەڕای لە خواترسان و وەرع. دەبا بە خێرایی سەیری ئەم ئاکارانە بکەین کە لەسەریان پەروەردە بووە و وایلێکردووە، کە لە کۆمەڵگای ئاژاوەداری بەغدا بە هێمنی و ئارامی بژی، تا گەیشتۆتە کەناری ئاسایش و سەلامەتی.

**راستگۆیی**: پێشتر بینیمان چۆن خانەوادەی شێخ عبدالقادر لەسەر ڕاستگۆیی و ئاکاری چاك و لە خواترسان پەروەردەیان کردبوو، بەڕاستگۆیی گەورە بوو و درۆی نەدەکرد، پێشتر باسی چیرۆکەکەمان کرد لەگەڵ دزەکان و چۆن ڕاستگۆییەکەی بویە هۆی تۆبەکرۆدنی دزو جەردەکان و دوور کەوتنەوەیان لە دزی و ڕێگرتن لە موسڵمانان. شێخ (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەیگوت: راستگۆیی یەکسان بوونی نهێنی و ئاشکرایە، لەدوای پلەی پێغەمبەرایەتی دێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا : ئەوانە لەگەڵ ئەوکەسانەن کە خوا نیعمەتی لەگەڵ کردوون لە پێغەمبەر و ڕاستگۆ و شەهید و پیاوچاکەکان، بەڕاستی ئەوانە هاوڕێی چاکن.﴾.[2]

**بەخشندەیی و لەخۆگرتنەوە(إیثار)**: شێخ (رەحمەتی خوای لێبێ) بە

---

[1] قلائد الجواهر، ص ٨.

[2] النساء / ٦٩.

خۆرسك بەخشندە و قوربانی دەربوو، گەر پێویستیش بوایە دەیبەخشیەوە، نان بدە بوو، دوای ئەوەی دنیا روی تێکرد و بویە ساماندار، فەرمانی دەکرد کە هەموو شەوێ سفرە رابخرێ و لەگەڵ قوتابی زانست ئارامی هەبوو و هەرکەسێ سوێندی بۆ بخواردبایە بڕوای پێ دەکرد.[1]

هەروەها دەیگوت: ((هەموو کردەوەکانم پشکنی لە خواردن دانم چاکتر نەبینی، حەزم دەکرد گەر سامانی دنیام لەدەست بوایە دەمدایە برسیەکان، ناولەپم کونەو هیچی تێدا نامێنێ، گەر هەزار دینارم بۆ بێت شەوێك لام نامێنێتەوە))[2]. هێشتا دەڵێ: ((حەزرەتی عیسا ﷺ لە ئیبلیسی پرسی: کێت لە هەموو کەسێ خۆشتر دەوێ ؟ گوتی ئیمانداری قرچۆك، گوتی رقت لەکێ زیاتر دەبێتەوە؟ گوتی بەدکاری بەخشندە، گوتی: بۆچی؟ گوتی: چونکە هیوادارم بڕواداری قرچۆك رەزیلیەکەی بیخاتە گوناهەوە، هەروەها دەترسم گوناهەکانی بەدکاری بەخشندە بە هۆی بەخشندەییەکەیەوە رەش ببێتەوە)).[3]

شێخ (رەحمەتی خوای لێ بێ) گوتی: ((بیست ڕۆژ لە بەغدا بووم هیچم دەست نەکەوت بیخۆم، حەڵاڵم دەست نەکەوت، چوومە تاقی کیسرا کە حەڵاڵم دەستکەوێ، بینیم حەفتا هەژار لەوێ بۆ ئەمە هاتوون، گوتم ویژدان نییە منیش بکەومە سەریان، گەڕامەوە بەغدا، یەکێکی خەڵکی شارەکەم بینی، کە نەم دەناسی و هەندێ پارەی دامێ و گوتی: ئەمە دایکت بۆتی ناردووە، منیش پارچەیەکم بۆ خۆم گلدایەوە و بەخێرایی ئەویترم بردە تاقی کیسرا و بەسەر حەفتا کەسەکەم دابەشکرد، گوتیان: ئەمە چییە؟ گوتم: لە دایکمەوە بۆم هاتووە و لە ئێوە پێویستترم نەدۆزیەوە، ئینجا گەڕامەوە بەغدا و بە پارچەکەی لای خۆم خواردنم پێ کڕی و بانگی هەژارانم کردو بەیەکەوە خواردمان))[4].

بەم جۆرە بەخشندەییەکەی بەدیار دەکەوێ و خۆی یەکجار زۆر پێویست بوو،

---

١ قلائد الجواهر، ص ٨.

٢ سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢٠، ص٤٤٩.

٣ الفتح الرباني، المجلس / ٢٩.

٤ قلائد الجواهر، ص ٩.

بەم شێوەیە یەکێکە لەمانە ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ : هەرچەندە خۆیان پێویستن بەڵام خەڵکیتر لە خۆیان پێویستتر دەزانن﴾[1].

**ئارامگریی**: شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەسەر ناخۆشییان زۆر بە ئارام بوو، وەکو مەردێکی ڕەند ئارامی لەسەر برسێتی و رووتی و هەژاری و پلاری خەڵکی و ستەمیان هەبوو، هەروەها بەبریق و باقی دنیا هەڵنەخەڵەتا و ئارامی لەسەر ئارەزووەکانی دونیا گرت، سەیریکە دەڵێ: ((لەقسەی ڕەقی شێخەکان هەڵنەدەهاتم، بەڵکو کەڕو کوێر بووم لە بەردەستیان، بەلایان بەسەر دا دەباری و ورتەم لێوە نەدەهات، تۆ ئارام ناگری دەتەوێ سەربکەوی، نەخێر هیچ کەرامەتت نییە))[2]. ((واتای ئارام ئەوەیە سکالای خۆت نابەیە بەر کەس و پشت بە هۆکار نابەستی، ئەوەی زانستی بوێ دەبێ ئارامگر بێ، ئەوەیە دەیەوێ بگاتە مەبەست، دەبێ تا کۆتا لێی ئارامگر بێ، مەبەستیش خواو ڕەزامەندییەتی، ئەمەش کۆتایی بۆ نییە)).

**ئارامگرتن لەسەر بەلا**: شێخ ئارامێکی جوانی لەسەر بەلا گرت و ماوەیەکی زۆر بەرگەی گرت، بۆیە دەیگوت: ((لە بەلا رامەکە، بەلا و ئارام بنچینەی هەموو خێرێکن، بنچینەی پێغەمبەرایەتی و پەیام و ناسین و خۆشەویستییە، ئەگەر ئارام لەسەر بەلا نەگری بناغەت نییە، ساختمانی بێ بناغەش مانەوەی بۆ نییە، چ خانوێکت دیتووە لەسەر زبڵدان خۆی بگرێ))[3]، هەروەها دەیگوت ((ئەوەی ئاینی خوا بلاوبکاتەوە هەر دەبێ تاقیبکرێتەوە بەلای بێتەسەر، گەر تاقیکردنەوە بوایە خەڵکێکی زۆر داوای ویلایەتیان دەکرد، یەکی لە نیشانەکانی وەلی ئارامگرتنە لەسەر ئازاری خەڵك و لێبوردنیانە)).[4]

---

١ الحشر / ٩

٢ الفتح الرباني، المجلس / ٣٨.

٣ سەرچاوەی پێشوو، کۆڕی ١٢.

٤ سەرچاوەی پێشوو، کۆڕی ٥٣.

کورتەی قسە:

هەرچەند گەورە بێ بەلا خوا دەیگۆڕێ بەنیعمەت
هەندێ کەسیش بەنیعمەت خودا ئەزمونیان دەکات

**نەرم و نییانی**: پێشتر نەرم و نیانی شێخ عبدالقادرمان بینی هەرکە شێخەکەی حومادی دەباس خستیە ناو زێی دیجلەوە و توورە نەبوو. جوبەکەی گوشی و لەبەری کردو بەدوایان کەوت، هەروەها ئەو کاتەی قوتابیەکانی شێخ دەباس گاڵتەیان پێی دەکرد و خراپەیان دەدا پاڵی، لێیان زویر نەدەبوو، تاشێخەکەیان لەو کارە قەدەغەی کردن. نەرم و نیانی سیفەتی پیاوە مەزنەکانە بە درێژاییی ڕۆژگار، یەکێکە لە سیفەتەکانی پێغەمبەرایەتی، هەر ئەو سیفەتە بوو کە (ئەحنەفی کوڕی قەیس و قەیس کوڕی عاسم) و ئەوانیتری کردە دەسەڵاتدار لەناو میللەتەکان.

شێخ دەڵێ: ((تەنیا خواناس-عارف- لە رووی بەدکار پێدەکەنێ، بەڵێ فەرمانی پێ دەکاو نەهی لێ دەکاو بەرگەی ئازاردانی دەگرێ، تەنیا خواناسەکان ئەو توانایەیان هەیە، چۆن رەحم بەگوناهباران ناکەن خۆ ئەوان شوێنی رەحمەتن و مەقامی تۆبە و تەوازۆ خواستنن، ئاکاری عاریف لە ئاکاری پەروەردگاری مەزنە و لە کۆششدایە بۆ دەربازکردنی گوناهبار لە دەستی شەیتان و نەفس و ئارەزوو، ئەگەر یەکێ لەئێوە کوڕەکەی لای گاورێ دیل بێت، ئایا هەوڵی رزگارکردنی نادا، عاریفیش بەمجۆرەیە و هەموو خەڵکی لەلا وەك کوڕی خۆیەتی)).[1]

**خۆ پارێزی و وەرع**: هەموو کاروبارەکانی شێخ عبدالقادر بەڵگەی خۆ پارێزی و وەرعی ئەون، هەر لەو کاتەی کە لە گەیلان چاوی هەڵێناوەو پێگەییوە، چونکە لە بنەماڵەیەکی خواناس و دایك و باوکێکی پاك و چاك و باپیرەیەکی زاهید پەیدا بووە، وەرعی لە سەر چاکە و ئاکاری چاك پەروەردەی کردووە، وەرعی لە سەفەرەکەی نێوان گەیلان و بەغدا دەرکەوتووە، کە درۆی نەکرد و دانی بەوەدانا

---

١ الفتح الرباني، المجلس / ٥٣.

کەچل دیناری لایە، هەروەها لە بەغدا بەدەرکەوت هەر کە لە خشتەبەرەکانی دنیای بەو هەموو زۆرییەوە نەیانتوانی کاری تێ بکەن، لەترسی لەناوچوونی ئایینەکەی هەولی دا لەبەغدا هەلبێ، دوایی وەرعەکەی بەسەر ئارەزوویدا زالبوو و خۆیگرت و سەرکەوت، دوای ئەمە هەر کە دنیا هاتە ناودەستی وەرعەکەی بەدەرکەوت و لای لێ نەکردەوە و هیچ هەلسوکەوتێکی نەگۆڕی و بەلکو ئەو هەموو سامانەی بۆ خواردنی هەژاران و بەهانا هاتنی لێقەوماوان و داکردنی سەر لێ شێواوان و ڕێبواران خەرج کرد.

کورتەی قسە ئەوەیە، کە ئاکاری شێخ عبدالقادر وەکو ئاکاری وەلی و پیاوچاك و ڕاستگۆیانی پێشینە چاکەکان بوو، بۆیە میر و پاشایەکان لێی دەترسان و خەلکی بە شێخی خۆیان دادەنا و کۆمەلەیان لەسەر دەکرد تا جێیان تەنگبوو، لە هەندێ لە کۆڕەکانی چوارسەد شووشە مەرەکەب دادەنرا و قسەکانیان دەنووسیەوە و جاری واهەبوو حەفتا هەزار کەس ئامادەی ئەو کۆڕانە دەبوون،[1] دوور و نزیکیان وەکو یەك گوێیان لێ دەبوو. شێخ زۆر کاری دەکردە سەر گوێگرەکانی، بۆیە زۆر جاران فرمێسك لەکۆڕەکانی دادەباری و دەنگی گریان بەرز دەبوویەوە. جارێکیان عبدالوهابی کوڕی لەجیاتی باوکی ئامادەی کۆڕەکە بوو، نە دلۆپە فرمێسکێ ڕژاو نەکەس گریا، هۆی ئەمەی لەباوکی پرسی، باوکی پێی گوت: چونکە تۆ کە وانەکەت دەگوتەوە یارمەتیت لە زانستەکەت وەردەگرت، بەلام من لە خوا یارمەتیم وەردەگرت و سەیری خوام دەکرد.[2]

ئێستا دوای ئەوەی شارەزای سیفەتەکانی شێخ عبدالقادر بووین، بابزانین صۆفیگەری و زانستی پاککردنەوەی دەروون چییە: بۆ پەیدابوو؟ چۆن پەیدابوو؟ چۆن پەرەی سەند؟ ڕاستییەکەی چییە؟ حەقیقەتەکەی چییە؟ سوود و پێویستییەکانی بۆ کۆمەلگا چییە؟

---

١ قلائد الجواهر، ص ١٥.

٢ کتێبەکەی محەمەدی عەینی، ل ٦٨.

# بەشی دووەم

## زانستی دەروون پاککردنەوە «تزكية النفس»

### پەیدابوون و پەرەسەندن و پێویست بوون بۆ کۆمەڵگا

### سەرهەڵدانی زانستی تەزکیە:

ئاینی ئیسلام هات بۆ ئەوەی هەموو بوارەکانی ژیان بگرێتەوە لە پەرستن و معامەلەکان و هەڵس و کەوت دەروون و ئاکار. ئیسلام بە بینایەکی تەواوەوە هات و چەند بنەمایەکی هەیە وەکو: شایەتمان و نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج بۆ ئەو کەسەی توانای چوونی هەبێ، بنەماکانی ئیمانیش ئەمانەن: بڕواهێنان بە خوای مەزن و فریشتە و کتێب و پێغەمبەرەکان و ڕۆژی بەپابوونوە و قەدەر بە چاك و خراپیەوە. مەقامێکیشی هەیە، کە مەقامی ئیحسانە، مەقامی بە دڵ بینین و چاودێریکردنی خوای گەورەیە، ئەگەر بنەماکان بەتین بوون، ئەوا ئەوەی کە لە سەری بنیات دەنرێ بەتین دەبێ وەکو: هەڵس و کەوت و دەروون و ئاکار، ئەگەر ئاینی ئیسلام بەدرەختێ دابنێین، ئەوا بنەماکانی دەبنە ڕەگ و قەد و لقەکان، بەرەو گەڵاکانیش بریتی دەبن لە هەڵسوکەوت و دەروون و ئاکار، هەرچەندە رەگ و قەدو لقەکان بەهێز بن، بەر و گەڵاکان تەڕ و پێگەیشتوو دەبن.

ئاینی ئیسلام بە دەسەڵات و قورئان بەڕێوە دەچێ، ئەم دوانە لە سەرەتای ئیسلام بەیەکەوە بوون، چونکە خەلیفە لە هەمان کاتدا شارەزایی لە قورئان و یاساکانی هەبوو، دوایی بەرە بەرە لێك جودا بوونەوە.

یەکەم شت کە جودا بوویەوە حوکم(قضـــاء) بوو، دوایی مەقامی ئیحسان و چاودێری هێدی هێدی جودابوونەوە لە دوای خەلیفە راشیدیەکان، فەرمان ڕەواو میللەت بەرەبەرە لە ڕێبازی محەممەدییان لادا و بەرەو زگ گەورەیی ڕۆیشتن، حەزرەتی عائیشە (خوای لێ‌ڕازی بێت) دەفەرموێ: ((**أوّلُ بَلاَءٍ حَدَثَ فِي هَـــذِهِ الأمَّة بَعْدَ نَبِيِّهَا، الْشَّبَعُ، فَإنَّ الْقَومَ لَمَّا شَبِعَتْ بُطُونُهُمْ سَمِنَتْ أبْدَانُهُم، فَضَعُفَتْ قُلُوبُهُم وجُمِحَتْ شَهَوَاتُهُم**: یەکەم بەلا لەم میللەتە لە دوای پێغەمبەرەکەی ڕوویدا تێر بوون بوو، چونکە کە زگیان تێر بوو لەشیان قەڵەو بوو، بۆیە دڵیان کز بوو و ئارەزوویان بەسەریاندا زاڵ بوو.))[1]

دوای ئەمە دەستیان بە ساختمان دروست کردن و ڕازاندنەوەی کرد و قورئان بەرە بەرە لە دەسەڵاتداران جودا بوویەوە، جگە لە چەند ماوەیەکی کەم نەبێت وەکو سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزﷺ، بەڵام خەلیفەکان بە گشتی سەریان بۆ زاناکان دادەنواند و گوێیان بۆ ئامۆژگاریەکانیان شل دەکرد. دوای ئەمە یەکە یەکە داوەکانی تەونی ئیسلام هەڵوەشایەوە و یەکەم شت مەقامی ئیحسان و چاودێری بوو، بەڵام خەڵکی هەستیان پێی نەکرد، چونکە پەیوەندیی بە ئەندامە دیارەکانەوە نییە، کێشەکانی ژیان دوای جەنگەکانی ڕزگار کردن زۆر بوو، بەهۆی ئەمەش جیاوازی کەوتە نێو زاناکان لەبابەتی پەرستن و معاملەکان، ئەمە لە کردەوە دیارەکانە، کە هەموو مرۆڤێ هەستی پێدەکات، بۆیە زانایەکان پێشیان لێگرتەوە و فیقهی پەرستن و معامەلەکانیان نووسیەوە. بەمجۆرە ڕێبازە فیقهیەکان پەیدا بوون، ئینجا زانستی عەقیدە وەکو زانستێکی سەربەخۆی لێهات و ناوی لێنرا: زانستی یەکخواپەرستی، یا زانستی کەلام، یان زانستی عەقیدە. بەتایبەتی دوای ئەوەی فەلسەفەی یۆنانی دەستی خستە ناو کاروباری ڕۆشنبیریی ئیسلامی، لە کۆتاییدا لقەکانی زانستی شەرعی، کە پەیوەندییان بە کردەوەی دڵەوە هەیە جودا بوویەوە و زانستێکی تایبەتی بۆ پێکهات کە: زانستی صۆفیگەری، یان ئاکارە.[2]

---

١ الترغیب و الترهیب للمنذري.

٢ سەیری کۆ زانیاری فیقهیی کوێتی بکە، ب ١، ل ١٢، ١٣.

لەگەڵ ئەوەی کە شەرعی ئیسلامی هەموو ئەم زانستانەی دەگرتەوە بێ جیاوازی، واتا: زانستی صۆفیگەری شتێکی تازە نەبوو لەناو زانستە شەرعیەکان، بەلام سەربەخۆیی خۆی وەرگرت و ئەم ناوەی لێنرا، پەندیش لەمەبەست و واتا دایە، نەك لە دەستەواژە و دارشتن.

ئیسحاق نیوتن (١٦٤٣-١٧٢٧) لە زانستی فیزیادا یاسایەکی دۆزیەوە، کە پێی دەگوترێ یاسای کاردانەوە، دەڵێ هەموو کارێ کاردانەوەیەکی هەیە، کە لە تواناداد یەکسانە بەو لە ئاراستەدا پێچەوانەیەتی، ئەگەر تۆپێك فرێ بدرێتە سەر زەوی بە هێزێکی یەکسان بەکەوتنەکەی هەڵدەبەزێتەوە و بە پێچەوانەی ئاراستەی یەکەم، ئەم حاڵەتە کەلە فیزیا روودەدا لە هەموو کارو بارێکی تریش وایە، تەنیا لەکارو باری دەروونیش، بەلام کاردانەوە لە کاروباری دەروونی تەنیا پەیوەندیی بەهێزی کارەکەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەهەستی کەس و تەندروستیی دەروونی و هێزی کەسێتییەوە هەیە.

لە کورتەیەکی باری کۆمەلایەتی باسی ئەوەم کرد، کە موسڵمانەکان دوای سەردەمی خەلیفە راشیدیەکان دنیا فریوی دان، هەر ئەمە بوو کە پێغەمبەرﷺ لێی دەترسا، لەسەردەمی وەلیدی کوری عبدالملیکەوە ئەم دنیاویستییە سەری هەڵدا، ئینجا ئەم بارە لەسەردەمی یەزیدی کوری عبدالملك زۆر بەخێرایی چووە پێش، تا گەیشتە رادەی بە فیرۆدان و ئیسراف و خەرجکردن لەشتی ناشەرعی، بەتایبەتی خەرجکردن لە: شاعیران و ئافرەتی گۆینده و گۆرانی بێژان و کرینی خولام و کۆری خواردنەوە، لەگەڵ ئەمەش رەزیلی و بەهانا نەهاتنی هەژاران سەری هەڵدا. ئەم کارە لای هەندێ پیاوچاکان کاردانەوەی پێچەوانەی لێ پەیدابوو، ئەمەش لە رووی توندی و کزییەوە بە پێی کەسەکان جیاوازیی هەبوو. بەلام ئەو پیاوچاکانەی، کە فیقهیان خوێند و چاك لێی شارەزا بوون وەکو شێخ عبدالقادری گەیلانی و ئەوانی وەك ئەو، کاردانەوەکەیان لە چوار شەرع تێنەپەری، کەچی ئەوانەی توانایان بەسەر فیقهدا نەشکا کاردانەوەیان بەرەو هەندێ بیدعە چوو، کە لە دەرەوەی شەریعەت بوو.

لە کتێبی (کشف الظنـــون)ی حـاجی خەلیفە هـاتووە: کە ئـەبو هـاشمی صۆفی (١٥٠ ك مردووە) یەکەمین کەس بوو ناوی لێنرا (صۆفی)، سوفیانی ثەوری دەڵــێ: ئەگەر ئەبو هاشمی صۆفـی نەبوایە ریـای نـهێنی نـەدەزانرا.[1] جـابری کـوڕی حـەیانی کووفی(١٦١ ك مـردووە) پێـی دەگوتـرا جابیری صۆفـی. دەگێڕنـەوە کـە محەممـەدی کــوڕی واسـیع چـووە لای قوتەیبــەی کــوڕی موسـلیمی والی خوراســان (٩٦ ك مردووە) کە جوببەیـەکی دانـەخراوی خوریی لەبەر بـوو، پێی گـوت: بۆچی ئەمە لەبەر دەکـەی؟ وەڵامــی نەدایــەوە، پێـی گــوت: قسـەت لەگـەڵ دەکـەم وەڵامـم نادەیتەوە؟ گوتی: حەزناکەم بڵێم لەبەر زوهدە، چونکە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی نەفسـم تەزکییە بکەم، حەز ناکەم بڵێم لەبەر هەژارییە، نـەخۆ ببێتـە هـۆیٰ ئـەوەی سکاڵا لـە خوا بکەم، وەڵامت تەنیا دەنگ نەکردنە.

لە کتێبی (البیان و التبیین)ی جـاحظ(٢٥٥ ك مـردووە) هـاتووە، کـە محەممـەدی کـوڕی قاسـم بـە صۆفـی ناوبـانگی دەرکـردووە، چونکـە هـەر خوریـی سپیی لەبـەر دەکرد و زانایەکی ئایندار و زاهیدێکی رێباز چاك بوو، بانگەوازی بـۆ دادپـەروەری یەکخواپەرستی (العدل و التوحید) دەکرد.

یەحیای کوڕی ئەکسەم لە کتێبی (مروج الذهب)ی مەسـعودی دەڵێـت پیـاوێك داوای کرد، کە بچێتـە لای مـەئمون (٢١٨ ك.م) بـۆ رووبەڕووبوونـەوە(المنــاظرة) کراسێکی سپیی ئەستوری لەبەر بوو، گوتی زانیم یەکێکە لە صۆفییەکان.

بەڵام شێخ ئیبن تەیمییـە لـە کتێبـی (فتـوی)یـدا دەڵــێ: ((بـەڵام بـەرگی خــوری، پێغەمبەرﷺ لە سەفەر جوببەی خوریی لە بەر دەکـرد، بۆیـە ئـەوزاعی گوتـی: بـەرگی خوری لەسەفەردا سوننەتە و لە ماڵێدا بیدعەتە، واتا: لە شار و ماڵـی خۆت جوببەی خوری لەبەر بکەیت بیدعەیە، هـەروەك لـە محەممـەدی کـوڕی سیرین دەگێڕنـەوە کـە بۆیـان گێڕاوەتـەوە: هـەندێ گـروپ بـەرگی خـوری لەبـەر دەکـەن، گوتـی: وابـزانم

---

[1] کتێبی (اللمع في التصوف) ل ٤٢.

ئەوانە بیستوویانە حەزرەتی مەسیح(عليه السلام) خوریی لەبەرکردووە بۆیە لەبەریان کردووە، ڕێنوێنیی پێغەمبەری خۆمان لە ڕێنوێنیی تر لامان خۆشەویسترە. لە کتێبی (السنن) هاتووە، کە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) بە بەرگی خوری ئامادەی نوێژی هەینی دەبوون. ئەمە واتای ئەوەیە کە خوری لە بەرکردن بکرێتە خواپەرستی و ڕێگای گەیشتنە خوا بیدعەیە، بەڵام لەبەرکردنی بۆ پێویستی و لەبەر نەبوونی جل و بەرگ، هەژار سوودی لێ وەربگرێ کارێکی چاك و ڕەوایە))[1].

بە هەر حاڵ هەندێ لە صۆفییەکان لە بەر زوهد خورییان لەبەر دەکرد، دوای ئەوەی (صوّفي) بووە ناوی صۆفیەکان، هەرچەندە پێیان ناخۆشبوو. خۆیان ئەو ناوەیان لە خۆ نەنا، بەڵکو بە سەریاندا چەسپێنرا، دوای ئەمە بە هێوری بەرگی خوری لە جل و بەرگیان دوور کەوتەوە و ناوی بووە ناویان و صۆفیگەری بووە هەڵسوکەوتێکی تایبەتی لە ژیان و خۆیان بە لە بەرکردنی خوری پابەند بوون و جاری واهەبوو لە بەریان دەکرد و جاری واش هەبوو بەرگی تریان لە بەردەکرد، پێشتر بینیمان، کە شێخ عبدالقادر هەر کە قوتابیەکی هەژار بوو جوبەی خوری لە بەردەکرد و چۆن کەوتە ناو ڕووباری دیجلەوە، دوای ئەوەی کە بووە مامۆستا و باری ئابووریی بەرەو چاکی ڕۆیی، هەموو جۆرە بەرگێکی لەبەر دەکرد، جاری واش هەبوو بەنرخترینیانی لەبەر دەکرد، سەیریکە دەڵێ: ((صۆفیگەری لە بێگەردییەوە(صفاء) وەرگیراوە نەك لە پۆشینی خوری(صوف)، صۆفیی ڕاستگۆ لە صۆفیگەریەکەی دڵی لە هەموو شتێ پاك دەبێتەوە جگە لە خوا، ئەمەش بە گۆڕینی جل و بچووك کردنەوەی دەم و چاو و زۆر گوتنەوەی حەکایەتی پیاوچاکان و پەنجە هەڵتەکاندن لە تەسبێحات و سەڵاوەت لێدان نابێ، بەڵکو لە ڕاستگۆیی گەڕان بە دوای خوا و زوهد لە دنیا و دەرکردنی خەڵك لە دڵ و تەنیا پەیوەندی بەستن لەگەڵ خوا دەبێ))[2]، هەروەها دەڵێ: ((ئەی ئەو کەسەی خوریت پۆشیوە، ئایا ئەم پۆشینە بۆ نەهێنیت و دڵ و دەروونت و لەشت نییە، سەرەتای زوهد لە

---

١ فتاوى ابن تيمية، كتاب التصوف، ج ١١، ص ٥٥٤.

٢ الفتح الرباني، المجلس ٢٥، ص ١١٥.

هەناوە نەك لە جل و بەرگ، گەر نهێنی بێگەرد بوو بێگەردییەکەی بۆ دڵ و دەروون و ئەندامەکان و خۆراك و پۆشین دەچێت، هەموو حاڵەکانت دەگرێتەوە، سەرەتا ناو خانووەکە ئاوەدان دەکاتەوە، کە ئەمە تەواو بوو، ئینجا بەرەو ئاوەدانکردنەوەی دەرگا دەچێت)).[1]

چەند خوری پۆش هەیە، کە هیچ هەڵسوکەوتێکی ئیسلامی نییە، چەند کەسی تر هەن کە خوری پۆش نین و صۆفیی مەزنن .

کەواتە صۆفیگەری چییە، (یان زانستی تەزکیە چیە)؟ سروشت و سنوور و رێبازەکەی چییە؟

صۆفیەکان پێشتر بنەما و هێڵەکانی رێبازەکەیان دیاری نەکردووە و پێشرەوە سەرەتاکانیان بیریان لەم ناوە نەکردۆتەوە و خۆیان بۆ خۆیان نەویستووە، بەڵکو خەڵکی ناویان لێناون گەر پێشیان ناخۆش بووبێ، هیچ بیریان لەبنەماو رێبازەکان نەکردۆتەوە و هەموو هەوڵیان گەڕانەوە بووە بۆ سەر کانگای بێگەردی ئیسلام و ژیننامەی پێغەمبەرﷺ و یار و شوێنکەوتووەکانی هەر کە بینییان کە کۆمەڵگای ئیسلامی لە ڕاستەشەقامی لاداوە، دوای ئەمە بە هیوای ئەوە بوون خەڵکی پەیڕەوییان بکەن و لە دوایان برۆن، بۆ ئەوەی لە رێگەی شەیتان رزگاریان بکەن.

## راستیی صۆفیگەری یا زانستی تەزکیە :

ئەگەر ویستمان لە صۆفیگەری و ڕاستییەکەی بگەین ئەوا دەبێ گۆتەی هەندێ لە کەڵەپیاوانی صۆفیگەری بخەینە روو، چونکە خۆیان زیاتر شارەزای پێڕەو و هەڵس و کەوتەکانی صۆفیگەرین، ئەم زانیاریانەش لە کتێبی (طبقات الصوفیـة)ی ئەبی عبدالرحمنی محەممەدی کوڕی حوسێنی سوللەمی و (٣٢٥ ٤٠٨ ك) وەرگیراوە.

---

١ سەرچاوەی پێشوو، المجلس ٢٤، ص ١١١.

## گوتەی کە لەپیاوانی صۆفیگەری:

فوزەیل کوڕی عەیاز (ت سالی ١٨٧ك): ((کەس لە ئێمە بە زۆر نوێژ و ڕۆژوو نەگەیشتە پلە و پایەکەی، بەڵکو بە بەخشندەیی دەروون و سەلامەتی سینگ و (دڵ) ئامۆژگاری خەڵکی.[١]

بیشری حافی (ت سالی٢٢٧ ك.): ((حەڵاڵ هەڵە و بێ ئاگایی هەڵناگرێ)).

سرِیی سەقەتی (ت سالی ٢٥١ ك): ((سوننەتێکی کەم لە بیدعەیەکی زۆر باشترە)). ((بەهێزترین کەس ئەوەی بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ دەبێ، هەرکەسێ نەتوانێ خۆی پەروەردەبکا بۆ خەڵکی تر هەر ناتوانێ)). ((ئەوەی لە خوا بترسێ، هەموو شتێ لێی دەترسێ)). ((ئەگەر مرۆڤ بە خوا پەرستی دەستی پێکرد، ئینجا حەدیس نووسی لە سەر خواپەرستییەکە سارد دەبێتەوە، بەڵام گەر بە حەدیس نووسین دەستی پێکرد، دوایی خەریکی پەرستنەکان بوو، ئەوا دەچێتە ناویەوە)).[٢]

ئەبو سلێمانی دارانی (ت سالی ٢١٥ ك): ((لەوانەیە وردەکارییەکی صۆفیگەریەکان بکەوێتە دڵمەوە، بەڵام بە دوو شایەتی ڕاستگۆ نەبێ وەری ناگرم، شایەتەکانیش: قورئان و فەرموودەیە)). ((ئەگەر دڵ برسی و تینوو بوو پاك و بێگەرد دەبێت، ئەگەر تێر و تێراو بوو کوێر دەبێ))[٣].

حاتەمی ئەسەم (ت سالی٢٣٧ك): ((لە خزمەتی خوای خۆت بە دنیا بە ناچاری بۆت دێ و بەهەشتیش بە عیشقەوە)). ((لە سێ بار بەڵێن لەگەڵ نەفست ببەستە: گەر کارێکت کرد بیر لەوە بکەوە خوا سەیرت دەکا، گەر قسەیەکت کرد بیر لەوە بکەوە خوا گوێ لێتە، ئەگەر حەسایتەوە بیر لەوە بکەوە خوا ئاگادارتە)).[٤]

یەحیای کوڕی مەعازی رازی (ت سالی ٢٥٨ ك): کوڕانی دنیا کەنیزە و بەندە خزمەتیان دەکەن، کوڕانی ڕۆژی دوایی پیاوچاك وئازادەکان خزمەتیان دەکەن)).

---

١ طبقات الصوفية، ص ١٠.

٢ طبقات الصوفية، ص ٥٢.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٨.

٤ سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٧.

((ئەوەی دەوڵەمەندییەکەی لە هەوڵدانی بێ هێشتا هەژارە، ئەوەی لە دڵەوە دەوڵەمەند بێ، هێشتا دەوڵەمەندە، ئەوەی لە پێویستییەکانی بۆ لای خەڵکی بچێت هێشتا بێ بەشە)).

سەهلی کوڕی عبداللەی توستەری (ت سالی ٢٨٣ ك): ((بنەماکانمان حەفت شتە: پابەند بون بە قورئان، پەیڕەویکردنی سوننەتی پێغەمبەرﷺ، خواردنی حەلاڵ، وازهێنان لە ئازار دان، دوورکەوتنەوە لە تاوان، تۆبەکردن، بەجێهێنانی مافەکان)). ((یادکردنەوەی خوا لەکاتی نووستندا ئەمەیە: خوام لەگەڵە، خوا سەیرم دەکا، خواشایەتمە یازدەجار)).[1]

ئەبو بەکری وەڕاق (ت سالی ٢٤٠ ك): ئەوەی بەبێ زوهد و فیقە لەبارەی زانستەوە بدوێ تووشی زەندیقی دەبێ، ئەوەی بێ فیقهو کەلام تەنیا زاهید بێ تووشی بیدعە دەبێ، ئەوەی فیقهی بێ زوهد و کەلامی هەبێ بەدکار دەبێ؛ ئەوەی لەو کاروبارانەدا وردو لێهاتوو بوو رزگاری دەبێت).[2]

ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی ئەلخەواس (ت سالی ٢٩٠ ك): ((دەرمانی دڵ پێنج شتە: خوێندنەوەی قورئان بە تێگەیشتنەوە، بەتالیی زگ، هەستانەوە بەشەو، پاڕانەوە لە کاتی بەیانی، هاوڕێیەتی پیاوچاکان)).[3]

جونەیدی کوڕی محەمەد، ئەبولقاسم (ت سالی٢٩٧ ك) هاوڕێیەتیی (سرپی سەقەتیی) خالی و حاریسی موحاسیبیی کردووە، فیقهی لای ئەبێ ثەور-خاوەنی یەکێ لە ڕێبازەکانی ئەهلی سوننەو جەماعە- خوێندووە، جونێد گوتی: ((ڕێگاکانی بەردەم خەڵك هەموو داخراون تەنیا ئەوەی شوێن پێی پێغەمبەرﷺ هەڵگرێ و پەیڕەویی سوننەت و ڕێبازەکەی بکات، چونکە هەموو ڕێگاکانی چاکە لە پێغەمبەرﷺ کراونەتەوە)). ((صۆفیگەری بالابوونە بۆ هەموو ئاکارێکی چاك و

١ طبقات الصوفية، ل ٢١٠.
٢ سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٢٤.
٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٦.

لادانـە لەهـەموو ئاکـارێکی بـەد))[1]. ((ئـەم ڕێبازەمـان بـە بنـەماکانی قورئـان و فەرموودەوە بەندە)). ((ئـەم زانستەمان لەسەر قورئـان و فـەرموودە بـەندە، ئـەوەی قورئان نەخوێنێ و فەرموودە نە نووسێ لەم ڕووەوە پەیڕەویی ناکرێت))[2].

ئەبو حوسێنی وەڕاقی نیسابوری محەممەدی کوڕی سەعد (ت سالّی ٣٢٠ ك): ((بەندە بەخوا نەبێ ناگاتە خوا و بە پەیڕەویکردنی شەریعەتی خۆشەویستەکەیﷺ، ئەوەی ڕێگەی گەیشتنی بە پەیڕەوی نەبێ گومڕایە گەرچی واتێ بگـا ڕێگـای دۆزیوەتەوە))[3].

ئیبراهیمی کوڕی داودی قەسار (ت سالّی٣٢٦ ك): ((نیشانەی خۆشەویستی خوا گوێڕایەڵیی ئەوو پەیڕەویکردنی پێغەمبەرەکەیتی))[4].

ئەبو بەکری کەتتانی محەممەدی کوڕی عەلی (ت سالّی٣٢٢ ك): ((صۆفیگەری ئاکار و ڕەوشتە، ئەوەی ئاکاری زیاتر بوو صۆفیگەریی لە تۆ زیاتر دەبێت))[5].

ئـەبو القاسـم ئیـبراهیم کـوڕی محەممـەدی نەسـربازی (ت سـالّی٣٦٧ ك): ((بنجینەی صۆفیگەری پابەندبونە بـە قورئـان و فـەرموودە، وازهێنانـە لـە ئـارەزوو و بیدعە، ڕێزگرتنێکی زۆری مامۆستا گەورەکانە، بینینی بیانووەکـانی خەڵکـە، چـاك هاوڕێیـەتیکردنی هاوڕێیـان و خزمەتکردنیانـە، بـەکارهێنانی ئاکـاری جوانـە، بەردەوامبوونە لەسەر ویرد خوێندن، دوور کەوتنەوەیە لە تەئویل و ڕێگادان، ئـەوەی سەرەتای ئەم ڕێگەیەی پیس نەبێ ڕێی لـی بزرنابێ، چونکە ئەگەر سەرەتای ڕێگـەی صۆفیگەری پیس بوو کار لەکۆتاییەکەی دەکات))[6].

ئەبو حامیدی غەزالی (ت سالّی٥٠٥ ك): ((هەموو هەڵسـو کەوتێکی دیـار و نادیاری صۆفیەکان لە نـوری چـرای پێغەمبەرایەتییـەوە وەرگیراوە، جگـە لـە نـوری

---

١ طبقات الصوفية، ل ١٥٩.

٢ فتاوى ابن تيمية، ج ١٠، السلوك، ص ٤١٢ و ج ١١ التصوف، ص ٢١٠.

٣ طبقات الصوفية، ص ٢٩٩.

٤ سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢١.

٥ طبقات الاولیاء، ص ١٤٥.

٦ طبقات الصوفية، ص ٤٨٨.

پێغەمبەرایەتیﷺ لەسەر زەوی هیچ نورێك نییە روناکیی لێ وەربگیرێت)).[1]

عبدالقادری گەیلانی (ت سالّی ٥٦١ ك): ((هەموو حەقیقەتێ گەر شەریعەت شایەتیی بۆنەدا زەندیقە، بە هەر دوو باڵی کتێب و فەرمووده بەرەو خوا بفڕە و بڕۆلای و دەستت لەناو دەستی پێغەمبەرﷺ بێت، واز هێنان لە خوا پەرستییەکان زەندیقییە، کردنی خراپەکاری تاوان و گوناهە)).[2]

ئەمە هەندێ گۆتەی پێشەوا صۆفیەکان بوو، دەبینین هەمووی لە تەوەری کتێب و فەرمووده دەسوڕێتەوە و هەمووی داوای ئاکاری چاك و ترسان لەخوا و رەزامەندیی دەکا، داوای بەخشندەیی و بێفیزی و خواردنی حەڵاڵ و ئازارنەدان و دورکەوتنەوە لە گوناهان دەکا. هەروەها داوای پشتگوێ نەخستنی کاروباری دنیا دەکا بەپێی پێویست، هانی کۆکردنەوەی فیقهو صۆفیگەری دەدا لەگەڵ یەکتری، چونکە تەواوکەری یەکترین و بەم شێوەیە ژیانێکی کامڵمان بۆ دەڕەخسێنێ وەکو لە ژیانی پێغەمبەرﷺ و یاسانی، ئایا ئەمە چ دژایەتییەکی لەگەڵ شەرعی پیرۆزدا هەیە؟

## گۆتەی زانایان لەبارەی صۆفیگەریی :

ئێستا بابزانین هەندێ زانای کۆن و نوێ چییان لەبارەی صۆفیگەرییەوە گوتووە:

شافیعی رەزای خوای لێ بێ (ت سالّی ٢٠٤ ك): ((لە دنیاتان سێ شتم لاخۆشەویستکراوە: زۆر لە خۆنەکردن، هەڵسوکەوت کردنی خەڵکی بە نەرم و نیانی، پەیڕەویکردنی رێبازی صۆفیەکان))[3] شافیعی رێزی لە (شەیبانی راعیی صۆفیی) دەناو گوێی لێ دەگرت.[4] هەروەها گوتوویەتی ((خۆت خەریکی زوهد بکە، چونکە زوهد بۆ زاهید جوانترە لە خشڵی سەر سینگ... ئەوەی حەز دەکا

---

١ المنقذ من الضلال، ص ١٣١.

٢ الفتح الرباني، المجلس: ٥٤، ص ١٧٩.

٣ كشف الخفا للعلجوني، ج ١، ص ٣٤١.

٤ مقدمة الطبقات الكبرى للشعراني.

خوا دڵی بکاتەوە و زانستی پێ ببەخشێ، با بچێتە خەڵوەوە و کەم بخوا و لەگەڵ گەوجان تێکەڵ نەبێ.. چاکترین کردەوە سیانە: یادکردنەوەی خوا و دڵدانەوەی برایان و بەویژدانی لەگەڵ خەڵك لەلایەن خۆتەوە))[1].

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕەزای خوای لێ بێ (ت ساڵی ٢٤١ ك):

گوێی لە (شەیبانی راعی) دەگرت، هەروەها گوێی لە (حەمزەی بەغدایی) دەگرت و پرسیاری وردەکارەکانی لێدەکرد و دەیگوت: لەبارەیانەوە چی دەڵێی؟ هەروەها بەکوڕەکەی گوت: کوڕم لەگەڵ ئەم گروپە دابنیشە، چونکە ئەوانە بە زۆریی زانست و چاودێری و ترس و زوهد و هیمەت بەرزی لەسەر ئێمەیان زیاد کردووە.[2] لەو کاتە ئەمەی گوت هەرکە بووە هاوڕێی ئەبو حەمزەی بەغدایی. ژیانەکەی ژیانی صۆفییەکی زاهید بوو، وەکو زاهیدان دەژیا و لە بەرهەمی کاری دەستی و زەویەکانی دەخوارد، دیاری و بەخششی خەلیفەکانی وەرنەدەگرت و خواردنی نەدەخواردن.

عزالدین کوڕی عبدالسلام سوڵتانی زانایان (ت ساڵی ٦٦٠ ك): لێی دەگێڕنەوە کە ڕێبازی صۆفیگەریی لە شهاب الدینی سەهرەوەردی لە بەغدا وەرگرتووە، هەروەها لە ئەبی حەسەنی شازلی لەمیسر، دەیگوت: ئیسلامی تەواوم نەدەزانی تەنیا دوای کۆبوونەوەم لەگەڵی، واتا: بە ئەبو حەسەنی شازلی.[3] هەروەها دەیگوت: گروپی صۆفییەکان لەسەر چەند دەستورێکی شەریعەت وەستاوە، کە لە دونیاو دوایی نارمێ.[4]

ڕەحمەتی خوای لی بێ بەرامبەر بیدعە وستەم و و توغیانی پاشا و دەسەڵاتداران، وەکو کێوێکی پتەو بوو، هێرشی کردە سەر ساڵح ئیسماعیلی پاشای دیمەشق هەر

---

١ بستان العارفين للنووي، ص ١٠٣، ١٣٠.

٢ مقدمة الطبقات الكبرى للشعراني، تنوير القلوب للشيخ أمين الكردي، ص ٤٠٥.

٣ لطائف المنن و الاخلاق للشعراني، ص ٥٠.

٤ نور التحقيق للشيخ حامد صقر، ص ٩٦.

که لەگەڵ خاچییەکان ڕێك کەوت، پاشا لە دیمەشق دەری کرد و چووە میسر، یەکێ لە پیاوەکانی پاشا بەدوای کەوت، تا قایلی بکات، پێی گوت: پاشا لێت دەبورێ و دەهێڵێ بگەڕێیتەوە گەر دەستی ماچ بکەیت، پێی گوت: ئەی هەژار بەخوا قایل نیم ئەو دەستم ماچ بکا چ جای ئەوەی من دەستی ئەو ماچ بکەم، خەڵکینە ئێوە لە دۆڵێکن و من لە دۆڵێکم.[1]

ئەبو یەحیا زەکەریای کوڕی شەرەف الدینی نەوەوی (ت ساڵی٦٧٦ ك.): ئاڵای زانست و کاراو زاهید، خاوەنی دانراوی زۆر هەرچەندە تەمەنی لە چل و پێنج ساڵ تێنەپەڕیبوو. تەنیا لەو خواردنەی دەخوارد، کە کەس و کاری لە شارۆچکەی (نوا) بۆیان دەنارد، ئەمەش لەترسی ئەوقافی شاری دیمەشق و موڵکە زەفتکراوەکانی، جل و بەرگی کراسێکی جاو بوو، ڕێبازی صۆفیگەریی لەشێخ یاسین کوڕی عبداللهی مەغریبی حەجام[2] وەرگرتووە، لەسەر حەق گوێی نەداوەتە سەرزەنشتی کەس. لە کتێبەکەی (بستان العارفین)دا باسی گەلێ دەنگوباسی صۆفیەکان و کەرامەتیانی کردووە لەوانە: (سرِی سەقەتی) و (سەهل کوڕی عبداللهی التستری) و (شەهاب الدینی السهروردی) و هیتر.

ئیمامی شاطبی خاوەنی کتێبی (الاعتصام) لە (ت ساڵی ٥٩٠ك): گوتی ((لە دوای شوێنکەوتوان بیدعە پەیدابوو و هەر گروپێ داوای ئەوەی دەکرد کە زاهید و خوا پەرستیان تێدایە، تەنیا تایبەتەکانی ئەهلی سوننەت بەناوی صۆفیگەری دەرکەوتن و هەردەم نەفسیان لەگەڵ خوا بوو و دڵیان لە بێئاگایی دەپاراست، جا رامێنە قازانج دەکەی، خوا زاناترە)).

ئیبن تەیمیە(ت ساڵی٧٢٨ ك) لەبارەی صۆفیگەرییەوە گوتویەتی ((ئەوانە لە کۆششدان بۆ گوێڕایەڵیکردنی خوا، هەروەك چۆن هیتریش لەم هەوڵەدان، هەندێکیان لەپێش و نزیکە لە خوا، هەندێکیان خەڵکی بۆیان دەچن، ئەمانە ئەهلی

---

١ کتێبی (ربانية لا رهبانية)ی نەدوي،ل١٧.

٢ طبقات الاولياء، ص ٤٧٨.

لای راستن کە نامەیان بە دەستی راست دەدرێتێ، هەندێکیان ستەمی لە نەفسی خۆی کردووەو بەرامبەر خوا تاوانبارە)). ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێبێ) ستایشی هەندێ کەڵەپیاوانی صۆفیگەری دەکرد، وەکو: جونەید و ئیبراهیمی[1] ئەدهەم و ئەبی سولەیمانی دارانی و مەعروفی کەرخی و سەهل کوڕی عبداللەی التستری و شێخ عبدالقادری گەیلانی و عدی کوڕی مسافر و دەیگوت: خوا لێیان رازیبێ و گیانیان پیرۆز بکات.[2]

ئیبن قەیمی جەوزیی (ت ساڵی ٧٥١ ك) قوتابیی ئیبن تەیمیە، گوتی: پێویستە پیاو سەیری مامۆستا و پێشڕەوەکەی خۆی بکات، ئەگەر بینی هەردەم خەریکی یادکردنەوەی خوا و پەیڕەویکردنی پێغەمبەرەﷺ و لەکارەکەی مکوڕە بابکەوێتە ژێر فەرمان و نەهی ئەو.

ئیبن خەلدون (ت ساڵی٨٠٨ ك) لە(مقدمە)کەیدا گوتویەتی: ((هەر کە لەسەدەی دووەمی کۆچی و دوای ئەوە خەڵکی باوەشیان بۆ دنیا کردەوە و تێکەڵی بوون، ئەوانەی خەریکی خواپەرستی بوون بەناوی صۆفی ناویان دەرکرد))[3]، رای وایە، کە صۆفیگەری لەچوارچێوەی ئیسلام دەرناچێ و دەیگوت: صۆفیگەری رێبازێکە لە رێبازەکانی زانینی شەریعەت.

ئیبن عابیدین (ت ساڵی١٢٥٥ ك) لە پەراوێزەکەیدا دەڵێت: ((تەریقەت ژیانی تایبەتی رێبوارانە، ئەوانەی، کە قۆناغەکانیان بڕیوە و لە مەقامەکان هەوراز چوونە، حەقیقەت بریتیە لە بینینی پەروەردگار بەدڵ... مەبەست لەم سێیانە (الشریعة والطریقة والحقیقة) بنیاتنانی بەندایەتی بەندەیە لەسەر شێوەیەکی ڕاست و

---

١ زانایان بەگشتی لەسەر ئەوەن، کە صۆفیگەریی ئیسلامی لەسەرەتای سەدەی سێیەمی پەیدا بووە و پێش ئەو کاتە زوهد هەبووە، کەواتە وا راستترە، کە ئیبراهیمی ئەدهەم بە زاهید دابنرێ نەك بە صۆفی چونکە لە ١٦١ ك وەفاتیکردووە. (وەرگێڕ)

٢ مجلد التصوف من الفتاوي، ص ٢٣٣.

٣ المقدمة، ص ٣٢٩.

دروست)).[1] هەروەها گوتەی (قوشەیری) لەنامەکەی دەگێڕێتەوە، کە دەڵێ: گوێم لە ئەبو عەلی دەقاق بوو دەیگوت: من ئەم ڕێبازەم لە ئەبو قاسمی نەسرئابازی وەرگرتووە، ئەبو قاسم گوتی: من لە (شبیل)م وەرگرتووە و ئەویش لەسرِی سەقەتی و ئەویش لە مەعروفی کەرخی ئەویش لە داودی طـائی و ئەویش زانست و ڕێبازی لە ئەبو حەنیفە وەرگرتووە)).[2] ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەبو حەنیفە ڕەزای خوای لێ بێ لەو کەسانە بووە، کە ڕێبازی صۆفیگەرییان وەرگرتووە.

ئەبو الحسن علی الحسنی الندوی گوتوویەتی: ((خەلافەتی ئیسلامی گیانی خەلیفایەتیی و ئەمانەتی پێغەمبەرایەتی لەناوبرد و بووە پاشایەتی و رامیاری و بەڕێوەبردن و باج وەرگرتن، لە چواردەوری دەوڵەتی ئیسلامی چەند خواناسێ پەیدا بوون، کە پەیامی ئیسلامیان نوێ کردەوە و خەڵکی بە زانست و ویستەوە دێنە ناو ئیسلام دوای ئەوەی موسڵمانانی پێشوو بە نەریت و بۆماوەیی(وراثـــة)وە دەچوونە ناو ئیسلام، لە دەسەڵاتی ویست و ئارەزوو دوچوونە دەرەوە و خواپەرستی و گوێڕایەڵی‌یە چاپووکی دەنوێنن، بەناو بانگترین ئەو داواکەر و پەروەردیارانە: حەسەنی بەسری و فوضەیلی کوڕی عەیاض و مەعروفی کەرخی و جونەیدە ڕەحمەتی خوایان لێ بێت... ئینجا لە بەغدا پیاوێك پەیدا بوو خاوەنی کەسێتییەکی بەهێز، بڕوایەکی بەهێز، کاریگەرییەکی بەهێز بوو.. ئەویش شێخ عبدالقادری گەیلانییە)).[3]

احمد شرباصی گوتویەتی ((ئەی ڕۆڵەکانی ئیسلام صۆفیگەری لایەنێکی گەورەی لە ئاکارو مێژووتان ڕاگرتووە، ماوەیەکی زۆرە لە کیسی خۆتان داوە، ئەوەی بوو بەستانە، بەرەو صۆفیگەریی وەرن، چونکە خۆراك و دەرمان لەو دایە،

---

١ حاشية ابن عابدين، ج ٣، ص ٣٠٣.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ب ١، ل ٤١.

٣ کتێبی ( ربانية لا رهبانية)، ل ٣١ و دوای ئەو

خوا نیشاندەی ڕێگای ڕاستە)).[1]

دکتۆر محەممەد عەلەوی مالیکی-مامۆستای پێشوو لە زانکۆی (ام القری) و مامۆستا لەمزگەفتی حەرام گوتوویەتی ((صۆفیگەری ئەم زۆر لێکراوە تاوانبارەیە، کەم هەیە بۆی بە ئینصاف بێ، بەڵکو هەندێ زاتی ئەوە دەکەن، کە هەندێ سیفەتی ناشایستەی پێوە بلکێنن، کە پێی لە شایەتی دەکەوێ و دادپەروەری پێ لەناودەچێ، دەڵێ: فلانەکەس جێی متمانە نیە و قسەی لێوەرناگیرێ، بۆچی ؟ چونکە صۆفیە. بۆیە حەزم کرد گوتەی هەندێ ئیمامەکانی ئاینیتان بۆ بڵێم کە بنەماو پیاوی صۆفیگەرین)).[2] ئینجا هەندێ لەگوتەکانی جونەید و ئەبی یەزیدی بەستامی و زونونی میسری و بیشری حافی و ئەبو سلێمانی دارانی باسی دەکات.

محەممەد ئیقبالی شاعیری ئیسلام گوتوویەتی: ((ئیسلام لای صۆفییەکان سروشتێکی جوان و کامڵ و مرۆڤایەتیی باڵاو برایەتییەکی دنیای وەردەگرێ، کە لە ئیسلامی زاناو کەلامناسەکاندا بەدی ناکرێت))[3].

رۆجیە گارۆدی فەیلەسوفی فەرەنسی گوتوویەتی: ((شایەنی گوتنە کە صۆفیگەریی رەهەندێکە لەرەهەندەکانی بیرو باوەری ئیسلامی، بەڵکو رەهەندێکە لە ناخەوەیە، هەر هەوڵدانێك کە صۆفیگەری بکاتە تەوژمێکی سەربەخۆ بێگومان لەنرخی کەم دەکرێتەوە، لە ئیسلامدا کارو رامان(تأمل) لەیەکتری جودا ناکرێتەوە.... بنەما سەرەتاکانی صۆفیگەریی ئیسلامی لە قورئانەوەیە))[4].

هەرچەندە لە بارەی صۆفیگەرییەوە گوتە زۆرە، بەڵام بەوەندە گوتەی زانا کۆن و نوێیەکان وازمان هێنا.

---

١ تصدير كتاب نور التحقيق، للشيخ حامد صقر، ص ٣.

٢ مفاهيم يجب أن تصحح، ص ٣٥.

٣ پێشەکی کتێبی (اللمع) ساغکردنەوەی د. عبدالحليم محمود...

٤ مايعيد به الاسلام، رۆجيە گارودی، ل ٧٧.

# ئایا صۆفیگەری بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی پێویستە ؟

بینیمان کە صۆفیگەری یان پاککردنەوەی دەروون (تزکیـــة النفـــس) بەپێی گوتەی مامۆستا گەورەکانی، لە سنووری قورئـان و فـەرموودە دەرنـاچێت و دەبێتە هۆی پاککردنـەوەی دەروون، چونکـە لـە مـەقامی ئیحسـان و چـاودێریی دادەنـێ و داوای ئاکاری چاك و بەدنیا نەفریوان دەکا، هەروەها داوای دورکەوتنەوە دەکا لە: قرچۆکی و ئێرەیی و ڕق و غەیبەت و دووزمانی و هـەموو سیفەتە بەدەکان، صۆفـی هەر ئەوەنییە، کە خوری پۆشیبێ، بەڵکو ئەوەیە هەروەکو شاعیر دەڵـێ:-

خەڵکی لە وشەی (صۆفی) بۆچوونی جیایان هەیە
هەندێکیش وادەزانن لە خوری وەرگیراوە
ئەم ناوە بەهیچ کـەسـێ نابەخشم گەنجێ نەبێ
بێگەردوو خوری لەبەر تا ناوی لێنرا صۆفي

ئەمە هەمووی لە گەڵ پەیامی پێغەمبەرﷺ دەگونجێ و لەگەڵ ئاکاری کۆمەڵگای ئیسلامی یەکـەمدا دەشـێ، کـە چاکـترین سـەردەم بـوو. ئـەم ئاکـارو هەڵسـوکەوتانە بوو، کە کۆمەڵگای یارانی پێغەمبەرﷺ توانیان لە چەند سـاڵێکی کـەم ئیسـلام بـڵاو بکەنەوە لە ڕۆژهەڵات لە سنووری چین، تا دەریای تاریك (الاطلس) لە ڕۆژئاوا، تـا هەموو دنیا سەری لەمە سوڕما، ئەم ئاکارەی کە لە نووسراوی حەزرەتی عومـەر بۆ عەتەبەی کوڕی فەرقەد کە والیی ئەزربێجان بوو دەرکەوێ، هەروەك بڵێـی وەسفی کۆمەڵگای صۆفیەکان دەکا، فەرمووی: ((لە دواییدا، ئیزار لەبەر کەن، سۆڵتان لە پێ هەڵکێشـن و خۆتـان سووك کـەن و شـەرواڵەکانتان داکـەنن و جـل و بـەرگی باوکتان ئیسماعیلعليه السلام لە بەرکەن و واز لە پۆشاکی نەرم نیانی عەجەم بێنـن، برۆنە بەر ڕۆژ چونکە گـەرماوی عەرەبـە، لـە کـەم خـواردن و لەبەرکردن وەکـو مـەعدی کوڕی عەدنانی باپیرتان بن و لە ژیاندا خۆتان لەسەر شتی دڕ و زبر ڕابـهێنن، شتی کۆنـە لەبەرکـەن، بێ ئەوەی پـێ لـە ڕکێـب بنێـن خۆتـان هەڵدەنــە سـەر ئەسـپ و

تیرەکانتان بهاوێن.[1]

هەر کە کۆمەڵگای ئیسلامی بەرە بەرە وازی لەم ئاکارو هەڵس و کەوتانە هێنا، بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەرەو کزی ڕۆیشت، ئێستاش ئەم کارو بارە چاك نابێ تەنیا بەو ئاکارەی، کە ئەوانی پێشی پێی چاك بوون.

ئێمە ئێستا لە قەیرانێکی ئاکار و رەوشتی قورس داین، پەرستنەکان وەکو سەرەتای ئیسلام جێبە جێ ناکرێن و بوونەتە خوونەریت و جووڵانەوە و گیانیان تێدا بەدی ناکرێ و لە خراپە نایان گێڕێتەوە، سەودا لە نێوان خەڵکیدا پیس و بۆگەن بووە و هەموو مەبەستیان قازانجەو بەس. جا چ لە حەڵاڵ بێ یان لە حەرام، بەدکاری و مەیخواردنەوە و خواردنی ماددە سڕکەرەکان بڵاوبوونەتەوە، بە دنیا هەڵخەڵەتاوین و خەریکی بنیاتنانی ساختمانی بەرز بەرزین، شانازی بە جوانکاری و جل و بەرگی چاك دەکەین، تووشی (وەن) بووین کە بریتییە لە: خۆشویستنی دنیا و رق لێبوونەوەی مردن، ئێمە ئەمڕۆ بەرەو هەڵدێر دەچین، ئەگەر خوای مەزن نەمان گاتێ بەرەحمەتی خۆی، چۆن رزگارببین؟

کۆبوونەوە دەکرێ و خوتبە و ئامۆژگاریی تێدا دەخوێندرێتەوە، بەڵام ئەوەی بانگی دەکەی ژیانی تێدانییە، رزگار بوون لە بنچینەڕا دەبێ، هەتا بنچینە زبڵ بێ ساختمان پتەو نابێ، گەر بنچینە چاك کرا ساختمانەکە چاك دەبێ. بنچینە بریتییە لە ئاکاری بەرز ((**إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخلاَقِ**: من ناردراوم بۆ ئەوەی ئاکارە بەرزەکان تەواو بکەم))[2]، بنچینە لەچاککردنی دەروونەوە دەبێ، ئەمەش کارێکی هێندە ئاسان نییە و بەقسە پێك نایەت.

صۆفیگەری لە ڕابردوودا توانی شەهوەت و ئارەزوو کپ بکاتەوە و دەروون و ئاکار پاك بکاتەوە، باواز لە ناوەکەی بێنین، گەر ئازارمان دەدات، با ئەو پێڕەوەی وەربگرین، کە بۆ پەروەردەی دەروون و پاککردنەوەی ئاکار دایاناوە و هەرچ

---

١ بستان العارفين للنووي، ص ١١٥.

٢ مالیك لە ( الموطاء) گێڕاویێتیەوە و ئەحمەد و بەزاز لە (جامع الاصول) ٤:٤

خلّت و خالێکی تێکەوتووە لێی پاك بکەینەوە و سوودی لێ وەربگرین بۆ دووبارە دارشتنەوەی کۆمەڵگا و پەروەردە کردنی منداڵـە کانمان. لـە قوتابخانـە کانمان ئـەو ئاکارە دەستکردانە دەخوێندرێ، کە فەیلەسوفە رۆژئاواییە کانی وەکو: (کونـت)ی ئەڵمانی و ئۆکست کۆمتـی فەرەنسـی و ولیـەم جێمسـی ئـەمریکی دایـان نـاوە، بنچینە کەی کاری پێویست چونکە پێویستە، هەروەکو کەنت دەڵێت.

بۆچی هـەر لـە پۆلـە سـەرەتاییە کانەوە ئاکـاری محەممـەدییان فێرناکـەین، کـە بنچینە کـەی (کردنـی کـاری چـاك و دوور کەوتنـەوە لـە خراپە) یـە بـۆ ڕەزامـەندیی خوای مەزن؟ ئینجا چەند نموونەیەکی کردەوەییان پێ نیشان بدرێ، هەریەکە بە پێی تەمەنی خۆی و دەبێ لەماڵ و مزگەفتیش بەدواچوونی ئەم ئاکارانـە هـەبێ و بـۆ هـەر کۆمەڵێ لـەم منداڵانـە رابەرێك یـان مامۆستایەکی دینـدار و دەستپاکیان بـۆ دابـین بکرێ، بۆ ئـەوەی ئاگایـان لێیـان بێ و مەشقیان پێ بکـاو نـاواز(شـــاذ)ەکـەیان بگێڕێتـەوە و گومڕاکـەیان بێنێتـەوە سـەر ڕێ، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش پـەنا بباتـە بـەر یادکردنەوەی ژیاننامـەی پێغەمبـەرو پیاوچاکـان و موجاهیدەکـان، تـا وای لێدێ ئاکاری چاك دەبێتە خوێکی سروشتی لە دەروون و ویژدانیان. لە گەنجێتیدا لەسەر ئـەم ئاکارانـە گـەورە دەبـن و بـە پـیریش لەسـەری دەمێننـەوە و فـێری منـداڵ و نەوەکانیانی دەکەن.

لەو کاتەدا دەبینین کە هەموو گوناهـە گـەورەکان و بـەنگ کێشـان(مخدرات) و مەیخواردنەوە و شـتی تـر سـووك بوونـە و زیانیـان کـەم بـووە، هـەروەها دەبینین دنیـا هەمووی باوەشیان بۆمان کردۆتـەوە و بـەخێرهاتنمان دەکـەن بـۆ ئـەوەی لـەتۆغیانی مادە پەرستی رزگاریان بکەین، دنیا هەمووی ئێستا لـە قـەیرانێکی ئاکـار و ڕەوشـت دایەو بە دڵێکی کراوەوە چاوەنواڕی ئەو کەسە دەکات، کە لەو قەیرانەی رزگـاری بکات، ئەمەش بەنووکی شیر نا، بەڵکو بە نموونەی چاك و پێشەنگی باش.

## صۆفیگەریی لە مێژووی درێژی بڵاوبوونەوەی ئیسلامی کردووە؟

پەیدا بوونی صۆفیگەریی ئیسلامی بەر پەرچدانەوەی لاربوونێکی زۆری تەرازوی کۆمەڵگای ئیسلامی بوو بەرەو مادەو دنیا و بریق و باقی دنیا، بە پێچەوانەی ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردبوون، صۆفیگەری توانی پێشی ئەو لافاوەتێکدەرە بگرێ، یا زۆر جار سنووریٚ بۆ هێزەکەی دابنێ. صۆفییەکان گەلێکیان لە رووی زۆر و ستەم وەستان و گوتەی حەقیان بەدەمداهات بێ ئەوەی بترسن و بلەرزن، ئەمەش بۆ پەیڕەویکردنی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ((**أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةَ عَدْلٍ–أو حَقٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ**: چاکترین جیهاد گوتنی وتەیەکی حەقە لای دەسەڵاتدارێکی زۆردار.))[1]. وەکو هەڵوێستی شێخ عبدالقادری گەیلانی لەگەڵ خەلیفەی عەباسی (المقتفي لأمر الله) و عزالدینی کوڕی عبدالسلام لەگەڵ پاشا ساڵح ئیسماعیل، ئینجا لەگەڵ نەجمەدین ئەیوب لە میسر و مونزیری کوڕی سەعیدی بەلوطی لەگەڵ عبدالرحمنی ناصر لە قورتوبە و نەوەوی لەگەڵ زاهیر بیبرس، هەروەها شێخ سەعیدی حەلەبی لەگەڵ ئیبراهیم پاشای میسری و گەلێکی تریش. ئەمەو سەرەڕای ئیسلام بوونی گەلێ لە گاورەکان و تۆبەکردنی گەلێ لە سەرکێش و بەدکارەکان لەسەر دەستی ئەوانەوە، وەکو شێخ عبدالقادر کە پێنج هەزار بێبڕوا(کافر) لەسەر دەستی موسڵمانبوون و سەد هەزار کەس لە گوناهبار و سەرکێشەکان تۆبەیان لەسەر دەستی کرد، هەروەها هەندێکیان بەدەست و شیریان جیهادیان کردووە، بەڵام دەنگوباسی گشتیان بەدەستمان نەگەیشتووە، چونکە خۆیان لە مەرایی(ریـاء) و مەرایی کاری دوور دەخستەوە، (ابن الملقن) لە کتێبەکەی (طبقات الأولیاء) ئەم چیرۆکە لە (حاتم الاصم الصوفی) دەگێڕێتەوە و گوتی: لەگەڵ تورکەکان کەوتبوینە جەنگ، تورکێك تیرێکی تێگرتم و وەریگێڕام و هاتە سەرسینگم و ریشی گرتم و چەقۆیەکی لە خوفەکەی

---

[1] ترمذی و ئەبو داود گێڕاویانەتەوە هەروەك لە (جامع الاصول: ١:٣٣٣)دا هاتووە.

دەرهێنا بۆ ئەوەی سەرم بڕێ، سوێند بەگەورەکەم-واتا خوای- دڵم لای ئەو و لای چەقۆیەکەی نەبوو، بەڵکو لای گەورەکەم بوو و چاوەڕوانیم دەکرد بزانم چیی لێوە دەر دەچێ. گوتم: گەورەم فەرمانت بەمە کردووە ؟! بەسەر سەرو سەر چاو. من موڵکی تۆم، لەو کاتەی کە گەورەی خۆمم دەدواند و ئەو لەسەر سینگم بوو و ریشی گرتبووم، تا سەرم ببڕێت، هەندێ لەموسڵمانەکان تیرێکیان تێگرت و لە گەروی چەقی و بەربوویەوە سەرم، منیش بۆی هەستامەوە و چەقۆیەکەم لەدەستی دەرهێناو سەرم بڕی. ئێوە ئەگەر دڵتان لای خوا بێ شتی هێندە سەیر دەبینن، کە دایك و باوکتان نەیبینیبێ.[١]

ئەحمەدی بەدەوی و موریدەکانی رۆڵێکی گرنگیان بینەهی لە بەرپەرچدانەوەی هێرشی خاچییەکان بۆ سەر میسر بەسەرکردایەتیی لویسی نۆیەمی پاشای فەرەنسا لە ساڵی (٦٤٦ ك-١٢٤٩ز).

مورابیتەکانی ئەفریقیا لە سەدەی پێنجەمی کۆچی لە صۆفیەکانن، رەچەڵەکیان بۆ هۆزی (لمتونة) دەگەڕێتەوە، یەکەم پیاویان، کە یەحیای کوڕی عومەر بوو لەسەر دەستی عبـدالله‌ی کوڕی یاسین جەزولی بووە صۆفی و لە شوێنێکی بەرز خوا پەرستییان دەکرد و ناویان لێنا-رابط-،[٢] ژمارەیان زۆر بوو و گەیشتە هەزار پیاو، لە سەرەتادا و لە دە ساڵی یەکەم هەر خەریکی خوا پەرستی و رامان و فێربوون و چاککردنی دەروون و پاککردنەوەی ئاکار بوون، دوای ئەمە مامۆستاکەیان پێیانی گوت: بڕۆنە دەرەوە و هەوڵ و کۆشش بدەن، لە رووی کەمی و کزییەوە کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ، ئیتر دەرچوون و ئەفریقیایان گرت و دەوڵەتی مورابیتینیان دامەزراند، لەدوای مردنی یەحیای کوڕی عومەر یوسفی کوڕی تاشفین بووە سەرۆکیان، کە شاری مەراکیشی لە ٤٥٤ ك بنیات نا، ئینجا بە هانای موسڵمانەکانی ئەندەلوسەوە هات و بووە هۆی ئەوەی، کە چوارسەد ساڵی تر

---

١ طبقات الاولیاء، ص ١٨٠.

٢ واتا: خانەقا وەرگێڕ

لەوێ بمێننەوە، ئەمەش بەوەی کە لە جەنگی (الزلاقـــة) لەساڵی ٤٧٩ ك بەسەر ئەلفۆنسـۆی پاشـای ئیفرەنجیـدا زاڵبـوو، ئەمـەش یـەکێك بـوو لـە جەنگـە جیاکەرەوەکانی مێژوو، چونکە مورابیتەکان سوپای ئەلفۆنسۆیان لەناو برد، کە لە پەنجا هەزار زیاتر بوون و تەنیا پێنج سەد سەربازیان لێ رزگار بوو.[1]

عبدالقادری جەزائیری ماوەی پازدە ساڵ جەنگی لەگەڵ فەرەنسییەکان کرد و کتێبێکی لە بارەی صۆفیگەرییەوە هەیە بەناوی (المواقف)، ئەمیر شەکیب ئەرسەلان لە بارەی عبدالقادری جەزائیرییەوە گوتویەتی: ((زۆر لە زانست و ئەدەب شارەزابوو، لە صۆفیگەریدا دەستێکی باڵای هەبوو، نەك تەنیا لە رووی تیۆریەوە بەڵکو بە کردەوەش صۆفی بوو))[2].

محمد غازی و شێخ شامیل، کە هەردووکیان نەقشبەندین، سی‌و پێنج ساڵ لەگەڵ روسیا جەنگیان کرد، بزووتنەوەی سنوسی لە لیبیا جەنگی لەگەڵ ئیتالیەکان کرد، هەروەها بزووتنەوەی مەهدیە لە سودان، کە دژی ئینگلیز لەجەنگدابوون، ئەم دوانە هەردووکیان بزووتنەوەی صۆفیانە بوون.

لە سەردەمی ئێستاش گەلێ نمونەی وا هەیە، کە صۆفیەکان لە دژایەتیکردنی کوفر و گومڕایی دان، کە لێرە ماوەی باسکردنی نییە. چۆن هەندێ کەس صۆفیەکان بەسەر شۆڕی و زەلیلی و هەندێ جار بەخیانەت تاوانبار دەکەن ؟ لە هەموو چینێ ناوازە و خۆپەرست هەیە و پیاوی ژیر دەبێ جیاوازی لە نێوانی لەڕو قەڵەو بکا و چاك و خراپ وەکو یەك حسێب نەکات.

هەروەها صۆفیەکان رۆڵێکی مەزنیان هەبووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە ئەفریقیاو هیند و شوێنی تر بێ پەنا بردنەبەر چەك.

دکتۆر ئەحمەد شەلەبی دەڵێت: ((بە ناوبانگترین رێبازی صۆفیگەری، کە ئیسلامیان لە ئیفریقیا بڵاوکردەوە سیانن: قادری و تیجانی و سنوسی.. ئەگەر

---

[1] موسوعة التأريخ الاسلامي، احمد شلبي، ج ٤، ص ٧٢.

[2] مايعدبه الاسلام، روجية غارودي، ص ١٥٨ / ربانية لارهبانية، لأبي حسن الندوي، ص ١٢٦.

بازرگانەکان بەرەو شارەکان دەچن، ئەوا شێخانی ڕێبازی صۆفیگەری بەرەو گوندو بیابانەکان دەچوون، ئەگەر بازرگانەکان بۆ قازانج هەولیان دەدا، شێخەکان گوێیان نەدەدا بە سامان و تەنیا هەولی نانەسکیان دەدا))[1]، هەروەها صۆفییەکان لە موسلمانبونی هۆزی مەغۆل و تەتارەکان دەستێکی بالایان هەبوو، ئەمەیش شانازی و شەرەفە بۆیان.

بەلام لە هیند، ابو الحسن الندوی گەلێ نمونەی هێناوەتەوە لەو خزمەتانەی، کە صۆفیەکان پێشکەشی موسلمانەکانی هیندیان کردووە، ئەمەش لە هەردوو کتێبی (ماذا خسر العالم بإنحطاط المسلمين) و (ربانيـــة لا رهبانيـــة)، ئێستا باسی چەند نمونەیەکیان دەکەین: ((شێخ محەمەد مەعسومی کوڕی شێخ ئەحمەدی سەرهەندی نۆ سەد کەس ڕایان پێدا و تۆبەیان لای کرد، ئەحمەدی شەهید بە هەر شارێکدا ڕەت ببوایە خەلکێکی زۆر تۆبەیان لە سەر دەستی دەکردو ڕایان دەدایێ، دوو مانگ لە شاری (کەلکەتە) مایەوە و هەموو ڕۆژێ نزیکەی هەزار کەس پەیمانیان دەدایێ، بازرگانیی مەی لەو شارە باوی نەماو بازرگانەکان نەیان دەتوانی باجەکانیان بدەنە میری. هەرکە سولتان (تغلق) بە تەکیەی شێخ قوطبالدین منەوەردا ڕەتبوو سەد هەزار پارچە زێری پێشکەش کرد، شێخ گوتی: گەورەیی و پاکی بۆ خوایە، بە فلسێ دەتوانم گەلێ برنج و ڕۆن بکرم، ئەو چەند هەزار روپیانەم بۆ چییە، فەرمانڕەوای ئینگلیز چووە سەردانی شێخ (فضل الرحمن)ی گەنج مراد ئابادی و پێی گوت: گەر بتانەوێ، موچەتان لە دەولەت بۆ دەبڕمەوە، شێخ پێی گوت: چ لە سامانتان بکەم، لە فەزلی خواوە تەختێك و دوو مەسینەی قوڕ و دوو جەڕەی ئاوم هەیە، هەندێ لە هاوڕێکانمان گەنمەشامیمان بۆ دێنن و نانی لێ دروست دەکەین، ژنەکەم هەندێ سەوزەوات دەکولێنێ و نانەکەی پێ دەخۆین و زۆریشە. قوتابخانەکان لەهیند لە تەنیشت تەکیەکان دروست دەکران، وەکو: قوتابخانەو تەکیەی ڕەشیدیە لە جونبور، قوتابخانەو تەکیەی شێخ وەلی اللّٰه‌ی کوڕی عبدالرحیم

---

[1] موسوعة التأريخ الاسلامي، ج ٦، ص ٢١٠.

لە دەهلی، قوتابخانە و تەکیەی شێخ رەشید ئەحمەد لە کونکو.. هتد.

لە کۆتاییدا دەمەوێ باسی دوو نموونە لەو صۆفیانە بکەم، کە پابەند بوون بە سوننەتی پاکی پێغەمبەرﷺ و رێنماییەکانی ئیسلام: یەکەمیان مامۆستا ابو الحسن الندوی لە کتێبی (ربانیة لا رهبانیة)[1] کە باسی وەفات کردنی شێخ (فضل الرحمن)ی گەنج مراد ئابادی دەکا لە ١٣١٣ ك دەڵێ:

((هەندێ لە موریدەکانی ویستیان شەرواڵەکەی بەکراسێ بگۆڕن، شێخ لەکاتی گیانەڵادا بوو، شەرواڵەکەیان گرت و ویستیان لە پێی راستی دایکەنن، یەکسەر پێی خۆی گرت و پێی چەپەی بۆیان درێژ کرد، ئەوانیش لە هێمایەکە گەیشتن، چونکە سوننەتە لەبەرکردن لە پێی راستەوە بێ و داکەندن لە پێی چەپەوە))، صۆفی نەبێ کێ ئەمە دەکات !!.

نموونەی دووەم خۆم بینیم: لە نەخۆشخانەی نیشتمانیی شاری (حەما) فەرمانبەر بووم و ئۆتۆمبێلی نەخۆشخانە هەموو بەیانییەك دەهاتە دوام و لەگەڵ پزیشکانی تر بۆ نەخۆشخانە دەچووین، شێخ محمد حامیدم بینی بە هەمان ئاراستەی ئێمە دەڕۆیشت، داوام لە شوفێرەکە کرد بوەستێ و لەگەڵ خۆمان هەڵی گرین، ئۆتۆمبێلەکە وەستا و دەرگاکەیم کردەوەو گوتم: مامۆستا فەرموو با لەگەڵ خۆمان بتبەین و ئێمەیش بەم رێگایەدا دەڕۆین، گوتی: ئۆتۆمبێلەکە هی خۆتە؟ گوتم: نەخێر، هی دایەرەی تەندروستییە، گوتی: کەواتە لەگەڵتان سوار نابم، گوتم: بۆ چی، ئێمەیش بەم رێگایەدا دەڕۆین. گوتی: ئەدی من کێشم نییە ؟ کێشەکەم بەنزینی زیاتری دەوێ، بۆیە ناتوانم لەگەڵتان سواربم، سوپاسی کردین و بەرێگای خۆیدا رۆیشت. ئەگەر صۆفی نەبێ کێ ئەم کارە دەکات ؟!

---

[1] ل ١٦٠.

# ئەنجام :

هەست بەوە دەکەم زۆرم لەسەر صۆفیگەری گوتبێ، چونکە دەبینم بەناڕەوا زۆر هێرشی دەکرێتە سەر، ئێمەی عەرەب ئاواین، یا تا ئەوپەری خۆشمان دەوێ، یا رقمان لێی دەبێتەوە تا ئەوپەڕی، لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((**أَحْبِبْ حَبِيبَكَ هَوْناً، مَا عَسَى أَنْ يَكُونَ بَغِيضَكَ يَوْمًا مَا، وَأَبْغِضْ بَغِيضَكَ هَوْناً، مَا عَسَى أَنْ يَكُونَ حَبِيبَكَ يَوْمًا مَا**: خۆشەویستەکەت زۆر خۆش نەوێ نەخۆ رۆژێ لە رۆژان رقت لێی ببێتەوە، زۆر رقت لە دوژمنەکەت نەبێتەوە نەخۆ رۆژێ ببێتە خۆشەویستت)).[1]

بێگومان هەندێ لە صۆفیەکان دوای ئەوەی فەلسەفەی یۆنانی و هیندی خۆی خزاندە ناو رۆشنبیریی ئیسلامی هەندێ خلّت و خار کەوتە ناو رێبازەکەیانەوە و تووشی چەند لادانێك بوون، هەندێك لەوانە لە ئیسلامەتی دەرچوون. لەوانە فەرزەکانیان لاداو هەندێکیان حەرامیان حەڵاڵ کرد و هەندێکیان بڕوایان بە (حلول) هێنا. ئەم جۆرە کارانە لە یەکێ دەردەچێ، کە لەئایینەکەی نەزان بێ و بیەوێ بیڕمێنێ، ئینجا سەردەمی نەزانی و تاریکی داهات و فاڵگرتنەوە زۆر بوو بەمەبەستی پارە پەیدا کردن. ئەمانە هیچیان لە صۆفیگەریی رەسەن نین و شتێکی کاتین، ئەوەی گەردیلەیێ ئایینی هەبێ پێی قایل نابێت. کەڵە صۆفیەکانی پێشینان تەرازوویان بۆ صۆفیگەریی ئەم جۆرە کەسانە داناوە و گوتوویانە ((صۆفیگەری بە قورئان و فەرموودەوە بەندە و هەمیشە فیقە لەسەر صۆفیگەری دا دەورە نەك بە پێچەوانەوە))، ئەوانە لەمەدا بە گوتەی خاوەنی هەر چوار رێبازەکان دەچن کە دەڵێن: ئەگەر فەرموودەکە راست بوو ئەوە رێبازی منە، کەواتە هەر شتێ لە لا ڕاهاتبێتە ناو صۆفیگەرییەوە و لەگەڵ قورئان و فەرموودەیەك نەگرێتەوە ئەوا لە

---

[1] ترمذی و بیهقی و بوخاری لە مێژووەکەی گێڕاویتیەوە: جامع الاصول، ج ٦، ص ٥٤٩، رقم ٤٧٧٥.

صۆفیگەری نییە و قەبووڵ نییە.

یا ئەوەتا لە بنچینەوە صۆفیگەری لەناو بەین دوای ئەوەی بینیمان چیی پێشکەش ئیسلام و کۆمەڵگای ئیسلامی کردووە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا نەزانین و ستەمە و وەکو ئەو کەسەمان لێ دێ، کە دارێکی بە سێبەرو بەرداری هەبێ و هەموو کاتێ بەویستی خوا لەبەرەکەی بخوریێ و دوایی یەکێ لە لقەکانی تووشی داخوران بێ و لە جیاتیی برینی لقە نەخۆشەکە دارەکە لە ڕەگەوە دەر بهێنین، بەمە زیان هەر لە ئێمە دەکەوێ.

کۆمەڵگاکەمان چەند قازانج دەکا، ئەگەر هەر یەکێ لە ئێمە پەیڕەویی صۆفیگەریی رەسەن بکات و بەیانی و ئێوارە بڵێت: خوا سەیرم دەکا، خوا لە پێشمە و ئامادەیە، خوا ئاگادارمە، ئینجا پاسەوانێ لەلایەن خواوە لە دڵی هەریەکەمان پەیدا دەبێ بەشەوو رۆژ ناهێڵێ سنووری حەرام ببەزێنێ و بەردەوام بێ لەسەر سڕکەرەکان و مەیخواردنەوە.

ئایا بەم شێوەیە ناگەنە پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی بێگەرد وەکو ئەوەی کە لە سەرتای ئیسلام هەبوو و هەموو مرۆڤێ هەوڵی بۆ دەداو گەلێ هەوڵ و کۆشش بەو پارە خەرجکردنمان بۆ دەگەڕێتەوە، هەروەها پێویستیمان بە دوان دان و ئامۆژگاریکردن و کۆبوونەوە نابێت و میللەتەکەمان لەگەڵێ ئازارو نەخۆشی رزگار دەکات.

ئەوانەی هێرش دەکەنە سەر صۆفیگەری و دەیانەوێ لەڕەگ و ڕیشەوە هەڵی بکەنن، ئەم بەیتەی (حطیئة) یان دێنمەوە یاد، کە گوتوویەتی:

باوکتان بێ باوك بێ، بەکەمیان نەزانین
لەبەر سەرزەنشت ئەو شوینەیان داخست، کە دایان خست

هەروەها بە بیریان دێنمەوە، کە ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێبێ) هەر کە ناوی شێخەکانی صۆفیگەری بهاتبایە وەکو: جونێد و ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و مەعروفی کەرخی و دارانی و عبدالقادری گەیلانی، دەیگوت: خوا لێیان رازیبێ و

گیانیان پیرۆزبكات.

بەڵام ئەوانەی شتی لابەلایان هێنا ناو صۆفیگەرییەوە، ئەوانە هیچ پەیوەندییان بە صۆفیگەرییەوە نییە و بەڵگەنین لە سەر حەق، بەڵكو حەق بەڵگەیە لەسەریان، قورئان و فەرموودە حەقن، هەروەك گەورە شێخەكانی صۆفیگەری بڕیاریان لەسەر داوە.

ئێستا دوای ئەوەی ئەو هۆكارانەمان زانی، كە بوونە هۆی سەر كەوتنی شێخ عبدالقادری گەیلانی لە كارە چاكخوازییەكەی، هۆكارەكانیش ئاكاریی و هەڵسوكەوتی بوون، سەرەڕای ئەو بارە رۆشنبیری و كۆمەڵایەتی و مێژووییانەی، كە لەسەر دەمی ئەودا باوبوون، ئێستا لەگەڵ شێخ عبدالقادر هەنگاو دەنێین لە قۆناغی رابەرایەتیكردن و چاكخوازی، قۆناغی توانا بوون و پەروەردەی رێبوارانی صۆفیگەری.

# دەروازەی چوارەم

## قۆناخی توانا بون و پەروەردە کردنی موریدەکان

بینیمان چۆن شێخ عبدالقادر بووە قوتابیی قازی ئەبو سەعیدی موبارەکی کوڕی عەلی موخەرِەمی، کە قوتابخانەیەکی تایبەتی لە (باب الازج)ی بەغدا هەبوو، شێخ عبدالقادر لەساڵی ٥٢١ کۆچییەوە وانەی لێ گوتەوەو دوای مردنی قازیی موخەرِەمی قوتابیانی قوتابخانەکەیان دایە دەست شێخ عبدالقادر، ئیتر خەڵکی بەسەر شێخدا بارین تا قوتابخانەکە جێگەی نەبوویەوە تەنگ بوو، بۆیە دەوڵەمەندەکان قوتابخانەکەیان لە قوتابیەکان کڕییەوە و تێکیان داو سەر لە نوێ بە سامانی دەوڵەمەندەکان و دەست و بازوی هەژارەکان بەفراوانییەوە بنیات نرایەوە، بەڕادەیەك ژنێکی هەژار مێردەکەی لەگەڵ خۆی هینایە لای شێخ و پێی گوت: ئەمە مێردی منە و بیست دینار زێڕ مارەییم لە سەریەتی، ئەوا نیوەی لێخۆشبووم بە مەرجێ بایی نیوەکەی تر کار لە مزگەفتەکە بکا، پیاوەکە قایل بوو. واتە: ژنەکە هەموو پارەکەی لی خۆشبوو ئەگەر بەقەد دە دینار کار لە مزگەفتەکە بکات، شێخیش لە قوتابخانەکە کاری پێدەکرد و رۆژێ کرێی دەدایێ و رۆژێ نەیدەدایێ، چونکە دەیزانی هەژار و پێویستە بایی پێنج دینار کاری لە مزگەفتەکرد و شێخ لەویتر لێی بووری و ئیزنی دا.[1]

قوتابخانەکە لەساڵی ٥٢٨ ك تەواو بوو، شێخ کردیە دوو بەش، قوتابخانەیەك بۆ خوێندنی هەموو جۆرە زانستێك، تەکیەیەك بۆ دەروێشەکان، تێیدا دەنوون و دەخۆن و فێری پەروەردەی گیانی و ئاکاریی دەبن لەسەر دەستی شێخ و بە ڕابەرایەتیی ئەو، ئینجا لەوڵات بڵاودەبنەوە و شێخ چۆن ئەوانی پەروەردە کردووە ئەوانیش خەڵکی پەروەردە دەکەن و بەمجۆرە ڕێبازەکەی لە دنیا بڵاوبوویەوە. لە بەر

---

١ قلائد الجواهر، ص ٥.

ئەوەی گوتە و ئامۆژگاریەکانی دەچوونە ناخی دڵ و گیان و هۆشەکانەوە، بۆیە بە لێشاو خەڵکی بەسەردا دەباری، لەبەر ئەوەی گوتەکانی لەدڵێکی زانای دڵسۆزی کارا دەردەچوو، بۆیە لە کۆڕەکانی فرمێسك زۆر دەڕژا و دەنگی گریان بەرز دەبوویەوە. نزیکەی حەفتاهەزار کەس ئامادەی کۆڕەکانی دەبوون و جاری وا هەبوو ژمارەی مەرەکەب دانەکان دەگەیشتنە چوار سەد، سەرکەشە تۆبەکارەکان لەکۆڕەکانی زۆر بوون و ژمارەیان گەیشتە سەد هەزار تۆبەکار، هەروەها پێنج هەزار کافر و هاوبەش پەیداکەر (مشرك) لە سەر دەستی موسڵمانبوون.[1] خەڵك بەسواری ئەسپ و هێسترو کەرو حوشتر[2] بە شەو دەهاتنە کۆڕەکەی لە ژێر تیشکی مۆم و چرا، قوتابخانەکەی لە ساڵی ٥٢٨ کۆچییەوە پێی دەگوترا: قوتابخانەی شێخ عبدالقادر، ئێستاش هەر ماوە و بریتییە لە مزگەفتێك و کتێبخانە و تەکیە و کۆمەڵە ژوورێك، کە هەژار و رێبواران لێی دەحەوێنەوە.

---

١ قلائد الجواهر، ص ١٩.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣.

# بەشی یەکەم

# زانست و وانەکانی

بینیمان شێخ قورئان و تەفسیری خوێندووە، هەروەها فیقهی خوێنـدووە بە ڕێباز و جیاوازی و لـق و بنەماکانـەوە، ئـەدەب و ڕەوان بێـژی خوێنـدووە و گوێـی لـە فـەرمـوودە گرتـووە و گێڕاوێتیـەوە و زانستی تەریقـەتی وەرگرتـووە و خـەڵکیی پـێ پەروەردە کردووە، ئەمانەی هەموو لای کەڵەپیاوانی سـەردەمی خوێنـدووە لـەزانا و شەرعناس و فەرموودەناس و صۆفیەکان، وەکو: (ابي الوفاء) عـەلی کـوڕی عوقـەیل، قازی ئەبو سەعیدی موخەڕەمی و ئەبو زەکەریا یەحیا کوڕی عەلی تـەوریزی و ئـەبو غالیب محەممەد کوڕی حەسەنی باقلانی و ئەبو جەعفەری سەراج و حومـادی دەبـاس و هیتریش، بە جۆرێك، کە حافز عمادالدین کوڕی کـەثیر لەبارەیـەوە گوتوویـەتی: ((هاتـە بـەغدا و گوێـی لـە فـەرموودە گـرت و کـاری پێکـرد تـالێی بـووە بلیمـەت، دەستێکی باڵای هەبوو لە فـەرموودە و فیقـهو ئامۆژگـاری و زانستیی راستیەکان.. فەرمانی بە چاکە دەکرد و پێشگری لە خراپە دەکرد)).[1]

سەیر نییە کە لە دوای ئەمە گەلـێ زانستی دەزانی و وانەکانی جۆراو جۆر بوو، بە شێوەیـێ ئیبن رەجەب لە (طبقات الحنابلة) لەبارەی شێخەوە دەڵـێ: ((لـە سێزدە زانست قسەی دەکرد، قوتابیەکان وانەیەکی تەفسیری قورئان و وانەیەکی فەرموودە

---

١ سەرچاوەی پێشوو، ل ٨.

و وانەیەکی ڕێباز(مذهب)یان لەلا دەخوێند، لەسەر ڕێبازی شافیعی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فتوای دەدا، هەروەها وانەی جیاڕایی(خلاف) و ئسولْ و ڕێزمانیان لەلا دەخوێندو دوای نیوەڕۆیان بە جۆرە خوێندنەوەکان قورئانی دەخوێند))[1].

محەممەدی کوڕی حوسێنی موسڵی گوتوویەتی: ((گوێم لە باوکم بوو دەیگوت: شێخی گەورەمان عبدالقادر لە سێزدە زانست دەستی هەبوو، وانەی ڕێباز و جیاڕایی(خلاف) لە قوتابخانەکەی دەخوێندرا، بەیانی و ئێوارە ڕاڤەی قورئان و زانستەکانی حەدیس و ئوسولْ و ڕێزمان دەخوێندرا، دوای نیوەڕۆ بەخوێندنەوەکان قورئانی دەخوێند. عومەری بەزاز گوتوویەتی: فەتواکانی نیشانی زاناکانی عێراق دەدراو سەریان لێی سوڕدەما، شێخ عبدالرزاقی کوڕی گوتوویەتی: فتوایەك لە وڵاتی عەجەمەوە هاتە بەغدا و نیشانی زاناکانی عێراق دراو نەگەیشتە وەڵامێکی پڕ بەپێستی، ئەمەش کێشەکەیە: زانایەکان لە بارەی پیاوێك چ دەڵێن، کە سێ بە سێ تەڵاقی خواردووە بە جۆرێك خوا بپەرستێ، کە کەس نەیکردبێ، جا چ عیبادەتێك بکات، فتوامان بۆ بدەن خواپاداشتان بداتەوە؟ جا هێنایانە لای باوکم و یەکسەر بۆی نووسی: دەچێتە مەککەی پیرۆز و شوێنی تەوافی بۆ چۆڵ دەکرێ و حەفتەیەك تەواف دەکاو سوێندەکەی چاك دەبێتەوە؛ پیاوەکە شەوی لە بەغدا نەکردەوە و ڕووی لە شاری مەککە کرد-خوا پیرۆزی بکات))[2].

حافظ أبوالعباس ئەحمەدی بەندەنیجی گوتوویەتی: من و شێخ جمال الدینی کوڕی جوزی لە کۆڕی شێخ عبدالقادر ئامادە بووین، قورئان خوێنەکە ئایەتێکی خوێندەوە، شێخ لە ڕاڤەکردنی لایەنێکی دەرخست و بە شێخ جمال الدینم گوت: ئەم لایەنە دەزانی؟ گوتی: بەڵێ. دوایی لایەنێکی تری دیاری کرد و پێم گوت: ئایائەم لایەنەش دەزانی ؟ گوتی: بەڵی شێخ یازدە لایەنی ئایەتەکەی دیاریکرد و من پێم گوت: ئەم لایەنەش دەزانی ؟ گوتی: بەڵێ. ئینجا شێخ باسی لایەنێکی تری کرد

---

١ رجال الفكر والدعوة في الاسلام للندوي، ص ٢٥٨.

٢ قلائد الجواهر، ص ٣٨.

و پێم گوت: ئەم لایەنەش دەزانی؟ گوتی: نەخێر. تاوای لێهات باسی چل لایەنی کرد و هەموو بیرو بۆچوونەکانیش بۆ خاوەنەکانیانی دەگێڕایەوە، شێخ جمال الدین دەیگوت: ئەم لایەنە نازانم، سەری سوڕما لە فراوانیی زانستی شێخ عبدالقادر، ئینجا شێخ گوتی: واز لە گوتی دەهێنیین و بۆ حالْ دەگەڕێینەوە: لا إله الا الله محمد رســول الله، خەڵکەکە زۆر شلەژان و شێخ جمال الدیــن جل و بەرگی خۆی دڕاند))[1].

شێخە گەورەکان و کەڵە زاناکانی عێراق ئامادەی کۆڕەکانی شێخ دەبوون وەکو: عەلی کوڕی هیتی، بەقا کوڕی بەتۆ، موسا کوڕی ماهین (ماهان)، ئەبو نەجیبی سورەوەردی و برازاکەی شهاب الدین سورەوەردی، عوسمانی قورەیشـی و ئەبو عبداللهی محەممەدی قەزوینی و و عوسمانی بەتائیحی و قەزیبی ئەلبان و ئەحمەدی قەزوینی، عبدالقادری بەغدادیی و قازی أبو یعلی الفراء و ئەبو قاسمی ئەلبەزار و ئەبو بەکری موزەین.[2] و گەلێکی تر.

قوتابخانەکەی چەند شێخێکی تێدابوو، کە قوتابیی شێخ بوون و سەرپەرشتیی قوتابخانەکانیان دەکرد، لەوانە: ئەحمەدی کوڕی موبارەکی مەرقەعاتی، محەممەدی کوڕی فەتحی هیرەوی، بەڵام تەکیەکە قوتابیەکەی سەرپەرشتیی دەکرد، کە ناوی مەحمودی کوڕی عوسمانی کوڕی مەکاریمی نەعال بوو.[3]

## وانەکانی:

شێخ ڕۆژەکانی لە قوتابخانە دەبردە سەر و ڕۆژی هەینی بۆ مزگەفتێ دەچووە دەرەوە، بەیانیانی هەینی و ئێوارانی سێشەممە لە قوتابخانەکەی وانەیەکی گشتیی لە ئامۆژگاری و ڕێنمایی دەدا، بەیانی یەکشەممانیش لە تەکیەکەی، سی و سێ ساڵ

---

١ قلائد الجواهر، ص ٣٨.
٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢.
٣ کتێبی ( هکذا ظهر جیل صلاح الدین)، د. ماجید عورسانی گەیلانی، ل ٢٠٦.

لەسەر ئەمە بەردەوام بوو لە ٥٢٨ ك تـــا ٥٦١ ك.

ئەوانەی لـە جەنگی خاچپەرستان لەشام هەڵ دەهاتن دەهاتنـە قوتابخانەکـەی لەوێ فێر دەبوون و لەتەکیەکەی پـەروەردەدەکران و دوایـی وەکـو رابـەرو بانگبـەر دەگەڕانەوە ولاتەکەیان، بەناوبانگترینیان: (ابن نجا الواعـــظ)، راوێژکـاری صلاح الدیـن، حـــافظ الرهـاوی، موفـق الدیـن کـوڕی قودامـەی خـاوەنی (المغـني) ی راوێژکاری صلاح الدین، خزمەکەی حافظ عبدالغنی. هەر ساڵێ لە قوتابخانەکەی سێ هەزار کەس وانەی دەخوێند و لێی دەردەچـوو،[1] واتـا: لـەو ماوەیەی کـە شێخ وانەی لە قوتابخانەکەدا دەگوتەوە نزیکەی سەد هەزار کەس دەرچوو.

لەکاتی وانە گوتنەوەدا مینبەرێکی بەرزیان بۆ شێخ دادەنا، خەڵکەکە هەر چەندە گەلـێ زۆر بوون لە دوورو نزیك گوێیان لە دەنگی دەبوو.

هـەندێ جـار داوا لەشێخ دەکـرا، کـە لـە قوتابخانـەی (نظامیـــة)ی بـەغدا وانـە بلێتەوە، ئەو قوتابخانەیەی کە (نظام الملك) وەزیری سوڵتانی سـەلجوقی (ملـك شـاه) لە ٤٥٧ ك بنیاتی نابوو، ئەویش بەهۆی پێداگرتنـی خـەڵکی و لێپرسراوان دەچـوو، لـەبـەر دووریـی ڕێگاکـە بـە سـواری هێستر دەچـوو، هەرکـە دەگەیشـتە ئـەوێ زۆر بەڕێزەوە لەلایەن سەرپەرشتکاران و قوتابیەکانەوە پێشوازیی لـێ دەکرا.[2]

رۆژێکیان وانەیەکی دەگوتەوە لەبارەی قەزاو قەدەر، کە ئـەوەی لەلایـەن خـواوە نوسراوە هـەر دەبـێ بێتـە دی، ئـەوەی لەنزایـەکی دەمـاو دەمـەوە هـاتووە: ((خوایـە داوای رەتکردنـەوەی قـەزات لـێ ناکـەین، بـەڵام داوای نـەرم و نیـانیت لێدەکـەین لەودا)). لەو کاتەدا مـارێکی گـەورەی بەسـەردا بەربویـەوە، هـەر وەك بلێـی خـوای مەزن راستگۆیی ئیمانی تاقی دەکاتەوە، خەڵکەکە هەموو هەڵاتن، تەنیا ئەو لە جێی خۆی نەجوولایـەوە، ئینجـا مارەکـەش وازی لـێ هێنـا و وەکـو خەڵکەکـە چـووە

---

١ عبدالقادری گەیلانی، محەمەدی عەینی، دانە فەرەنسییەکە، ل ٧٧.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٦.

دەرەوە، کە لێیان پرسی، گوتی: ئایا ئەمەش جانەوەرێکی بچووك نییە، کە قەزاو قەدەر دەیجولێنێ.[1]

ئەم چیرۆکە چیرۆکێکی ترم بە بیر دێنێتەوە، کە لەم دەچێت و لەسەر وەزیر عون الدین ابی‌المظفر یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی هەبیرەی وەزیری (مقتفی لأمـــر الله) و کوڕەکەی (المستنجد بالله)-کە هاوچەرخی شێخ عبدالقادر بوو و لەساڵی ٥٦٠ کۆچی مردووە-بوو، لە پێشەکی کتێبی (الافصاح عن معاني الصحاح) هاتووە:

((ڕۆژێکیان ئەو وەزیرە لە کۆشکی خەلیفە لە تاج ئامادە دەبێ و پیاوانی دەوڵەتیش لەوێ دەبن بۆ نوێژ کردن لەسەر تەرمی میر ئیسماعیلی کوڕی موستەزهر، لە بنمیچی خانووەکەوە مارێکی گەورە دەکەوێتە سەر شانی وەزیر، ئەوەی لەوێ بوون هەموو هەڵاتن، یان لە جێگای خۆیان هەستان تەنیا وەزیر نەبێ، ئاوڕی لە مارەکە دایەوە سەیری کرد وا لەسەر قۆڵی یاری دەکا، هەتا کەوتە زەوی و پاسەوانەکان تاویان دایێ و کوشتیان، وەزیر هیچ خۆی تێك نەدا و جووڵەی نەکرد و لەقسەکانی خۆشی نەکەوت))[2].

شێخ عبدالقادرو ئەو شێخانەی یامەتیان دەدا کۆمەڵە زانستێکیان فێری قوتابیانی قوتابخانەکەی دەکرد و ژمارەیان دەگەیشتە سێزدە زانست، کتێبی (الغنیة لطالبي الحق) بۆ قوتابیەکانی دەخوێندەوە لە باتی زانستی پەرستنەکان و بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و کۆمەڵ و فەرمانکردن بەچاکە و نەهیکردن لە خراپە، هەروەها وانەی لێکدانەوەی قورئان و خوێندنەوکانی قورئان و فەرموودە و خیلاف و ئوسووڵ و ڕێزمان و ئەدەبی پێدەگوتن ... هەروەها وانەی تایبەتی لە ئامۆژگاری و ڕابەرێتی پێ دەگوتن و داوای دوورکەوتنەوەی دەکرد لە فەلسەفە و زانستی کەلام، هانی دەدەن کە فیقهو صۆفیگەریی سوننی لەگەل یەکتری کۆبکەنەوە و زۆر جاران لەوانەکانی دەیگوت: ((هەموو حەقیقەتێ ئەگەر شەریعەتی شایەتی بۆ نەدا زەندیقە،

١ الطبقات الکبری للشعراني، ج ١، ص ١٢٦ / قلائد الجواهر، ص ٣٤.

٢ کتاب الافصاح لأبن هبیرة، ج ١، ص ٢٠.

بەدوو باڵی قورئان و فەرمووده بەرەو پەروەردگاری مەزن بفڕە))[1].

لەوانەکانیدا رەخنەی لە دژایەتیی زاناکان دەگرت و هەروەها رەخنەی لە زۆر و ستەمی فەرمانڕەوایەکان و قرچۆکی و دەست بلاویی دەوڵەمەندەکان دەگرت و دەیگوت ((ئەی ناپاکانی زانست و کردەوە، ئەی نەیارانی خواو پێغەمبەرەکەی، چەند دووروویی لەبەردەم پاشاو فەرمانڕەوایان دەکەن بۆ چڵوچێوی دنیا و چێژ و ئارەزووەکانی. ئێوەو زۆربەی پاشاکان لەم کاتەدا زۆردارو ناپاکن لەماڵی خوا بۆ بەندەکانی، خوایە قەپۆزی دوورووەکان بشکێنە و شەرمەزاریان بکە یا تۆبەیان لێ وەربگرە، خوایە زۆردارەکان سەرکوت بکەو زەوییان لێ پاك بکەوە یا خۆ چاکیان بکە ... ئامین))[2].

شێخ لە وانەکانیدا دژی گروپە گومڕاکان دەوەستا و هەوڵی دەدا رێبازەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت یەك بخات و لەسەر هەردوو مەزهەبی شافیعی و حەنبەلی فتوای دەداو گوێی بە هیچ نەدەدا، تا ئیمامی نەوەوی لەبارەیەوە گوتوویەتی ((عبدالقادر شێخی شافیعیە بەرزەکان و حەنبەلییە بەڕێزەکان بوو)).

شێخ (رەحمەتی خوای لێبێ) وانەکانی بەناوی خواو سوپاسکردنی خوا دەست پێدەکرد و بەم ئایەتە کۆتاییی پێ دەهێنا ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾.

لە یەکێ لە وانە ئامۆژگاریەکانیدا دەڵێ: ((ئەی رۆڵە، هیوات کورت بکەوە، سووربوونت کەمکەوە، نوێژی ماڵ ئاوایی بکە، دەبێ موسڵمانکە نووست راسپاردەکەی لە ژێر سەری نووسراوبێ، ئەگەر خوا بەئاگای هێنا شتێکی پیرۆزە، ئەگەرنا کەس و کاری سوود لە راسپاردەکەی وەردەگرن لە دوای مردنی و خێری بۆ دەنێرن، ئەگەر خواردت وەکو یەکێ بێ ماڵ ئاوایی بکا، گەر بەبرا دەرەکانت گەیشتی وەکو یەکێ بێ ماڵ ئاوایی بکا، لە ناو دڵت ئەم وشەیە ئامادە بکە: من ماڵ

---

١ الفتح الربانی، المجلس : ٤٤.

٢ الفتح الربانی، المجلس: ٥١.

ئاوایی دەکەم. یەکێ چۆن وانەی بێ کە کارو باری لە دەست خۆی نەبێ ...
پابەندبە بەو پەیامەی کە پێغەمبەرﷺ هێناویتی کە قورئان و فەرموودەیە، ئەوەی
وازیان لی بێنێ دەبێتە زەندیق و لە چوارچێوەی ئیسلام دەردەچێ ... خواپەرستی
وازهێنانە لە نەریت، پەیوەندیتان لەگەڵ دنیا و ڕۆژی بەپابوونەوە و خەڵك بپچڕێنن
و تەنیا بەخواوە پابەند بن، خۆتان بەگەورە مەزانن چونکە خوا بینایە.. خۆتان
بپارێزن لە هاوبەشی پەیداکردنی ئەسڵ و گوناه لە لقەکاندا، ئینجا بەقورئان و
فەرموودە پەیوەست بن و دەستی خۆتانی لێ مەکەنەوە))[1].

ئەمەش نموونەیەکی لێکدانەوەی شێخە بۆ قورئانی پیرۆز:

((لێکدانەوەی - بسم الله الرحمن الرحیم - ئەبوبەکری وەڕاق گوتوویەتی بسم
الله: گوڵزارێکە لە گوڵزارەکانی بەهەشت، هەر پیتێکی لێکدانەوەیەکی تایبەتی
هەیە: دەنگی (ب) لەسەر شەش ڕووە: (باريء): ئەفراندنەکەی لە عەرشە تا زەوی،
بەیانەکەی ((هو الخالق الباريء))، (بصير) بینایە بە خولقێنراوەکانی لە عەرش تا
زەوی، بەیانەکەی ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾، (باسط رزقه) ڕۆزییەکەی لە عەرش
تا زەوییە، بەیانەکەی ﴿ اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ﴾، (باق) لە ماندایە
دوای نەمانی عەرش تا زەوی، بەیانەکەی ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ
ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴾، (باعث الخلق) دوای مردن خەڵکی زیندوو دەکاتەوە لە
عەرش تا زەوی بۆ سزاو پاداشت، بەیانەکەی ﴿وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي الْقُبُورِ﴾،
(بارٌّ) چاکە لەگەڵ بڕواداران دەکا لە عەرش تازەوی، بەیانەکەی
﴿هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ﴾.

.. الرحمن الرحيم: گوتراوە بە واتایەك دێن کە بەرەحم و دڵسۆزە،
هەردووکیان لە سیفەتەکانی خودن. هەروەها گوتراوە، بە واتای سزا نەدانی ئەوانە

[1] الفتح الرباني، المجلس / ٦٢، ص ٢٨٦ و لەدوای ئەو.

دێن کە شایانی سزان و ناردنی خێرە بۆ ئەوەی شایانی نییە، ئەمانەش هەردوو کیان لە سیفەتەکانی کارن، هەندێکیان گوتوویانە: (الرحمن) بۆ لە رادەبەرییە، واتا: ئەوەی کە رەحمەتەکەی هەموو شتێ دادەپۆشێ، (الرحیم): لە پلەی (الرحمن) دانییە و نزمترە. هەندێکیش گوتوویانە: (الرحمن) دڵسۆزە بۆ هەموو خولقێنراوەکانی لە گاور و بڕوادار، چاك و خراپیان، چونکە هەموویانی خولقاندووە و رۆزیی پێداون ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖ﴾، الرحیم: دڵسۆزە بە بڕواداران و تایبەتە بە رێنمایی و سەرکەوتن لە دنیا و بە بەهەشت و بینینی خوا لە رۆژی بە پابوونەوە؛ ﴿وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا﴾. (الرحمن) وشەکەی تایبەتە و واتاکەی گشتییە، (الرحیم) وشەکەی گشتییە و واتاکەی تایبەتییە. (الرحمن) تایبەتە چونکە جگە لە خوا نابێ کەس ئەم ناوەی لێ بنرێت، گشتییە چونکە هەموو بونەوەر رێك دەگرێتەوە لە رێگەی خولقاندن و رۆزیدان و سوود گەیاندن و زیان لادان. (الرحیم) گشتییە لە رووی ئەوەی کە خولقێنراوەکانیش لە ناو لێنان پێی هاوبەشن، تایبەتە لە رێگەی واتاوە چونکە بۆ سۆز و سەرکەوتن دەگەرێتەوە، ئیبن عەباس فەرموویەتی: دوو ناوی وردن، یەکێکیان لەویتر وردترە ...)).[1]

---

١ الغنية، ج ١، ص ١١٢.

# بەشی دووەم

# بیروباوەڕی

بیروباوەڕی شێخ عبدالقادر پەیڕەویکردنی بێ بیدعەیە، پابەند بوونە بە قورئان وفەرموودە لە هەموو حاڵێ. زۆر جاران لە کۆڕ و وانەکانی، لە دوان و ئامۆژگاریەکانی لە کتێب و راسپاردەکانی ئەمەی‌دووبارە دەکردەوە. ((بە هاوڕێیەکانی دەگوت: پەیرەوی بکەن و بەرەو بیدعە مەچوون، گوێڕایەڵ بن و هەوڵ مەگەڕێنەوە، ئارام بگرن و زوێر مەبن، چاوەنواڕی بکەن و نائومێد مەبن)).[1]

هەروەها دەیگوت ((ئەی رۆڵە، هاورێیەتیکردنی پیاو خراپانت دەتخاتە بەد گومانی بە چاکان، لە ژێر سایەی کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی بڕۆ مسۆگەر سەر دەکەوی[2])). ((پێویستە لە سەرتان پەیرەوی بکەن بە بێ بیدعەکردن، پێویستە لە سەر رێبازی پێشینە چاکەکان بن، لەسەر شەقامە راستەکەبڕۆن، بڕوا بە لێچوون و دواخستن (تعطیل) مەهێنن، بێ زۆر لە خۆکردن و بەگرانی وەرگرتن و گاڵتەکردن پەیرەویی سوننەتی پێغەمبەرﷺ بکەن دەتان گرێتە خۆو بەهاناتانەوە دێ هەروەك بە هانای ئەوانی پێش ئێوە هاتووە، حەیفە قورئان ئەزبەر دەکەیت و کاری پێ ناکەیت، بۆچی وادەکەیت ؟ فەرمان بەخەڵکی دەکەیت و خۆت واز ناهێنی)).[3]

---

١ طبقات الكبرى للشعراني، ص ١٢٩.

٢ الفتح الرباني، المجلس: ٤.

٣ الفتح الرباني، المجلس: ١٠.

((تا پەیڕەوی کتێب و فەرمووده نەکەی سەر ناکەوی، پەیڕەویی ئەو شێخە زایانە بکە کە کار بە کتێب و فەرمووده دەکەن یا گومانی چاکیان پێ ببە و لێیان فێربە و هەڵس و کەوتیان بە چاکی لەگەل بکە و بەرامبەریان بە ئەدەب بە، بەم جۆرە سەردەکەوی، ئەگەر پەیڕەویی قورئان و حەدیس نەکەی و گوێ لەو شێخانە نەگری کە شارەزان بە هیچ جۆرێ سەرناکەوی. گوێت لێ نەبووە: ئەوەی هەر بە گوێی خۆی بکات گومڕا دەبێت)). [1]

((بیدعەو شتی تازە لە ئاینی خوا پەیدا مەکە، پەیڕەوی هەردوو شایەتە راستەکە بکە کە قورئان و فەرموودەن چونکە ئەوانە دەتگەیەننە خوای مەزن، بەڵام ئەگەر بیدعەچی بیت و هۆش و ئارەزووت شایەتت بن بێگومان بەرەو ئاگرت دەبەن دەتگەیەننە فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان، رەخنە لە قەدەر مەگرە چونکە لێت قەبوولْ ناکرێ، پێویستە بچیتە خانەی زانست و فێربوون ئینجا بەدڵسۆزییەوە کاری پێ بکەی)) [2].

((ئەگەر شێێ هاتە دڵتەوە کە پیاوێکت خۆشبوێ و رقت لە یەکێ ببێتەوە، بەسروست ئارەزووی نەفست ئەمە مەکە، بەڵکو قورئان و فەرموودە بکە دادپەروەر لە نێولنتان، ئەگەر بە خۆشەویستییەکە قایل بوون بەردەوام بە لەسەری، ئەگەر پێی رازی نەبوون وەرچەرخێوە لێی، هەروەها ئەگەر قورئان و حەدیس رازی بوون بەوەی رقت لێی دەبێتەوە وازی لێ بێنە و رقت لێی نەبێتەوە، ئەگەر پێی رازی نەبوون بەردەوام بە لەرق لێبوونەوەت، ئەگەر نەتتوانی سوود لەمە وەربگری و هیچت بۆ روون نەبوویەوە بەرەو دڵی پیاو چاکان برۆ و لەبارەیانەوە بپرسەلێیان، چونکە بڕوادار بە نووری خوا دەبینێ)) [3].

((ئەم زانست و قورئانە ئەگەر کاریان پێ نەکەن دەبنە بەڵگە لەسەرتان، ئەگەر

---

١ سەرچاوەی پێشوو، المجلس: ٣٩.

٢ الفتح الرباني، المجلس: ٤٧.

٣ سەرچاوەی پێشوو، المجلس: ٥٩.

چوونە لای زانایان و قسەکانتان وەرنەگرت ئەوا ئامادە بوون نەکەتان دەبێتە بەڵگە و شایەت لە سەرتان و تاوانێکتان لەسەر دەنووسرێ، هەروەکو ئەوەیە بچینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هیچی لێ وەرنەگرن))[1].

شێخی پێشرەو شەهاب و دینی ئەبوحەفس عومەری کوڕی محەممەدی سووڕەوەردی گوتوویەتی: گوێم لە شێخ عبدالقادر بوو لە قوتابخانەکەی لەسەر کەرسی دەیگوت: هەموو وەلییەك لەسەر پێی پێغەمبەرێکە، منیش لەسەر پێی باپیرم محەممەدم ﷺ، محەممەد ﷺ هەر پێیەکی هەڵبگرتبێ من پێم لە جێی ئەو پێیە داناوە، تەنیا پێی پێغەمبەرایەتی هیچ کەسێ نایگاتێ ئەگەر پێغەمبەر نەبێت))[2].

## یەکخواپەرستیی:

شێخ عبدالقادر لە گوتەو کردەوەکانی یەکخواپەرستێکی دڵسۆز بوو و دەیگوت: ((دەرمانی یەکخواپەرستیی خوا لەدڵە نەك تەنیا بەزمان))[3]. ((بنچینەی کارەکە ئیسلامە ئینجا بڕوایە و ئینجا کارەکانە بەکتێبی خوا و شەریعەتی پێغەمبەر ﷺ ئینجا دڵسۆزییە لەکارەکە لەگەل بە یەکتا زانینی دڵ لەکاتی بڕوا تەواویدا، بڕوادار لە هەموو شتێ فانییە جگە لەخوا))[4].

((پلە و پایەی بەندە لە ئیسلامەوە بەرەو بڕوا بەرز دەبێتەوە و لە بڕوایشەوە بەرەو دڵنیایی، لە دڵنیایییەوەبەرەو ناسین، لە ناسینەوە بەرەو زانین، لە زانینەوە بەرەو خۆشەویستی، لە خۆشەویستییەوە بەرەو دولبەر، لە داوایەکەی بەرەو داواکراوەکەی، لەو کاتەدا ئەگەر غافڵ بوو بە ئاگا دەهێنرێتەوە، ئەگەر لەبیری چوو بەبیری دەهێنرێتەوە، ئەگەر خەوی لێکەوت هەڵ دەستێنرێتەوە، بەردەوام بێگەردو بەئاگایە چونکە جامی دڵی بێگەردە و لەدەرەوە ناوەوەی لێ دیارە، بەئاگایی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ بەجێماوە، چونکە پێغەمبەر چاوی دەنووست بەڵام

---

١ الفتح الرباني، المجلس: ٥.

٢ الفيوضات الربانية، اسماعيل بن محمد القادري، ص ٧٠.

٣ الفتح الرباني، المجلس: ١٣.

٤ سەرچاوەی پێشوو، المجلس: ٢٢.

دڵی نه دەنووست، دواوەی خۆی دەبینی هەروەك پێشەوەی دەبینی، هەموو کەسێ بەئاگاییەکەی بەقەد حاڵەکەیەتی)).[1]

((خوای گەورە بەیەك بزانن و لەبەردەرگاکەی مەبزوون، داوا لەو بکەن و لەکەسی تر داوا مەکەن، پشت بەو ببەستن و بەکەسی تر مەبەستن، ((**مَــنْ شَــغَلَهُ ذِكْرِي عَنْ مَسْأَلَتِي أعطَيتُهُ أفضَلَ مَا أُعطِيَ السَّائِلِين**: ئەوەی لەبەر خەریکبوونی بەیاد کردنم داوای لێ نەکردم، لەوانەی چاکتر دەدەمێ کە داوایان لێکردووم.)).[2]

((یەکخواپەرستە چاکەکان بەڵگەی خوان لە سەر خولقێنراوەکانی تر..ئازا ئەو کەسەیە جگە لەخوا دڵی لە هەمووشت پاك دەکاتەوە.. شەرع دەرەوە پاك دەکاتەوە، یەکخواپەرستی و ناسین هەناو پاك دەکاتەوە))[3].

((لە دیار و نادیارت لە ئارەزوو نەفست فانی بە، بالەنادیارتا جگە لەبە یەکزانینی خوا هیچی تری تێدا نەبێ و لە دیاریشت جگە لە گوێڕایەڵی و پەرستنی خوا لە فەرمانەو نەهیەکانی چیی تێدا نەبێت))[4].

لە راسپاردەکەی بۆ عبدالوهابی کوڕی گوتوویەتی: ((پێویستە لەسەرت لە خوا بترسی و گوێڕایەڵی بی، لەکەس مەترسەو تکای لێ مەکە، هەموو پێویستییەك بۆ خوا دەگەڕێتەوە و داوا لەو بکە، جگە لە خوا بەقات بەس نەبێ و هەر متمانە لەسەر ئەو بکە، یەکخواپەرستی، یەکخواپەرستی، یەکخواپەرستی، کۆکەرەوەی هەموان یەکخواپەرستی)).[5]

لەبارەی بەڵگەی بەیەك زانینی خواوە دەڵێت ((مرۆڤی ژیر یەکەم جار سەیری سیفەتی نەفسی خۆی پێکهاتەکەی خۆی دەکا، ئینجا سەیری هەموو خولقێنراوەکان دەکاو دەبنە بەڵگە لەسەر داهێنەرەکەیان، توانای مەزنی داهێنەر

---

١ الفتح الرباني، المجلس: ٤٥.

٢ سەرچاوەی پێشوو، المجلس: ٤٧.

٣ الفتح الرباني، المجلس: ١٣.

٤ فتوح الغيب، المقالة: ٦٠.

٥ الفتح الرباني، ص ٣٧٣.

بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا، هەموو شتی بەخواوە بوونی هەیە، لـەواتای ئەمـەدا ئیبن عەباسﷺ لە بارەی ئایەتی ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴾ گوتوویەتی: لەهەموو شتێ ناوێ لـەناوەکانی هەیـە و نـاوی هـەموو شتێ لـە نـاوی ئەوەوەیـە، هـەتا تـۆش لـە نێـوان نـاوو سـیفەت و کردەوەکـانی خـوای، نادیـارە بەتواناکەی، دیارە بە حیکمەتەکەی، دیارە بەسیفەتەکانی، نادیارە بەخودی، خودی بەسیفەتەکان داپۆشیوە، سیفەتەکانی بـەکردەوکانی داپۆشیوە، زانستی بەویست دەرخستووە، ویستی بـە جـووڵان دیـاریکردووە، کـارو ئیحسـانی نـهێنیکردووە، دروستکردنی بەویست دیاریکردووە، ئەو نادیارە لە غەیبی و دیـارە لـە حیکمـەت و توانای، هیچ شتێ بەو ناچێ و گوێگرو بینایە)).[1]

هەروەها دەیگوت ((پەروەردگاری مەزن تاك و تەنیایە و پێویستی بەکەس نییـە و کەسی لـی نەبووە و لەکەس نەبووە و کەس بەو ناچێ و شێوەی نییە و هاوتای نییـە، تەن نییە دەستی بدرێتێ و گەوهەر نییە هەستی پێ بکرێ، ڕەنـگ نییـە لـەناو دەچـێ، دانـا و پێکهاتـەی نییـە، تـاکێکی پەرستراوە، زینـدووە ونـامرێ، هەمیشـەییەو لـەناو ناچێ، مەلەکوتی هەتاهەتاییە، جەبەرووتی بێ کۆتاییە ... ئاگاداری هـەموو شتێکە ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ﴾، خـەڵك و کردەوەکـانی خولقاندووە، ڕۆزی و ئاکامیان خـەملاندووە ... خـوای گـەورە زینـدووە بـەژیان و زانایە بە زانست و توانایە بە توانست وشت خوازە بەویست و گوێگـرە بـە بیسـتن، بینایە بە چاو، هەستیارە بە هەست، قسەکەرە بە وشە، فەرماندەرە بـە فـەرمان، نـەهی کەرە بەنەهی ...)).[2]

---

١ فتوح الغيب، المقالة ك ٧٤.

٢ الغنية، ج ١، ص ٥٤.

# کێشەی سیفەتەکان:

ئیبن رەجەب لە (طبقـــات الحنابلـــة) دا دەڵـێ ((شێخ عبدالقـادر لـە کێشـەی سیفەتەکان و قەدەر و ئەوانیتر زۆر بە سوننەت پابەند بوو بـەتوندی وەڵامـی ئەوانـەی دەدایەوە کە لەمانە دژی سوننەتبوون))[1].

شێخ دەیگوت: ((لێکچوون(تشبیه) نییە و لەکارخستن(تعطیل) نییە و بەجەستە بوون(تجسم) نییـە))، بەمجۆرە دژی بـە جەسـتە بـوون وەستا، کـە هـەندێ لـە زانایـە حەنبەلییەکانی پێ تاوانبار کرابوو، هەر ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی خـەڵکی لێـیان بتەکێتەوە، بەمجۆرە سەرلەنوێ رێبازی حەنبەلیی زیندوو کردەوە و دیمەنە جوانەکەی پێشووی بۆ گێڕایەوە.

رەحمـەتی خـوای لێبـێ دەیگـوت: ((دەبـێ سیفەتی (ئیسـتیوا) بـێ تـەئویل لێـك بدرێتەوە، چونکە ئیستیوا بوونی خود(ذات) لەسەر عەرش، نابێ بە شێوەی دانیشتن و دەستلێدان بێت هەروەکو (مجسمة و کرامیـة)کـان دەیـانگوت، ناشبێ بـە واتـای بەرزبوونەوە بێ هەر وەکو ئەشعەرییەکان دەیـانگوت، نابـێ بـە واتـای دەسـەڵات بـە سـەرداگرتن و زاڵبـوون بێ، هـەروەکو موعتەزیلـەکان دەیـانگوت، چونکـە شـەرع باسی شتی وای نەکردووە و کـەس لـە یـاران و شـوێنکەوتوان و پێشـینە چاکـەکانی نەبیسـتووە، ئەوانـەی خـاوەنی فـەرموودە بـوون، بـەڵکو ئـەوەی لـەوان بیسـتراوە بـە شێوەی رەهابووە. لە ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبـەرﷺ دەگێڕنـەوە، کـە لـە بـارەی ئایەتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ گوتویەتی: ((چۆنیەتی ناشایستەیە، ئیستیوا نادیـار نییـە، بڕوا پێـهێنانی پێویستە، بڕوا پـێ نـەهێنانی کوفـرە، موسـلیمی کـوڕی حـەجاج لـە-صحیـح ەکـەیدا ئەمـەی داوەتـە پـاڵ پێغەمبـەرﷺ، ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەل پێش مردنی بە کەمێ گوتی: دەنگو باسی سیفەتەکان هەر وەکو خـۆی، کـە

---

[1] الذیل علی طبقات الحنابلة تحت رقم: ١٣٤.

هاتووە بەبێ لێکچوون و لەکارخستن(تعطیل) تێدەپەڕێ... لە سیفەتەکانی خوای گەورە ناگوترێ: چۆن، بۆچی؛ تەنیا ئەو کەسەی گومانی هەبێ قسەی وا دەکات))[1].

## قەزاوقەدەر :

رازیبوون بە قەزاو قەدەری چاك و خراپ لە بنەماکانی ئیمانە، بۆیە شێخ هانی یارانی دەدا کە قایل بن بە قەزاو قەدەر دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر، دەیگوت: ((دەبێ هەربڕواداری لە هەموو حاڵەتێکدا سێ شتی هەبێ: بەپێی فەرمانی هەڵس وکەوت بکا و دووربکەوێتەوە لەوەی نەهی لێدەکرێ و بەقەدەر رازی بێت))[2].

لەبارەی خۆیەوە، کە هەموو کاروبارەکانی داوەتە دەست خوا دەڵێ: ((خۆی وەکو منداڵێکی شیرەخۆرە لەدەست دایەنەکەی، وەکو مردوێکە لەدەست مردوو شۆرەکە، وەکو تۆپێکە لەبەر دار قاشۆی سوار.. کەس نابینێ خوای خۆی نەبێ، هەر گوێی لەوە و پابەندە بەو، چێژی لە نیعمەتەکانی وەرگرتووەو بەختیارە بە نزیکیی و دڵخۆش و ئارامە بە بەڵێنی و هۆگریی و تەکانێتی و پەنای بۆ یادکردنەوەی بردووە و متمانەی پێی هەیە و پشتی بەو بەستاوە، بەروناکیی ناسینی رێنوینیی کردووە))[3].

هەروەها دەڵێ: ((پێویستە بڕوا بە قەدەری چاك و خراپ و قەزای تاڵ و شیرین بهێندرێ، ئەوەی توشی بووە بە خۆپاراستن لێی رزگار نەدەبوو، ئەوەی بەچەند هۆکارێ لەکیسی چووە بە هەوڵدان بۆی نەدەبوو، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ ئەگەر ناخۆشییەکت لەلایەن خواوە تووش بوو هەر ئەو دەتوانێ لای بەرێ، گەربیەوێ چاکەیەکت پێ بگەیەنێ کەس ناتوانێ رەتی

---

١ الغنیة، ج ١، ص ٥٦ و دوای ئەو.

٢ فتوح / الغیب: المقالة الاولی.

٣ سەرچاوەی پێشوو: گوتاری سێیەم.

بکاتەوە، خوای گەورە هەر کەسێکی بیەوێ خێری پێ دەگەیەنێت.﴾))[1].

دیسان شێخ فەرموویەتی: ((ئەوەی لەسەرت نووسراوە لەسەری مەوەستە، چونکە ئەوەی نووسیوێتی هەر ئەو دەتوانێ لای بەرێ؛ ﴿يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ : لەناوبردن و هێلانەوە بەستە بە ویستی خودا و ماکی هەمو کتێبانیش وا لای ئەوە.﴾[2]، ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ : خوا لە کردەوەکانی لێی ناپرسرێت، بەڵکو بەندەکان لێیان دەپرسرێتەوە.﴾[3] هەمیشە گوێڕایەڵ بەو لەخوا بترسەو ئاگات لەخۆت بێت تامردن دەتگاتێ و بەسەلامەتی لە دنیا بەرەو ڕۆژی بەپابوونەوە دەپەڕیتەوە، ئەوکاتە لە گۆڕان و گۆڕانکاری دڵنیا دەبیت))[4].

دژایەتی لە نێوان ئەم دوو گوتەیەی شێخدا نییە، ئەوشتەی لە زانستی هەمیشەیی خوادا بڕیار دراوە، ڕەش ناکرێتەوە و هەر دەبێ ڕووبدات، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمە لە ئێمە بزرەو زانینی ئێمە پەی پێ نابات، بۆیە دەبێ هەوڵ و کۆشش بکەین و کەمترخەم نەبین، خوای گەورە گەر بیەوێ شتێ ڕەش بکاتەوە، لەوانە ڕەش دەکاتەوە، کە لە دەفتەری فریشتەکان نووسراوە، گەر وانەبێ نزاو پاڕانەوەمان هیچ سوودێکی نابێت.

لەبارەی گوتەی شێخ عبدالقادر ((نازعت أقدار الحق بالحق للحق: ململانێی حەقەکانی خوام بەحەق و بۆ خوا کرد)) لەشێخ ئیبن تەیمیەیان پرسی، وەڵامی دایەوە: هەموو ڕووداوەکان بە قەزاو قەدەری خوا دانراون، خوای گەورە فەرمانی پێکردووین، کە بەپێی توانا خراپە بە چاکە لابەرین، کوفر بەئیمان و بیدعە بە سوننەت و گوناە بەخوا پەرستی لابەرین، هەرکەسێ کوفر بکا، یا بەدکاری بکا، یا گوناە بکاو هەرچەندە ئەمانە بەقەدەری خوایە، دەبێ پەشیمان بێتەوە.. نابێ مرۆڤ

---

١ يونس / ١٠٧، الغنية، ج ١، ص ٦٥.

٢ الرعد /٣٩. ٣ الانبياء / ٢٣. ٤ الفتح الرباني، / المجلس: ٥٢.

پشت لەکۆششکردن بکاو پشت بەخوا ببەستێ بۆ ئەوەی سوودێکی پێ بگەیەنێ، بەڵکو دەبێ بەگوێرەی فەرموودەکانی خواو پێغەمبەرﷺ بێت. هەروەك موسلیم لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ((**الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَلاَ تَعْجَزْ وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ**: بڕواداری بەهێز چاکتر و خۆشەویستره لای خوا لە بڕواداری بێ هێز و لاواز، خێر و چاکەش لە هەموویانە، سوور بە لەسەر ئەوشتەی سوودت پێدەگەیەنێ، پشت بەخوا ببەستە و نائومێد مەبە، گەر شتێکت تووش بوو مەڵێ: گەر وام بکردایە ئاوا و ئاوا دەبوو، چونکە وشەی ئەگەر کلیلی کردنەوەی کاری شەیتانە.)) هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی ((**إنَّ الدُّعَاءَ والبَلاَءَ لَيَلْتَقِيَانِ فَيَعْتَلِجَانِ بَيْنَ السَّمَاءِ والأرضِ**: پاڕانەوەو بەڵا بەیەکتری دەگەن لە نێوان زەوی و ئاسمان باوەش لەیەك دەدەن و دەکەونە جەنگەوە.)) ئەمەش لەبابەتی ئەوەیە، کە ئەو خراپەیەی تەقدیر کراوە، بەو چاکەیەی تەقدیر کراوە لابەردرێ، ئەوەی شێخ عبدالقادر باسیکردووە ئەو شتەیە، کە خواو پێغەمبەر فەرمانیان پێی کردووە. خوای گەورە فەرمانی پێ نەکردووین ئێمە بەبێبڕوایی و بەدکاری و گوناە قایل بین، لەم ڕووەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((**مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ**: هەر کەسێ لە ئێوە خراپەیەکی دی بابەدەست لای بەرێ، گەر نەیتوانی بە زمان، گەر نەیتوانی بە دڵی، ئەمەیان نیشانەی ئیمان کزییە.))[1].

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ: خوا بەدکاریی خۆش ناوێت.﴾، ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ : خوا بێبڕوایی بۆ بەندەکانی ناوێت.﴾، کەواتە ئەوەی لە خراپە تەقدیر کراوە دەتوانرێ بەچاکە پێشی لێ بگیرێ، هەروەك

---

[1] موسلیم گێڕاویتیەوە ( رياض الصالحين رقم ١٨٤).

خواو پێغەمبەر فەرمانیان پێکردووە و دەبێتە هۆی چاکە و لە خوا ترسان و خێرو پاداشت – خواش زاناترە)). کۆتایی هات.[1]

## پشت بەخوابەستن وکارکردن :

بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتیە لە: ببەستەوە ئینجا پشت بە خوا ببەستە، کاربکە و پشت بە خوای مەزن ببەستە. لەبەر ئەمە شێخ عبدالقادر لە هەموو حاڵ و کردەوەیەکدا پشتی بە خوا دەبەست لەگەڵ ئەمەش هەوڵ و کۆششی دەداو عەیبی لە تەمبەڵ و تەوەڵەکان دەگرت و بۆ کار و کۆشش هانی دەدان، چونکە هەمووشتێ ئاسانکراوە بۆ ئەو مەبەستەی بۆی خولقاوە، جورجانی پێناسەی پشت بەستن بەخوای کردووەو دەڵێ: ((پشت بەستن بەخوا بەقا پێکردنە بەوەی لای خوا هەیە و نائومێد بوونە لەوەی لەدەست خەڵکییە)).

شێخ عبدالقادر دەڵێ: ((پێویستە کۆشش بکەیت و خۆبە هۆکار ببەستیەوە، تا ئیمانت بەتین دەبێ، ئینجا لە هۆکارەوە بڕۆ بۆ خاوەنی هۆ (خوا)، پێغەمبەران لەسەرەتای کارەکانیاندا کار و کۆششیان دەکرد و پارەیان قەرز دەکردو خۆیان بەهۆیەکانەوە دەبەستەوە، ئنجا پشتیان بە خوا دەبەست، بەمجۆرە کارکردن و پشت بەستن بەخوایان لەگەڵ یەکتری کۆ دەکردەوە لەسەرەتاو کۆتایی، لە شەریعەت و حەقیقەت))[2].

شێخ هانی کۆشش و کارکردنی دەداو دەیگوت: ((خوای مەزن بپەرستن، بۆ پەرستنەکەی هانابەرنە بەر کاسبی حەڵاڵ، خوای گەورە بەندەیەکی بڕواداری گوێڕایەڵی حەڵاڵ خۆری خۆشدەوێ، یەکێکی خۆشدەوێ دەخوا و کاردەکا، رقی لە یەکێکە دەخوا و کار ناکا، یەکێکی خۆشدەوێت لە کارو کۆششەکەی بخوات، رقی لە یەکی دەبێتەوە کە بەدوڕویی و پشت بەستن بەخەڵك نان دەخوا))[3].

---

١ كتاب القدير لأبن تيمية، ج ٨، ص ٥٤٧ – لە فتواكان.

٢ الفتح الرباني: المجلس: ٢٨.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦.

((پێتان دەڵێم هەوڵ بدەن و کۆشش بکەن خۆ بە پێشینە مەبەستنەوە، چونکە بەڵگەی تەمبەڵەکانە، ئێمە هۆکارەکان بەیەکەوە دەبەستینەوە و هەوڵ دەدەین و کار دەکەین، ناڵێین: گوتی و گوتیان، بۆچی و چۆن، ناچینە ناو زانستی خوا، ئێمە کۆشش دەکەین و ئەویش (خوا) ئەوەی بیەوێت دەیکات))[1].

لە ڕێگەی خوای مەزن هەوڵدەو پشت بە قەدەری مەبەستەو لێی پاڵ مەدەوە، گوێت لە خوا نەبووە چۆن فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا: ئەوانەی لە هەوڵ و کۆششدان بۆ گەیشتنە ئێمە، ڕێگای خۆمانیان پێ نیشان دەدەین.﴾[2].

هەروەها دەڵێت: ((مادام لەگەڵ خەڵك دای و داوای چاکە و بەخششی ئەوان دەکەی و لەوان داوا دەکەی و هات و چۆی بەر دەرگای ئەوان دەکەی، ئەوا تۆ هاوبەشیت بۆ خوا و خلقێنراوەکەی پەیداکردووەو بەوە سزات دەدات کەبێ بەشت دەکا لەو حەڵاڵەی کەبە هۆی هەوڵ و کۆششەوە بەدەست دەکەوێت))[3].

شێخ گوتویەتی: ((پیاوێك لێی پرسیم: چ شتێ بەندە لەخوای مەزن نزیك دەکاتەوە؟ گوتم: بۆ ئەمە سەرەتا و کۆتایی هەیە، سەرەتاکەی وەرعە و کۆتاییەکەی ڕەزاو خۆدانە دەست و پشت بەستن بەخوایە))[4].

## خۆپاریزی «الورع»:

شێخ عبدالقادر ڕەحمەتی خوای لێ بێ بەدرێژایی تەمەنی بە وەرعەوە پابەند بوو، بینیمان بۆ شەو نوێژ هەڵدەستایەوە و نزای دەکردو ملی کەچ دەکرد، هەروەها بینیمان ئەگەر دەستنوێژی بشکابایە یەکسەر تازەی دەکردەوە و خۆپارێزیی دەکرد

---

١ الفتح الرباني: المجلس: ٥٢.

٢ العنکبوت: ٦٩ / سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٥.

٣ فتوح الغيب / المقالة: ١٦.

٤ سەرچاوەی پێشوو، گوتاری: ٤٧.

لەوەرگرتنی دیاری و بەخششی خەلیفە و میرەکان چونکە گومانی زەفتکردن و زۆرو ستەمی لیّ دەکرا.

عەلی کوڕی محەمەدی جورجانی لە پێناسەی وەرعدا دەڵێ: ((بریتیە لە دوور کەوتنەوە لەگومان لێکراوەکان لەترسی نەکەوتنە ناو حەرامەوە)).

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**إِنَّ الْحَلاَلَ بَيِّنٌ وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ، فَمَنْ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمىً، أَلاَ وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ**: حەلاڵ دیاریە و حەرام دیاریە، لە نێوانیاندا چەند شتێکی گومان لێکراو هەیە، کە زۆربەی خەڵك نایان زانن، ئەوەی خۆ پارێزی لەوانە بکات پاکانەی بۆ ئاین و ناموسی خۆی کردووە، ئەوەی بکەویتە ناو گومان لێکراوەکانەوە کەوتۆتە ناو حەرامەوە، وەکو شوانێکە لەدەم پاوانێ پەز بلەوەڕێنێ و بکەوێتە ناویەوە، هەموو پاشایێ شتی وای هەیە، کەنابێ خەڵکی لیّی نزیك ببنەوە، شتە پارێزراوەکەی خواش حەرامەکانە، کە نابێ تخونی بکەون، لەلەشی مرۆڤدا پارچە گۆشتێ هەیە گەر ئەو چاکبوو هەموو لەش چاك دەبێ، گەر خراپیش بوو هەموو لەش خراپ دەبێ، ئەویش دڵە.))[1].

هەروەها دەفەرمووێ: ((**لاَ يَبْلُغُ الْعَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنْ الْمُتَّقِينَ حَتَّى يَدَعَ مَا لاَ بَأْسَ بِهِ حَذَرًا مِمَا بِهِ الْبَأْسُ**: هیچ بەندەیێ ناگاتە ئەورادەیەی، کە پێی بگوترێ خواناسی تەواو، تا واز لە هەندێ شتی بێگومان بهێنێ لەترسی ئەوەی نەکەوێتە ناو گوماندارەوە.))[2].

---

١ متفق عليه. جامع الاصول، ج ١٠، ص ١٧٩، رقم ٧٦٧٤.

٢ حديث حسن، رواه الترمذي وابن ماجه: سەرچاوەی پێشوو، ب ٤، ل ٦٨٢، ژمارە ٢٧٩١.

شێخ عبدالقادر لە هەموو حاڵەتەکانی ژیانیدا عەزیمەتی هەبوو، لـە کـاتی خۆیـدا سوننەتەکانی زۆر دەکرد.

شێخ عبدالقـادر لـە بـارەی خۆپـارێزیی(وەرع)ەوە فەرموویـەتی: ((خۆپـارێزی ئاماژەیە بۆ وەستان لە هەموو شتێ و نەکردنیەتی تەنیا بە مۆڵەتی شەرع نەبێ، ئەگـەر بینی شەرع رێی داوە کارێکی ئاساییە دەیکـا، گـەرنا وازی لــێ دێنـێ، خۆ پـارێزی سێ پلەی هەیە: خۆ پارێزیی خەڵکی رەمـەکی: بریتیـە لـە خـۆ پاراستن لـە حـەرام و گومـان لێکـراو، خــۆ پــارێزیی تایبەتـەکان: خــۆ پاراستنە لـە هـەموو ئـارەزوو و حـەزەکانی نـەفس، خۆ پارێزیی تایبـەتی تایبەتەکان: خۆپاراســتنە لــە هـەموو ئـەو شتانەی، کە ویستیان تێدا هەیە. خۆ پارێزی دوو جۆرە: دیار: ئەوەیە، کە بەندە تەنیا بەخوا بجوڵێتەوە، نادیار: ئەوەیە، کە جگە لە خـوا هیـچ نەچێتـە نـاو دڵتـەوە، ئـەوەی ئاگاداریی وردە خۆپارێزی نەکا پاداشتە گرانبەهایەکانی بـۆ نابێ. زوهـد سـەرەتای وەرعە، هەروەك چاوتێری(قناعــة) رێگـەی رەزایـە، حەسـەنی بـەصری فەرمویـەتی: گەردیلەیێ لەوەرع-خۆ پارێزی چاکترە لە هەزار گەردیلەی نوێژو رۆژوو))[1].

((هەرکەسێ بیـەوێ بگاتـە پلـەی (وەرع) دەبـێ دە (١٠) شـت لـە سـەر خـۆی پێویست بکات:

یەکەم: زمان پاراستن لە غەیبەت.
دووەم: دوورکەوتنەوە لە بەد گومانی.
سێیەم: دوورکەوتنەوە لە گاڵتەکردن بەخەڵك.
چوارەم: چاوگرتن لە حەرامەکان.
پێنجەم: راستگۆیی.
شەشەم: منەتی خوا لەسەر خۆی بزانێ بۆ ئەوەی لەخۆی بایی نەبێ.
حەفتەم: سامانەکەی لەحەق خەرج بکات نەك لە پڕو پووچ.
هەشتەم: داوای پایەبەرزی و گەورەیی بۆ خۆی نەکا.
نۆیەم: پارێزگاریی نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا بکا.

---

١ قلائد الجواهر، ص ٦٤ / الغنية ١/ ١٣٠.

دەیەم: بەردەوامبوون لەسەر سوننەت و جەماعەت))[1].

((یادکردن(ذکر) کلیلی لە خواترسان(تقوی) و خۆ پارێزیی(وەرع)ـە، لەخوا ترسان دەرگای رۆژی بەپابوونەوە(الآخـــرة)یە، هەروەك هەوای نەفس دەرگای دنیایە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ: چی تێدایە لە بیری مەکەن، بەڵکو خۆپارێز بن.﴾[2].

((ئەدەبی هەژار ئەوەیە نابێ دەست کورتیەکەی ببێتە هۆی واز هێنان لە خۆپارێزی و لەو سنورە دەرنەچێ، کە شەرع پێی قایل نەبێ، چونکە ئەو کاتە لە عەزیمەت دەردەچێ و بەرەو ماوەدان(رخصة) دەڕوا، خۆپارێزی بەدەستهێنانی ئاینە و تەماح لە ناوچوونێتی، چوونە ناو گومان لێکراوەکان تێکچونێتی، هەروەك هەندێ پیاوچاکان گوتوویانە: هەر کەسێ لە هەژاریەکەیدا وەرعی لەگەڵ نەبێ؛ بێ ئەوەی بزانێ حەرامی خواردووە))[3].

((ئەبو بەکری سدیقﷺ فەرموویەتی: ئێمە وازمان لە حەفتا لایەنی حەلاڵی دەهێنا لەترسی ئەوەی نەکەوینە گوناهەوە.. هەروەها عومەری کوڕی خەتاب فەرموویەتی: ئێمە نۆ لە سەر دەی حەلاڵمان جێدەهێشت لەترسی ئەوەی نەکەوینە حەرامەوە.. بەجۆرە مەترسی لە کارکردنی روخسەتدراو دایە، سەلامەتیی تەواو لەگەڵ عەزیمەت دایە، خوای گەورە نیشاندەری رێگەی ڕاستە))[4].

شێخ عبدالقادر فەرموویەتی: ((عەزیمەتتان هەبێ و واز لە رێدان(رخصـــة) بێنن، ئەوەی پەنای بردەبەر رێدان و وازی لە عەزیمەت هێنا ئاینەکەی مەترسیی لە ناوچوونی لەسەرە، خۆگرتن بۆ پیاوانە چونکە لە ڕێدان زەحەتتر و تاڵترە، رێدان بۆ ژن و منداڵانە، چونکە ئاسانترە))[5].

---

١ الغنية ٢ / ١٣٤.

٢ البقرة: ٦٣ / الغنية، ج ١، ص ١٠١.

٣ الغنية ٢ / ١٧٤.

٤ فتوح الغيب: المقالة: ٣٥.

٥ الفتح الرباني: المجلس: ٦١.

((هەر کەسێ بێ خۆپارێزی(ورع) بلێ خوام خۆش دەوێ؛ ئەو کەسە درۆزنە، هەر کەسێ بێ بەخشینی سامان بلێ بەهەشتم دەوێ؛ ئەو کەسە درۆزنە، ئەوەی بێ خۆشویستنی هەژار و هەژاران بلێ پێغەمبەرم خۆش دەوێ؛ ئەو کەسە درۆزنە، ئەو کەسە بەچاوی سەر دنیا دەبینی و بە چاوی دڵ رۆژی دوایی دەبینێ و بەچاوی نهێنی خوا دەبینی، لەگەڵ خەڵکی بۆ پارێزگاریی ئەدەبی خۆت دەنگت لەسەر دەنگیان بەرز ناکەیتەوە، کەچی بە گوناە بەگژ خوادا دەچی و دژایەتیی کردەوەکانی دەکەی، ئا ئەمە بۆ تۆ زۆر ناشیرنە))[1].

((خوای گەورە فەرمانت پێ دەکا، کە لە سروشتی خۆت دەربچیو رێدانی شەرعی بخەیتە شوێنی، ئینجا بەرە بەرە فەرمانت پێ دەکا کە واز لە لە رێدان(رخصة) بهێنی و هەموو کردەوەکانت ببێتە عەزیمەت، ئەگەر ئارامت لەسەر عەزیمەت گرت خۆشەویستیی خوا دێتە دڵتەوە، گەر خۆشەویستییەکە شوێنی خۆی کردەوە لە لایەن خواوە پشتگیریت بۆ دێت))[2].

شێخ عبدالقادر سوننەتەکانی وەکو فەرزەکان حسێب دەکرد لە پابەند بوون پێیانەوە بۆ ئەوەی ببێتە یەکێ لەوانەی خوا خۆشیانی دەوێ و خوایان خۆش دەوێ، بۆیە دەیگوت: ((بڕوادار بە جێبەجێکردنی فەرزەکان لە خوا نزیك دەبێتەوە و بە سوننەتەکان خۆشی دەوێ، هەندێ بەندەی خوا هەن سوننەتیان نیە، بەڵکە فەرزەکان بەجێ دێنن، پاشانیش سوننەتەکان دەکەن، ئەوانە لە سەرمان پێویستن بۆ ئەوەی توانامان بەسەریاندا بشکێتەوە، هەتا هەتایە پێویستە لەسەرمان لە خواپەرستی بەردەوام بین))[3].

---

١ الفتح الرباني: المجلس: ٦٢، ل ٣٥٣.

٢ الفتح الرباني، ص ٣٣٧.

٣ سەرچاوەی پێشوو، کۆڕ: ٥٩.

## فەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپە:

ئەمە لـە گرنگترین سیفەتە کانی پێغەمبـەر و پـەیامدار و چاکخوازە کانـە، ئەمـە لـە بـەرە کانی بیروبـاوەڕی ئیسـلامییە، بـێ ئەمـە میللـەت بۆگـەن دەبـێ و کۆمـەڵگا دەڕووخێ، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ : ئێوە بوونـە چاکـترین میللـەت، فـەرمان بە چاکـە دە کەن و نەهی لە خراپە دە کەن و بڕوا بەخوا دەهێنن.))[1]

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنْ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلاَ يُسْتَجَابُ لَكُمْ**: سوێند بەو خوایەی، کە گیانی منی لە دەستە دەبێ فـەرمان بـە چاکـە بکـەن و نەهی لە خراپە بکەن، بە پێچەوانەوە خوای گەورە سزایە کتان دەنێرێتـە سـەر، ئینجا لێی دەپاڕێنەوە و نزاکانتان گیرا نابێت.))[2].

ژیانی شێخ عبدالقادر رەحمەتی خوای لێبـێ هەمووی فەرمان بەچاکـەو نـەهی لـە خراپە بوو، تا وەفاتکردنی، لەدوان(خطبـة) و وانـە کانی هەمیشـە فـەرمانی بـە چاکـە دە کرد و نەهیی لەخراپە دە کرد، هەروەها لە کتێب و راسپاردە کانیدا هـەر بـەجۆرە بوو، بینیمان چۆن لەدوانی هەینی قسەی لە گەڵ خەلیفە (المقتضی لأمـــر الله) کرد هەر کە یەحیا کوڕی سەعیدی کردە قازی، کە بە (ابن المرجـــم) بە ناوبـانگ بـوو، پێی گوت: زۆردارتریـن زۆردارت کردۆتـە قـازیی موسـڵمانان، بـەیانی لای خـوای مەزن وەڵامت چی دەبێت، دوای ئەمە خەلیفە لایبرد.

هەروەها گلەییی لە (المستنجد بـــالله) دە کـرد، چونکـە سامانی موسـڵمانە کانی

---

١ آل عمران / ١١٠.

٢ فەرموودەیە کی (حسن)ە و ترمذی گێڕاویێتیەوە (ریاض الصالحین) ژمارە / ١٩٣.

زەفت کردبوو، دیاریەکانی وەرنەدەگرت، سەرزەنشتی دەوڵەمەندەکانی دەکرد لەبەر قرچۆکییان و دەست بڵاوییان، چونکە ماڵی خۆیان بۆ گوێڕایەڵیکردنی خوا خەرج نەدەکرد، گلەیی لە زانا بەدەکان دەکرد لەسەر دووڕوو و خواردنی سامانی خەڵکی بە ناحەق، هەروەها گلەیی لێدەکردن چونکە لەسەر چڵ و چێوی دنیا دژایەتیی یەکتریان دەکرد، تا موسڵمانانیان کردە چەند پارت و گروپێك.

شێخ عبدالقادر دەڵێت: فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە دوو ئەرکن لەسەر هەموو موسڵمانێکی ئازادی ئەرکبار(مکلف)ی زانا بە فەرمانەکە پێویستن، بەمەرجێ فەرمانکردنەکە نەبێتە هۆی ئاژاوەیەکی گەورە و زیان بەخشین بە خۆی و سامان و خاووخێزانی.. ئەگەر خراپەکە ئاشکرا نەبوو پێویست ناکا ئاشکرا بکرێ، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾، تەنیا ئەوەی دیارە پێویستە هەوڵی لابردنی بدرێ... ئەگەر ئەوەی نەهی لە خراپە دەکا بێگومان بوو لەوەی، کە زیانی پێ دەگا-ئایا فەرمانکردنەکە پێویستە؟ لەلای ئێمە پێویستەو چاکترە ئەگەر ئارامگر و خاوەن عەزیمەت بێت، ئەوە وەکو جیهادە لە دژی بێبڕوایاندا لە پێناو خوا، خوای گەورە لە چیرۆکی لوقماندا فەرموویەتی: ﴿وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا أَصَابَكَ : فەرمان بە چاکە بکە و نەهی لە خراپە بکەو ئارامگرە لەسەر ئەوەی، کە لەم ڕێگەیەدا تووشت دەبێت.﴾.

ئەوەی فەرمانی پێدەکرێ و نەهی لێدەکرێ دوو جۆرە: هەرچی لەگەڵ قورئان و فەرموودە و ژێر گونجا ئەوە چاکەیە، هەرچی دژایەتی کرد ئەوە خراپەیە، ئەوەش دەبێتە دوو بەش: یەکەمیان دیارەو خەڵکی ڕەمەکی و تایبەتی دەیزانن، وەکو: پێویستبوونی پێنج نوێژەکان و ڕۆژووی ڕەمەزان و زەکات و حەج و... هیتر، هەروەها وەکو: حەرامبوونی زینا و مەیخواردنەوە و دزی و سو(ریبا) و زەفت کردن و هیتر، ئەم بەشەیان دەبێ هەوڵی لاچوونی بدرێ، جا خەڵکی ڕەمەکی بێ یا تایبەت بێ. دووەمیان: تەنیا تایبەتەکان دەیزانن وەکو: بیرو بۆچوونی لەسەر ئەوشتانەی کە بۆ خوا دەشێ یان ناشێ، ئەمە دەبێ لەلایەن زانایان هەوڵی لابردنی

بدرێ ... بەڵام ئەگەر شتەکە لەوانەبوو، کە زانایان بۆ چوونی جیاوازیان لەسەری هەبوو وەکو: مارەبڕینی ژنێ بە بێ دەمڕاست(ولي)، نابێ هیچ کەسێ لەرێبازەکان قەدەغەی بکات، چونکە (مرووزی) لە ئیمام ئەحمەد دەگێڕتەوە: ((نابێ شەرعناس(فقیه) وا لە خەڵکی بکا، کە هەر لەسەر رێبازەکەی ئەوبن، نابێ کاریان قورس بکات))[1]. تەواو بوو.

## جیهاد:

عەلی کوڕی محەممەدی جورجانی بەم شێوەیە پێناسەی جیهاد دەکا: ((جیهاد بانگهێشت کردنی ئایینی حەقە)).

جیهاد لە پێناو خوا بە جەنگ و کوشتن دەبێ، هەروەها لە پێناو خوا بە گوتن و قسەش دەبێ، فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە جۆرە جیهادێکە، پێش ئەمە و ئەوە جیهادێکی تر هەیە، کە جیهادی نەفس و چاکردن و پاککردنەوەیەتی بۆ ئەوەی ئەو نەفسە شایستەبێ بۆ جیهادی بێبڕوا و گومڕاکان. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ: جەنگی هەموو هاوبەش پەیداکەران بکە، هەروەك لەدژتان دەجەنگن، چاك بزانن، کە خوا لەگەل تەقوادارەکان دایە.﴾[2].

ئەبوذەڕ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: گوتم ئەی ئەی پێغەمبەری خوا کامە کردەوە لە هەموویان چاکترە ؟ فەرمووی: ((**الإِيمَانُ بِاللَّهِ وَالْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ**: گوتی: بڕواهێنان بەخواو جیهاد لە ڕێگەی ئەودا.))[3].

شێخ عبدالقادر یەکەم جار هەموو ژیانی خۆی لە جیهادی نەفسی بەسەر برد، ئینجا لە جیهاد کردنی سەرکەش و گومڕا و بەدکار و بێبڕواکان بەڕێگەی

---

١ الغنية ١/ ٥٠ دوای ئەمە.    ٢ التوبة / ٣٦.

٣ متفق عليه. (رياض الصالحين) رقم ١٢٨٥.

ئامۆژگاری و ڕێنمایی کردن و فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە، سەیری بکە دەڵێت: ((خوای گەورە سوودی خەڵکی لە من بینی، زیاتر لە پێنج هەزار جوولەکەو دیان لەسەر دەستم موسڵمان بوون و زیاتر لەسەد هەزار کەس لە (بەرەڵا و چەتە و ڕێگر و پیاوخراپان) لەسەر دەستم تۆبەیان کردووە، ئەمەش چاکەیەکی زۆرە))[1].

شێخ قسەی هەقی لە پێش خەلیفە و سەرکردە و میرەکان دەکردو لە پێناو خوا لە سەرزەنشتی کەس نەدەترسا، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ ((**أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةَ حَقٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ**: چاکترین جیهاد گوتنی وتەیەکی حەقە لای دەسەڵاتدارێکی زۆردار.))[2].

شێخ گرنگیەکی زۆری بە جیهادی نەفس و چاکردنی و پاککردنەوەی دەدا، چونکە بنچینەی هەموو جیهادێکە و بێ ئەو هیچ جیهادێ سەرناکەوێ.

قوتابخانە و تەکیەکەی زۆر بە سەنتەری مەشقکردن و چاکسازی دەچوو، قوتابی و موریدەکانی تێدا مەشق دەکرا، نەفسیانی پاك دەکردەوە و چاکیانی دەکرد، پەیوەندییەکی قووڵی ئاینی و گیانی لە نێوان خۆی و ئەواندا دروستکردبوو، پەیمان و بەڵێنێکی بەتینی لە نێوان خۆی و ئەوانەدا بەستبوو، ئینجا مۆڵەتی بە زۆریان دەدا بە تایبەتی ئەوانەی، کە هەڵکەوتوو و خۆگرو بە توانا بوون لەسەر پەروەردەکردن و ڕێنمایی کردن، ئیتر ئەوانە لەخاکی خوا بڵاو دەبوونەوە و داوای خەڵکییان بۆ خوا دەکردو نەفسەکانیان پەروەردە دەکرد و دژایەتیی هاوبەشپەرستی و بیدعە و نەزانین و دووروویيان دەکرد، خەلیفە و قوتابیەکانی شێخ فەزڵێکی زۆریان هەبوو لەسەر پارێزگاریکردنی گیانی ئیسلام و ڕووناکیی ئیمان و گەرم و گوڕی بانگەوازیی و جیهاد کردن، ئەگەر ئەوانە نەبوانە ماددەپەرستەکان ئەم میللەتەیان قووت دەدا. هەروەها فەزڵێکی گەورەیان هەبوو لەسەر بڵاوکردنەوەی ئیسلام لەو وڵاتە

---

[1] القلائد الجواهر، ص ١٩.

[2] نەسائی گێڕاویەتیەوە بە پاڵپشتێکی ڕاست.

دوورانەی، کە سوپای ئیسلامی نەگەیشتێ وەکو هیند و ئەندۆنیسیا و چین و ئیفریقیا و دوورگەکانی زەریای هیندی. هەروەها دەستێکی بالآیان لە موسڵمانبوونی هۆزەکانی مەغۆل و تەتەر[1] هەبوو.[2]

پەیوەندی لە نێوان شێخ عبدالقادر و نورالدین زەنکی[3] (رەحمەتی خوایان لێبێ) لە نێوان سالآنی (٥٤١ و ٥٦٩ ك.) فەرمانڕەوایی کردووە، بەتین بوو، نورالدین کوڕی ئەوانەی لە شاری قودسەوە کۆچیان دەکرد دەیناردنە بەغدا بۆ ئەوەی لە قوتابخانەی شێخ عبدالقادر بخوێنن و دوایی وەکو سەرکردە و بانگەوازکار و رابەر، بگەڕێنەوە شوێنە سنووریەکەیان. هەروەها نورالدین گەلێ لەو زانا بەناوبانگانەی، کە لە قوتابخانەی قادری دەرچوو بوون گرنگییەکی زۆری پێ دەدان و دەسەلآتی گەورەی پێ دەبەخشین، وەکو: قطب الدین نەیسابوری و کوڕی شێخ (أبي نجيب الأكبر) و شرف الدين عبدالمؤمن کوڕی شوردە.[4]

هەروەها حامید کوڕی مەحمودی حەڕانی، کە یەکێ لە قوتابیەکانی شێخ عبدالقادر بوو دوای ئەوەی خوێندنەکەی لە بەغدا تەواو کرد چووە دیمەشق و نورالدین لەقازیاتی و سەندنەوەی حەق و وانەگوتنەوە دایمەزراند لە (حەڕان) تا مردنی لە سالی ٥٧٠ کۆچی.

هەروەها یەکێ لە قوتابیەکانی شێخ، عەلی کوڕی بەرداون کوڕی زەیدی کیندی بەشێکی گەورەی لای نورالدین (رەحمەتی خوای لێبێ) هەبوو.[5]

لەوانە زین الدین عەلی کوڕی ئیبراهیم کوڕی نەجای دیمەشقی، کە لە قوتابخانەی شێخ لە بەغدا خوێندبووی، ئینجا گەڕایەوە میسر و دیمەشق، بووە

---

١ رجال الفكر والدعوة في الاسلام، ابو حسن الندوي، ص ٢٨٢ دوای ئەو بەدەستکاریەوە.
٢ سەیری کتێبی الدعوة الى الإسلام Preaching Islam ی تۆماس ئارنۆلدی ئینگلیزی بکە.
٣ هكذا ظهر جيل صلاح الدين، د. ماجد عرسان الگيلاني، ص ٢٤٠ ودوای ئەوە.
٤ کتێبي الروضتين ی ئەبو شامەو مرآة الزمان ی سبت کوڕی جەوزی.
٥ ذيل طبقات الحنابلة، ابن رحب ٢:٣١٣ .

راوێژکاری سەلاحەدینی ئەییوبی، کە ناوی لێنابوو عەمری کوڕی عاس، هەر کە سەلاحەدینی ئەییوبی دوای جەنگی (حطـــین) لە ساڵی ٥٨٣ ك، شاری قودسی رزگار کرد، هەندێ لە زانایانی وەکو ئیبن نەجا و موفق الدینی کوڕی قودامە و محەممەدی برای و ئیبن زەکی شافعی لەگەڵ بوو، لەو ڕۆژەدا ئیبن زەکی وتاری هەینی خوێندەوە و دوای نوێژ سەلاحەدین داوای لە ئیبن نەجای قادریی حەنبەلی کرد، کە دەست بە ئامۆژگاریکردن بکات، ئەویش وتارێکی کاریگەری داو خەم و پەژارەکانی پێ سووك بوو و دڵەکانی پێ نەرم بوو و فرمێسك ڕژا.[1]

نورالدین، لە دوای ئەویش صلاح الدین توانیان موسڵمانانی عێراق لە خاچییەکانی میسر و شام بپارێزن، بەڵام هەڕەشە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەستی پێکرد، هێزێکی گێژی زۆردار بەرەبەرە خۆی کۆ کردەوە و توانای خستە بەر خۆی، وەکو گڕکان تەقیەوە و وەکو لافاو هێرشی هێناو هەرچی لە پێش بوو کاولی کردو تێکی دا. خوای گەورە ئیلهامی خستە دڵی شێخ عبدالقادرەوە، کە هەست بەو مەترسیە بکاو لە یەکێ لەوانەکانیدا گوتی: ((دەنگو باسێکم بۆ هاتووە، کە دوورنییە بەڵایی ئەم شارە بگرێتەوە، ئینجا داوای لێیان کرد، کە بەرگری بکەن و راویان بنێن، گوتی: بە گیانی خۆم هەندێ لەم شارە هەنە، کە شایانی کوشتن و هەڵواسینن، بەڵام چاوهەیە ریزی هەزار چاوی هەیە، بەهۆی ئەوانەوە لەناو دەچین ! گوناهیان دەمانگرێتەوە ! ئێمە چیمان کردووە !))[2].

کارەساتەکە لەساڵی ٦٥٦ك. روویدا، واتا: دوای کەمتر لە سەد ساڵ لەوەفاتی شێخ عبدالقادر لە (٥٦١ ك.)، تەتەرەکان بە سەرکردایەتیی هۆلاکۆ هێرشیان کردە سەر وڵاتی ئیسلامی بە تایبەتی ئێران و عێراق، لەوانەش شاری بەغدا و خیلافەتیان لە ناو برد و ملیۆنێ مرۆڤیان کوشت و وڵاتیان تاڵان و کاول کردو تەنیا کەلاوەی تێدامایەوە.

---

١ كتاب الروضتين في اخبار الدولتين ٢:١٠٩.

٢ الفتح الرباني، المجلس ٦٢، ٣٢٦.

شێخ دەیگوت: ((جیهاد دوو جۆرە: دیارو نادیار، نادیار جیهادی نەفس و ئارەزوو و سروشت و شەیتان و تۆبەکردنە لەگوناهو خلیسکان و خۆگرتنە لەو تۆبەیە و وازهێنانە لە ئارەزوو و هەموو شتێکی حەرام. جیهادی دیاریش: جەنگانە لەدژی بێبڕوا و سەرڕەقەکانی خواو پێغەمبەری خواو بەرگەگرتنی ئازاری شیر و ڕم و تیرەکانیانە، دەکوژن و دەکوژرێن. جیهادی نادیار لە دیار قورسترە، چونکە شتێکی بەردەوام و دووبارەیە.. ئەوەی لە هەردوو جیهادەکە دا بەپێی فەرمانی خوا بجولێتەوە لە دنیا و ڕۆژی بەپابوونەوە پاداشتی دەدرێتێ. برینەکانی لەشی شەهید وەکو خوێن بەردانە لەدەستی یەکێکتان، هەست بە ئازار ناکات، مردن بۆ ئەو کەسەی جیهادی نەفسی خۆی دەکاو لەگوناهەکانی پەشیمان دەبێتەوە، وەکو تێنوێکە ئاوی سارد بخواتەوە))[1].

هەروەها دەڵێ: ((دژایەتیکردنی شەیتان نادیارە، بەدڵ و دەروون و ئیمانە، جا ئەگەر دژایەتیکردنی شەیتانت کرد خوا پشتیوانت دەبێ و متمانەت لەسەر ئەو دەبێ، بە ئومێدی بینینی رووی شکۆ و گەشاوەی ئەوی. جیهادی بێبڕوایان جیهادێکی دیارە و بە شیرو رمە، پاشاو پیاو ماقوولان پشتیوانتن و ئومێدیشت چوونە بەهەشتە، گەر شەهید بووی پاداشتت نەمرییە لە خانووی مان، گەر لە دژایەتیی شەیتان دا مردی ئەوا پاداشتت بینینی رووی خوای جیهانیانە لەکاتی بەیەك گەیشتنندا))[2].

شێخ لە ڕێگەی خوا لەکەس نەدەترسا بۆیە دەیگوت: ((من حەقتان پێ دەڵێم، لێتان ناترسم و تکاتان لێ ناکەم، ئێوە و خەڵکی ئەم زەویە لەلام وەکو مێشوولە و مێرولەی وردن، چونکە زیان و سوود لەلای خواوەیە نەك ئێوە، پاشاو گەدا لای من یەکسانن)).[3] هەروەها دەفەرمووێ: ((ئەگەر بەندە خوای ناسی خەڵکیی لە بەردڵی دەکەوێ، وەکو گەلای وشك پەرت دەبن، لەبینینیان کوێر دەبێ و لە

---

١ الفتح الرباني: المجلس:١٨.

٢ الغنية، ج ١، ص ١٠٣.

٣ الفتح الرباني: المجلس: ٥١.

٤ الفتح الرباني: المجلس: ٥٦.

قسەکانیان کەر دەبێ))[1].

## پەشیمان بونەوە و داوای لێبوردن کردن

خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێ، کە تەوبەکارن و داوای لێبوردنی لێدەکەن، چونکە ئەم سیفەتە بەندایەتیی مرۆڤ بۆ خوا دەچەسپێنێ، هەروەها دانانی مرۆڤە بەخوایەتی خوای مەزن بۆ هەموو خولقێنراوێ. بۆیە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ ((**وَاللهِ إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَـــرَّةً:** سوێند بەخوا من رۆژی حەفتا جار زێتر داوای لێبووردن لە خـوا دەکـەم و پەشیمان دەبمەوە.))[2].

تۆبە یەکەم رێگەی خواویستانە، بۆیێ شێخ عبدالقادر زۆر هانی تۆبەکردن دەداو دەرگاکانی بۆ هەموو کەسێ دەکاتەوە، ئەبو حەسەنی نەدوی دەڵێت: ((پیاوێك لە بەغدا پەیدا بوو، کە خاوەن کەسێتی و بڕوا و زانست و بانگەوازیی و کاریگەریەکی بەتین بوو، ئەویش شێخ عبدالقادر بوو، دووبارە بانگەوازیی ئیمان و ئیسلامی راستەقینە و بەندایەتی بێگەردی نوێکردەوە، لەگەڵ دووڕوویيدا کەوتە جەنگەوە و هەردوو لای دەرگای بەیعەو تۆبەکردنی خستە سەر گازی پشت و موسڵمانان لێی دەچوونە ژوورەوە و پەیمان و بەڵێنیان لەگەڵ خوا نوێ دەکردەوە، شێخ بە بەردەوامی پەروەردەی دەکردن و لێی دەپرسینەوە و سەرپەرشتیی دەکردن، تا دوای بەیعەو تۆبەو نوێکردنەوەی بڕوایان هەستیان بە لێپرسینەوە دەکرد))[3].

بەڵام فەلسەفەی تۆبەکردن لای شێخ عبدالقادر بەم گوتەیەی راڤە دەکات:

((راستی تۆبە لەزماندا گەڕانەوەیە، تۆبەکردن گەڕانەوەیە لەو کارانەی، کە لەشەرعدا ناپەسەندن و بۆ ئەوانەی کە لەشەرعدا پەسەندن، هەروەها ئاگاداری و

---

٢ رواه البخاري: جامع الاصول، ج ٤، ص ٣٨٧ / رقم ٢٤٤٤.

٣ رجال الفكر والدعوة في الاسلام، ص ٢٨٢.

زانینە کە گوناهو سەرپێچیەکان خەڵکی لەناو دەبەن و لەخوا و بەهەشتەکەی دووریان دەکەنەوە. تۆبەی راستی ئەوەیە کە بێگەردبێ و بەتەواوی بۆ خوا بێ، خڵت و خاری تێدا نەبێ، وشەی (نصوح) لە (نصاح) وەرگیراوە کە داوە (تاڵە دەزوو)، واتا تۆبەیە کە دوور لەهەموو شتێ، پەیوەندیی بەهیچ شتێکەوە نیە و هیچ شتێکیش پەیوەندیی پێوەنییە.. بەکۆی رای زانایانی ئوممەت تۆبە کردن لەهەموو گوناهێ پێویستە و ناکرێ کەسی لێ بەدەربێ ... هەموو پێویستییان بە تۆبەکردن هەیە، بەڵام لە چەندێتیی جیاوازن، تۆبەکردنی خەڵکی رەمەکی لەگوناهەکانە، تۆبەکردنی تایبەتەکان لە خافڵە تییە، تۆبەکردنی تایبەتی تایبەتەکان لە خەریکبوونی دڵە جگە لە خوای مەزن.. هەتا پێغەمبەرەکانیش سەلامی خوایان لێ بێ وازیان لە تۆبەکردن نەهێناوە، وەکو:

حەزرەتی ئادەم: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ: ئەوسا ئادەم چەند بێژەیەکی لە خوای خۆی وەرگرت و گوتیەوە و خوای گەورە تۆبەکەی وەرگرت چونکە هەر ئەو تۆبە وەرگرو لێبوردەیە.﴾[1]

حەزرەتی نوح: ﴿رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ: خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم کە داوای هەندێ شتت لێ بکەم و زانیاریم لە بارەیانەوە نەبێ، جا ئەگەر لێم نەبووری و بەزەییت پێمدا نەیەتەوە دەممە یەکێ لە بێ زیانباران.﴾[2]

حەزرەتی ئیبراهیم: ﴿وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ : هیوادارم لە رۆژی بەپابوونەوە دا لە هەڵە و تاوانەکانم ببووری.﴾[3]

حەزرەتی موسا: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ: خوایە لە خۆم و براکەم خۆشبە و بمانخە ناو بەزەیی خۆتەوە، چونکە تۆ لە هەموو

---

١ البقرة / ٣٧.
٢ هود / ٤٧.
٣ الشعراء / ٨٢.
٤ الاعراف / ١٥١.

بوونەوەرێ بە بەزەیی تری.﴾[1]

حەزرەتی داود: ﴿فَغَفَرْنَا لَهُ ذَٰلِكَ وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَآبٍ: جا لەو هەڵەی ئەو خۆشبووین، بەڕاستی لای ئێمە پلەی بەرزە و دوارۆژی چاکی هەیە.﴾..[2][3]

لەبەر ئەوە لە نزای پێغەمبەرەوە هاتووە، کە دەبێ هەموو کەسێ بەیانی و ئێوارە بیلێتەوە؛ ((**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ شَيْئًا وَأَنَا أَعْلَمُ وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لاَ أَعْلَمُ، إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الغُيُوب**: خوایە من پەنا بە تۆ دەگرم، کە هاوبەشیت بۆ پەیدابکەم، من دەزانم و داوای لێبووردنت لێدەکەم لەوەی کە نازانم، هەر تەنیا تۆ زانای لە غەیب و نهێنیەکان.))[4]

ئینجا ڕەحمەتی خوای لێبێ گوتی: ((ئەگەر بینیت گۆڕانێ لە ڕۆزیت پەیدا بووە و بەرەو تەنگی چووە؛ چاك بزانە تۆ فەرمانێکی خوات پشتگوێ خستووە و بە شوێن ئارەزووی خۆت کەوتووی. ئەگەر بینیت دەست و زمان لەسەرت کەوتوونەتە کارو زۆری زۆرداران خۆت و کەس و کار و سامان و کوڕتی گرتۆتەوە، چاك بزانە تۆ سنووری خوات بەزاندووە و گوناهت کردووەو مافەکانت زەفتکردووە. ئەگەر بینیت پەژارەو کێشە دڵتیان داگرتووە چاك بزانە کە تۆ گازاندەت لەوە هەیە کە خوا بۆتی داناوە و متمانەیپێ ناکەی و ئەوەی خوا بۆ تۆ و خەڵکی داناوە پێی قایل نیت، ئالێرەدا پێویستە پەشێمان بیتەوە و لەو حاڵە بگەڕێیتەوە ...

تۆبەی تۆبەکار لە چوار شت دایە:

<u>یەکەم</u>: زمانی خۆی لە خۆ هەڵقورتاندن و غەیبەت و قسە هێنان و بردن و درۆبگرێ.

---

[2] ص / ٢٥.

[3] الغنية، ص ١٦ و دوای ئەوە.

[4] الغنية، ص ١٢٢ و دوای ئەوە.

دووەم: ئیرەیی و دوژمنایەتیی لە دڵ نەبێ بۆ هیچ کەسێ.
سێیەم: لە هاوڕێیی بەد دوور کەویتەوە.
چوارەم: دەبێ بۆ مردن ئامادەبێ و لە گوناهەکانی پێشوی پەشیمان بێتەوە و لە کۆششدابێ بۆ گوێڕایەڵیکردنی خوای..

أبو علی دەقاق گوتوویەتی: ((تۆبە سێ بەشە: سەرەتا پەشیمانی(التوبـة)یە، ناوەڕاستەکەی گەڕانەوە(الانابة)یە، کۆتاییەکەی بەرەو خوا چون(الاوبـة)یە. تۆبە سەرەتایە، ئینابە هۆیە، ئەوبە کۆتاییە. هەرکەسێ لەترسی سزادان تۆبە بکا خاوەنی (توبة)یە، ئەوەی لە تەماحی پاداشت یان لەترسی سزا تۆبە بکا خاوەنی (انابـة)یە، ئەوەی لە بۆ گوێڕایەڵیی فەرمانی خوا تۆبە بکا، نەك لە خۆشیی پاداشت، یان لەترسی سزا، ئەوە خاوەنی (أوبـة) یە. هەروەها گوتراوە، کە تۆبە سیفەتی پێغەمبەرەکانە: ﴿نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ: چاکترین بەندە بوو و یەکێك بوو، بەراستی ئەو تۆبەکار بوو.﴾)).[1]

## دڵسۆزیی «الاخلاص»:

خەڵکی لەناو چوون تەنیا زاناکانیان نەبێ، زاناکان لە ناوچوون کاراکان(العاملون) نەبێ، کاراکان لەناو چوون دڵسۆزەکان نەبێ، دڵسۆزەکان لەمەترسییەکی گەورەدان. خوای گەورە تەنیا گوتە و کردەوەیی وەردەگرێ، کە تەنها بۆ ئەو بێ، خوای مەزن دەفەرمووێ:

﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ: بێجگە لەو فەرمانە بەوان نەدرابوو، کە بە دڵسۆزییەوە خوا بپەرستن و پاکبن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەمەیە ئاینی راست و پاك و

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٠ و دوای ئەوە بە دەستکارییەوە.

دروست.﴾.[1]

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((**إِنَّ اللّٰهَ تَعَالَى لاَ يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَامِكُمْ وَلاَ إِلَى صُوَرِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ**: پەروەردگاری مەزن سەیری لەش و وێنەتان ناکا بەڵکو سەیری دڵتان دەکات.))[2]

جورجانی لە کتێبەکەی (التعريفات)دا دەڵێ: ((دڵسۆزیی(الإخلاص) لە زماندا ریانەکردنە لە پەرستنەکان))[3].

شێخ لەگوتە و کردەوەکانی دڵسۆز بوو، لەهیچ کەسێ نەدەترسا هەرچیەك بوایە، گوتەو کردەوەکانی ریایان تێ نەدەکەوت و دەیگوت: ((ئەی رۆڵە، پێویستە لە کردەوەکانت دڵسۆز بیت، چاو لە کردەوەکەت هەڵگرە و داوای پاداشت مەکە. تەنیا بۆ خوا کاربکە، نەك بۆ نیعمەتەکانی، لەوانە بە کە هەر ئەویان دەوێ، ئەوت گەرەك بێ تابتداتێ، ئەگەر ئەوەی دایتێ ئەوا لە دنیا و رۆژی بەپابوونەوە سەیری دەکەی))[4].

هەروەها گوتی: ((سەعیدی کوڕی جوبێرﷺ گوتی: دڵسۆزی ئەویە بەندە ئایین و کردەوەکەی تەنیا بۆ خوا بێ و لە ئایینەکەی هاوبەشی بۆ پەیدا نەکا و ریا تێکەڵێ کردەوەکانی نەکات و بۆ کەس نەبێت.. لە ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕنەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەیە، کە دڵی موسڵمان ناپاکیی لەگەڵ ناکات: کردەوەیەك، کە تەنیا بۆ خوا بێ، ئامۆژگاریکردنی دەسەڵاتداران، بەگەڵ کەوتنی کۆمەڵی موسڵمانان))[5]

شێخ-رەحمەتی خوای لێ بێ- دەیگوت: ((خواپەرستیی نەزان هیچ ناهێنێ،

---

١ البينة / ٥.

٢ موسليم گێراوێتیەوە ( جامع الاصول رقم ٤٧٣١).

٣ التعريفات، ص ٢٨.

٣ الفتح الرباني: المجلس: ١٧.

٥ الغنية، ج ٢، ص ٦٧ .

٥ الفتح الرباني، ص ٤١، ١١١، ٢٢٥ .

زانست هەر بەکردەوە سوود دەگەیەنێ، کردەوە هەر بە دڵسۆزی سوود مەند دەبێت))[1].

## ترس و ئومێد :

پێویستە بەندە هەمیشە لە نێوان ترس و ئومێددا بێت، ترسان لە خواو سزای خوا -، ئومێدی چاکە و لێبووردنی خوا، ئا ئەمەیە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعە، هەر ئەمەشە بیروباوەڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی.

شێخ دەفەرمووێ: ((ترس و ئومێد وەکو دوو باڵی باڵدارن بەو دوانە نەبێ ئیمان تەواو نابێ))[2].

شێخ لە بارەی ترسەوە لێیان پرسی و گوتی: ((ترس زۆر جۆری هەیە: ترسان بۆ گوناهبارانە، تۆقین بۆ خوا پەرستانە، سامکردن بۆ زانایانە، زراو چوون بۆ خۆشەویستانە، سڵکردنەوە بۆ خواناسانە، ترسی گوناهباران لە سزادانە، تۆقینی خواپەرستان لە کەمبوونی پاداشتی خوا پەرستییەکانە، سامکردنی زانایان لە هاوبەشیی نهێنیی خوا پەرستیەکانە، ترسی خۆشەویستان لە کیس چوونی پێك گەیشتنە، زراو چوونی خواناسان شکۆمەندی و بەگەورە زانینە، ئەوە گەورەترین ترسە چونکە لاناچێ، بەڵام ئەوانیتر بە بەزەیی و نەرم و نیانی دادەسەکنێ. شێخ لە بارەی تکاوە پرسیاریان لێکرد و گوتی: تکا و ئومێد لە حەقی پیاوچاکان دەبێ بەرامبەر خوا گومان چاك بێ، لەوە دەستهێنانی قازانج و لابردنی زیان نەبێ.. ئومێد بێ ترس نابێ، چونکە ئەوەی بە ئومێد بێ بگاتە شتێ لەوە دەترسێ، کە لە کیسی بچێت))[3].

شێخ دەڵێت: ((کاری بەدکاران دەکەی و پلە و پایەی پیاو چاکانت دەوێ، ئەوەی ئومێدەکەی بە سەر ترسەکەیدا زاڵ بێت دەبێتە زندیق، ئەوەی ترسەکەی

---

٢ فتوح الغیب، المقالة: ٤٤..

٣ قلائد الجواهر، ص ٧٣ .

بەسـەر ئومێدە کـەی زاڵ بێـت بـێ‌هومێد دەبێـت. بـێ زیـانیش لـەمام نـاوەنجیی هەردوو کیانە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((لَو وُزِنَ خَوفُ الْمُؤمِنِ وَرجَاؤُهُ لاَعتَدَلا: گەر ترسی بڕوادار و ئومێدی بکێشرێن هاوتا دەبن.))[1]

## رای شێخ لەبارەی گروپە گومرایەکان :

شێخ فەرموویـەتی: کثـیر بـن عبداللە لـە بـاوکی لـە باپیری دەگێڕێتـەوە، کـە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((...إنَّ بَنِي إسْرَائِيلَ افْتَرَقَتْ عَلَـى مُوسَـى بـِإحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً كُلّها ضَالَّةٌ إلاّ فِرقَةٌ وَاحِدَةٌ، الإسلامُ وَجَمَاعَتُهَم، ثُمَّ إنَّهَا أَفـتَرَقَتْ عَلَى عِيسَى بَنُ مَرِيَم بِإثنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، كُلّها ضَالَّةٌ إلاّ وَاحِـدَةٌ، الإسـلاَمُ وَجَمَاعَتُهَم، ثُمَّ أَنَّكُمْ تَكوُنُونَ عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً كُلّهم ضَالَّةٌ إلاّ وَاحِـدَةٌ، الإسلاَمُ وَجَمَاعَتُهَم: جوولەکە لەسەر حەزرەتی موسا بوونە حەفتاویەك گروپ، هەموویان گومڕان تەنیا گروپێکیـان نەبێ، ئیسلام و گروپەکەی، هەروەها لەسەر حەزەرتی عیسا بوونە حەفتاو دوو گروپ، هەموویان گومڕان تەنیا گروپێکیـان نەبێ، ئیسلام و گروپەکەی، هەروەها ئێوەش دەبنە حەفتاو سـێ گروپ، هەموویان گومڕان تەنیا گروپێ نەبێ، ئەویش ئیسلام و گروپەکەیەتی)) ...

بنچینەی ئەم حەفتاو سێ گروپە، دەیە کە ئەمانـەن: ئەهلی سوننەت، خەوارج، شـیعەکان، موعتەزیلـەکان، مورجیئـەکان، موشـەبهەکان، جوهەیمیـەکان، ضراریەکان، نەجاریەکان، کیلابیەکان.

ئەهلی سوننەت یەك گروپە، خەوارج پازدە گروپە، موعتەزیلـەکان شەشـە، مورجیئەکان دوازدەیە، شیعەکان سی و دووە، جوهـەیمی و نـەجاری و کیلابیـەکان هەریەکە گروپێکن، موشەبهەکان سێیە، هەموویان دەکاتە حەفتاو سـێ گروپ ...

---

[1] الفتح الرباني: المجلس: ٢٥.

ئەو گروپەی، کە رزگاری دەبێت لە ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

موعتەزیلە یان قەدەرییەکان بەئەهلی سوننەت و کۆمەڵ دەڵێن: (مجبرة)، چونکە ئەهلی سوننەت بڕوایان وایە، کە هەموو خولقێنراوەکان بەویست و توانای خوان. مورجیئەکان پێیان دەڵێن: گوماندارەکان چونکە گومان لە بڕوایان هەیە و بڕوادار دەڵێ: گەر خوا حەزبکا من بڕوادارم. رافزەییەکان پێیان دەڵێن (ناصبیة)، چونکە بە پەیمان ئیمام هەڵ دەبژێرن. جوهمی و نەجارییەکان پێیان دەڵێن (مشبهة)، چونکە سیفەتەکانی خوا دەچەسپێنن. باطنیەکان پێیان دەڵێن (حشویة)، چونکە بڕوا بە خەبەر دێنن و پابەندن بە شوێنەوار.[1]

## گێڕانەوەی فەرمودەی پێغەمبەر لەلایەن شێخەوە:

شێخ عبدالقادر فەرموودەی پێغەمبەری لە کۆمەڵە کەسێك بیستووە لەوانە: ئەبوغالیب محەممەد کوڕی حەسەنی باقلانی، ئەبو سەعید (سەعد) محەممەد کوڕی عبدالکریم کوڕی خەشیشا، ابوالغنائم محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی مەیمونی فورسی، ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی موزەفەر، ئەبو جەعفەر کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسێن ئولقاری ئەلسەڕاج، ابوالقاسم عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی بەنانی کەرخی، ئەبوتالیب عبدالقادر محەممەد کوڕی یوسف و ئامۆزایەکەی عبدالرحمن کوڕی ئەحمەد، ابو البرکات هیبەتاللەی کوڕی موبارەك، ابوالعز محەممەدی کوڕی موختار، أبو نەسر محەممەد، ئەبو غالیب ئەحمەد، أبو عبداللە یەحیای کوڕی عەلی بەننا، ئەبو حەسەن کوڕی موبارەك کوڕی تیور، ئەبو مەنسور عبدالرحمن قەزاز، أبو البرکات تەلحە العاقولی و خەڵکیی تر.[2]

بۆیە شێخ (رەحمەتی خوای لێبێ) ئاگاداری فەرموودەو گێڕانەوەی فەرموودە

---

١ الغنية، ج ١، ص ٨٣ و دوای ئەوە.
٢ قلائد الجواهر، ص ٤.

بوو. ئیبن رەجەب لە سەنەدەکەی فەرموودەیێ لەشێخ دەگێڕێتەوە، کە کەعبی کوڕی مالیكﷺ گوتوویەتی: ((**قَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ فِي سَفَرٍ إِلاَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ**: پێغەمبەرﷺ گەر ئارەزووی لە سەفەر بوایە بەزۆری رۆژی پێنج شەممە دەردەچوو.))[1]

هەردوو کوڕەکەی شێخ، عبدالرزاق و موسا و شێخ عەلی کوڕی ئیدریس فەرموودەیان لێی گێڕاوەتەوە، هەروەها رەشید ئەحمەد کوڕی موسلیمە و هیتر فەرموودەیان لێی گێڕاوەتەوە.[2]

شێخ (رەحمەتی خوای لێبێ) لەوانە گوتنەوە و ئامۆژگاریکردن و کتێبەکانیدا گەلێ نموونەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ دەهێنایەوە، لە بەرگی یەکەمی کتێبی (الغنیة) ٣٨٦ فەرموودەی پێغەمبەری تێدایە و لە بەرگی دووەمی ٤٩٣ فەرموودە، بەڵام هەندێ لە زانایانی وەکو ئیبن تەیمیە و ئیبن کەثیر دەڵێن کەوا شێخ نموونەی فەرموودە لاوازەکان دێنێتەوە بە تایبەتی لە گەورەیی رۆژو مانگ و هەندێ جۆری نوێژ و ویردو نزاو سیفەتەکانی بەهەشت و دۆزەخ.

*　*　*

بەگشتی بیروباوەڕی شێخ بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بوو. فیقە لای ئەو بە پێش صۆفیگەری کەوتووە، گەلێ جار دەیگوت: فێری زانست بە ئینجا دوورەپەرێز بە؛ هەر حەقیقەتێ شەریعەت گەواهیی بۆ نەدا زندیقیە. ((ئیمان لای ئەو، گوتنە بە زمان و زانینە بە دڵ و کارکردن بە روکنەکان، ئیمان بە گوێڕایەڵی زیاد دەبێ و بەگوناە کەم دەبێ، بە زانست بە هێز دەبێ و بە نەزانین کزدەبێ.. هەموو ئیمانێك ئیسلامە و هەموو ئیسلامێ ئیمان نیە.. چونکە جاری واهەیە مرۆڤ لەترسی شمشێر موسڵمان دەبێ. زیاد بوونی ئیمان بە جێبەجێکردنی فەرمان بەچاکە

---

١ كتاب التاج / المكلل لأبي الطيب القنوجي تحت رقم / ١٥٩.

٢ سير أعلام النبلاء / ٢٠:٤٣٩ .

و نەهی لە خراپە و خۆدانە دەست قەدەرو گازاندە نەکردن لە خواو گومان نەکردن لە بەڵێنی دەبێت، خۆ تەنیا هەر بە نوێژ و ڕۆژوو نابێ))[1]. ((بەندە لە ئیسلامەوە بەرەو ئیمان بەرز دەبێتەوە و لە ئیمان بەرەو دڵنیایی و لە دڵنیاییەوە بەرەو ناسین و لەناسینەوە بەرەو زانین و لەزانینەوە بەرەو خۆشەویستی و لە خۆشەویستییەوە بەرەو دولبەری.. لەو کاتەدا هەمیشە بێگەردو بە ئاگایە، بە ئاگاییەکەی لە پێغەمبەرەوە بۆ ماوەتەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ چاوەکانی دەنووستن و دڵی بەئاگابوو، پشتەوەی خۆی دەبینی وەك چۆن پێشەوەی دەبینی، بەڵام هیچ کەسێ ناگاتە بە ئاگایی پێغەمبەر و ناتوانێ هاوبەشی ئەدگارەکانی بێت. هەر هێندەیە (ئەبدال)[2] و وەلییەکانی ئۆمەتەکەی دێنە سەر پاشماوەی خواردن و خواردنەوەکەی، دڵۆپێ لە دەریای مەقامەکانی و گەردیلەیێ لەچیای کەرامەتەکانی وەردەگرن))[3].

شێخ عبدالقادر ڕێزی مەزهەبەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتی دەگرت و داوای دەکرد، کە ڕێز لە بۆچوونەکانیان بگرن و لە ناخۆشی و دووبەرەکی دووربکەونەوە، چونکە هەموویان لە کانگایەکەوە سەرچاوە وەردەگرن و هەموویان لقی یەك قەدەدارن، شێخ گومانی لێچوون(التشبیه) و بەرجەستەیی (التجسیم) لە سەر مەزهەبی حەنبەلی لابرد چونکە پێیانەوە لکاندبوو و خەڵکی لەم ڕێبازە دوور کەوتبوونەوە، بۆیە شێخ بە نوێکەرەوەی ئەو مەزهەبە دادەنری لە بەغدا کە چیی وای نەمابوو لەناو بچێت. هەروەها لەسەر مەزهەبی شافیعی و حەنبەلی فتوای دەدا، بۆیە نەوەویی شافیعی لە بارەیەوە گوتوویەتی: شێخ عبدالقادر شێخی شافیعی و حەنبەلییەکان بوو لە بەغدا، ئیمامی زەهەبیی شافیعی لە بارەیەوە گوتوویەتی: شێخ پێشڕەوی خواناسانە، خاوەنی مەقام و کەرامەتانە.[4] هەروەها

---

١ الغنية، ج ١، ص ٦٢ و دوای ئەوە.

٢ الأبدال: وەك دەڵێن قەومێکی چاکن، دنیا لێیان خاڵی نیە، گەر یەکێکیان مرد خوای گەورە یەکێکی تر لەجێی دادەنێت.. (ن.تەفسیر)

٣ الفتح الرباني: المجلس: ٤٥.

٤ كتاب العبر للذهبي، ج ٤، ص ١٧٥.

سبتی کوڕی جەوزی حەنەفی بە چاکە ناوی شێخی هێناوە.[1] حافز کوڕی ڕەجەبی حەنبەلی لە بارەیەوە گوتوویەتی: ((عبدالقادر شێخی سەردەمەو پێشڕەوی خواناسانە و دەسەڵاتداری شێخەکانە))[2]. هەر لەبەر ئەمەبوو دووبەرەکیی نێوان مەزهەبەکان لە بەغدا لەسەر دەمی ئەودا بەرەوکزی چوو.

شێخ عبدالقادر بیروباوەڕی خۆی دیاریکردووە، کە بیروباوەڕی ئەهلیی سوننەت و جەماعەتە، ئەمە لە کۆتاییی کتێبی (فتوح الغیب) هاتووە کە خاوەنی کتێبی (الفیوضات الربانیة) لە لاپەڕە (٢٩)دا بۆمان دەگێڕێتەوە، لێرەدا لەبەر خۆشیی هەمووی دەنووسمەوە:

((بەناوی خوای دلۆڤان، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە چونێتیی داهێناوە و خۆشی دووره لە چۆنێتی، لەهەموو شتێکدا هەیەو بێ چوارچێوەیە، سەرەتای هەموو شتێکە و بێ کۆتاییە. گەر بڵێی: چۆنە؟ داوای چۆنیەتیت لێکردووە. گەر گوتت کەی ؟ بەکات خەریکت کردووە. گەر گوتت: نا، لە بوون دوورت خستۆتەوە. گەر گوتت: ئەگەر، بەپێچەوانە پێشوازیت کردووە. گەر گوتت: بۆچی، لە مەلەکوتیدا دژایەتیت کردووە. خوای مەزن لەوە بەرزترە کەکات پێش و دوای بکەوێ، بە لەشی ناناسرێ. خوا بەرزو باڵایە، گەر مرۆڤ بوایە پێکهاتەی ناسراوبوو، ئەگەر لەش بوایە چەندێتیی ناسراو بوو، بەڵکو خوا تاکە بە پێچەوانەی بۆچوونی دیانەکان، بێ نیازە بە پێچەوانەی بتپەرستەکان، وێنەی نییە وەکو تانەیێ لەسەر (حشویة)کان، هاوشانی نییە بە پێچەوانەی ئەوانەی بەمجۆرە وەسفی دەکەن، هیچ جووڵاوێ لە خێر و شەڕ لە نهێنی و ئاشکرا، لەسەر زەوی و ناو دەریا بێ ویستی ئەو ناجوولێتەوە، ئەمەش بەرپەرچدانەوەی قەدەرییەکانە، هیچ توانایێ ناگاتە توانای ئەو و حیکمەتی بێ کۆتاییە، ئەمەش بەدرۆ خستنەوەی هوزەلییەکانە، مافەکانی پێویستن و بەڵگەی دیارەو کەس هەقی لەسەری نییە، ئەگەر داوای لێ

---

[1] کتاب مرآة الزمان، ج ٨، ص ٦٤.

[2] کتاب الذیل علی الطبقات، ج١، ص٢٩٠.

بکا بەپێچەوانەی دەستووری نیزامیەکان، دادپەروەرەو لە حوکمەکانی ستەم ناکا، راستگۆیە و بەڵێنەکانی دێنێتە جێ، ئاخێوەرە بەگوتەیەکی کۆنی هەمیشەیی، گوتەکانی داهێنراوی بۆ نییە، قورئانی ناردۆتە خوارەوە و لە دارشتنیدا زمان پاراوانی بێتوانا کردووە، ئەمەش کزی و بێتوانایی بەڵگەی مورادییەکان دەگەیەنێ، خوامان عەیبەکان دادەپۆشێ، ئەوەی تۆبە بکا لێی دەبوورێ، گەر یەکێ گەڕایەوە سەر گوناهەکانی ئەوا رابوردوی بۆ دووبارە نابێتەوە هەر لەبەر ئەوەی مرۆڤە، خوا لە فرت و فێڵ دوورە و زۆر پیرۆزە و ستەمی بۆ ناشێ، بڕوامان هەیە کە دڵی بڕواداڕانی لەیەك نزیك کردۆتەوە و بێبڕواکانی گومڕا کردووە بە پێچەوانەی ڕای هیشامیەکان، بڕوا دەکەین کە بەدکارەکانی ئەم میللەتە لە جوولەکەو دیان و ئاگرپەرستەکان باشترن بە پێچەوانەی بۆچوونی جەعفەریەکان، دان بەوەدا دەنێین کە خۆی و غەیری خۆی دەبینێ، گوێی لە هەموو بانگێکە، هەموو نهێنیەك دەبینێ بە پێچەوانەی کەعبیەکان، لەچاکترین شێوە خولقێنراوەکانی خولقاندووە، لە تاریکیی گۆڕدا لە ناوی بردوون، دەیان گەڕێنێتەوە هەر وەك لە سەرتادا دایهێناون بە پێچەوانەی دەهریەکان، ئەگەر بۆ رۆژی حسێبکردن کۆیان بکاتەوە خۆی نیشانی خۆشەویستەکانی دەدا و بە چاو دەبینن، وەکو مانگ بەدی دەکرێ و داناپۆشرێ، تەنیا ئەو کەسەی دان بە بینیندا نانێ لە موعتەزیلەکان، چۆن لە خۆشەویستەکانی بزر دەبێ، یان لە پشت پەردە رایان دەگرێ، خۆ بەڵێنە کۆنە هەمیشەییەکەی داوە ﴿يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً﴾، ئایا لەبەهەشتەکاندا بە حۆرییەك قایل دەبی، یا لە گوڵزاردا بە خشڵێکی سوندوسی قەناعەت دێنی، مەجنوون بێ لەیلای عامری چۆن دڵشاد دەبێ، خۆشەویستەکان بێ بۆن و بەرامەی عەنبەر ئامێز چۆن دەحەسێنەوە. لەش گەلێ توێنراونەتەوە بۆ بەدەستهێنانی بەندایەتی، چۆن لە دانیشتنی نزیك خوا هەست بە خۆشی ناکەن، ئەو چاوانەی لە شەوی تاریکدا شەونخونییان کێشاوە چۆن بە بینینی خوا چێژ وەرناگرن، ئەو دڵانەی بەشیردانی خۆشەویستی ئاوار دراون چۆن لە گوڵزاری پیرۆزدا هات و چۆ ناکەن و لە پاوانە باڵاکاندا تێر ناخۆن و لە ڕووبارە ڕوونەکاندا ئاو ناخۆنەوە و هەموو حەز و ئارەزوێکیان ناشکێنن و لەو سکاڵانامەدا راڤەی

وەجدو حاڵی خۆیان ناکەن و چۆن دادوەری عشقان بەدیار ناکەوێ و کۆتایی بەو کێشەیە ناهێنێ، گەر بەنەفس گوترا کاتی چوونە لای خوایە سەرتا سەلامی لێ دەکا و فەرمانی چوونە بەهەشتی پێ دەکا و پێی قایل نابێ و سوێند دەخوا، کە جگە لەو سەیری هیچ ناکاو جگە لەو نیازی لای هیچی تری نییە و لەو گەردوونەدا هیچی ناوێ و داواکانی هێندە کەم نەبوون. لە چێژی ژیان نەتەکییەوە تەنیا بۆ پەیوەندی بەستن بەو نەبێ و مەیگێڕ پێکێکی بێگەردی وای پێ نۆش دەکا، کەپاك و بێگەردی بکاتەوە، گەر بە ئاشکرا بدرێتە هاودەمەکان دەبێ بەیانی و ئێوارە باڵی بەسەر یاندا بشەکێتەوە و هەوەس و ئارەزوویان بۆ رووناکیی دەم و چاوی پێ دەبەخشێ.

خوایە سوێند بەتۆ هەر چاوێ جوانیی تۆی پێ نیشان نەدرێ چاوێکی بەد بەختە، بەجوانیی خۆت هەموو دڵدارانت کوشتووە، سوێند بە عەشقت بەزەییت بەم گەدایانەدا بێتەوە. ئەو دڵانە لە شەوقی تۆ سیس بوونە و پاشماوەی عەشقت تێدانەماوە، گەر حوکم دەدەم خۆ بەمەبەستم نەگەیشتووم و راسپاردەیەکم لە عەشقتدا هەیە، ئەی خوای من لەمە نائومێد نیم، کە لەکاتی بەیەك گەیشتن سۆزت گوناهەکانم بسڕێتەوە. برایەکان، رەددانەوە دەبێ چۆن بێ لەبەیاندا چەند کاتێکی خوایی هەیە و چەند ئاماژەیەکی ئاسمانی هەیەو بۆن و بەرامێکی فریشتەیی هەیە، بەڵگەشم لەسەر ئەمە خوێندنی باڵدارانیسەردارانە بە ئاوازی داودی و؛ چەپڵە لێدانی جۆگا شکاوەکانە لە گوڵزارەکان وسەمای لقەکانە بە خشڵی سوندوسی، ئەمانە هەمووی دان نانە بە تاك و تەنیایی خوا.

هۆ هۆ خۆشەویستانی خوا لە بەیانیان خوا خۆی بەدیار دەخا و بانگ دەکات: کەس هەیە تۆبە بکا و منیش بەچاکی لێی قەبوڵ بکەم ؟ کەس داوای لێبوردنم لێ دەکا هەموو گوناهەکانی ببورم ؟ کەس داوای دیاریم لێ دەکا تا نیعمەت و دیاریی بۆ بیارێنم ؟

بەڵێ ئەگەر گیانەکان رووناك بوون، ئەوا ئەو دەوروبەرە رووناك دەکاتەوە و لە حاڵەکاندا یەکسان دەبن و هەموو بەڵایەکیان لەسەر ئاسان دەبێ. بێگومان بۆنی فرمێسکەکانیان عەتر ئامێزە. بە ئارامبوونیان لە سەر هەندێ دوور کەوتنەوە شایانی

گەیشتن بوو لــە پایـە بـەرزەکان. راسـتیی قسـەکانیان لــە چینـی خۆشەویسـتان دەگێڕدرێتـەوە و بـێ داواکـردن پێویسـتییەکانیان جێبـەجێ دەکرێـن و دیـاریی خۆشەویستی روون و ئاشکرایە. ئای چ سەر وایـەکی جوانـە و بیروباوەڕێکی پاکـە لە سەر مەزهـەبی حەنـەفی و شـافیعی و مـالیکی و حەنبـەلی. خـوا مـن و ئێـوە لەوانـە بپـارێزێ، کـە دووبـەرەکییان نایـەوە و لـە ریـز دەرچـوون هـەروەك تـیر لـە کـەوان دەردەچێت. خوا من و ئێوە لـەو کەسـانە دابنـێ، کـە لـە بەهەشتی چـەند نـهۆمدان. سەلام و دروودی خوا لـە سەر محەمەد چاکترینی خەڵك، هـەروەها لەسـەر خانـەوادە و یارانی بێ، دروودو سەلامێکی بەردەوام و تـازە لـە هـەموو بەیانی و ئێوارەیـەکدا. ئامین ئینجا ئامین))[1].

---

١ كتاب الفيوضات الربانية، الحاج اسماعيل بن محمد القادري، ص ٢٩.

# بەشی سێیەم

# ڕێبازەکەی

ڕێباز ئەو هەڵس و کەوتەیە، کە دەگاتە ڕەزامەندیی خوای مەزن. جورجانی لە کتێبی (التعریفات) دا گوتوویەتی: ڕێباز ژیاننامەی تایبەتی ڕێبوارانی بەرەو خوایە لە بڕینی قۆناغ و بەرز بوونەوە لە مەقامەکاندا.[1]

هەروەك چۆن مەزهەبە فیقهیەکان بەپێی بۆچوونی زانا موجتەهیدەکان زۆر بوون و جیاوازن، بەم جۆرەش ڕێبازەکانی صۆفیگەری بە پێی بۆ چوونی کەڵەپیاوە دڵسۆزەکانی جیاوازن، بنچینەی هەردوولایان یەکە، کە قورئان و فەرموودەیە، بەڵام بۆچوونەکان جودان و هەر یەکە لەوانە بەشی خۆی هەیە و مەبەست یەکێکە لای هەموان، کە ڕەزامەندیی خوایە، هۆکارەکان جیان و هەموویان دروستن.

ئەگەر فیقهـ لەشی شەریعەت بێ، ڕێباز گیانێتی، فیقهـ لە نوێژکەر قایل دەبێ، کە بنەماکانی نوێژ لەوەستان و داهاتنەوە و کڕنۆش بردن و دانیشتن و خوێندنەوە جێبەجێ بکات، بەڵام ڕێباز بە جۆرێ لێی قایل دەبێ، کە نوێژکەر زۆر بە ئەدەبەوە لە نوێژەکەی بوەستێ و خۆی وا دابنێ، کە لەبەردەم پەروەردگار وەستاوە و دەبێ نوێژەکەی لە کاری بەد بپارێزێ. فیقهـ لە ڕۆژووگر ڕازی دەبێ، کە خۆی بگرێ لە وانەی ڕۆژوو دەشکێنن هەر لە بەیانی تا ئێوارە، بەڵام ڕێباز هەر بەوەندە قایل

---

١ کتاب التعریفات، ص ١٨٣.

نابێ، بەڵکو سەرەڕای ئەمەش دەبێ خۆی لە درۆو غەیبەت و دووزمانی و شایەتیی بە ناحەق بپارێزێ، هەروەها هەست بە ئازاری هەژارو پێویستەکان بکات. فیقە لە زەکاتدەر رازی دەبێ، کە بەشە زەکاتەکەی لە کاتی خۆی دەربکا، بەڵام رێباز بە پاککردنەوەی دەروون و دوور کەوتنەوە لە قرچۆکی رازی دەبێت. فیقە لە حاجی رازی دەبێ، کە کارەکانی حەج جێبەجێ بکا، بەڵام رێباز تەنیا بە دڵسۆزی و هەستکردن بە بەندایەتیی تەواو بۆ خوا و خۆزەلیلکردن و بێ فیزیی و خۆ بە دەستەوەدان بۆ خواو یارمەتیدانی بێ توانایان و دابڕاوان و گرنگیدان بەکارو باری هەموو موسڵمانان قایل دەبێت.

پێغەمبەرﷺ و خەلیفەکانی راشیدین هەموو ئەو ئەرکانەیان بەجێ دەهێناو رێنمایی خەڵکیان دەکرد، کە بیکەن، هەر کە قورئان و دەوڵەت لە یەکتربوویەوە، فیقە لەسەر دەستی چەند کەڵەزانایەکی دڵسۆز پەیدا بوو، فەرمانەکانیان هەڵ هێنجا و پۆلێنیان کردو بۆ خەڵکییان روون کردەوە، لەهەمان کاتیشدا رابەرو رێبوار بوون، هەر کە هەندێ لە زانایان بەرەو فیقە چوون بەتایبەتی سەودا(معاملات) و پەرستنەکان و خۆیان لەو چوارچێوەیە ئاخنی و وازیان لەوانیتر هێنا، ئینجا رابەرو رێبوارانی رێی خوا دەرکەوتن و رێبازی بەرزی ئاکاری پێغەمبەر و یارانیان فێری موسڵمانان دەکرد بۆ ئەوەی بۆی بگەڕێنەوە دوای ئەوەی، کە تەرازووی سلوك و ئاکار زۆر لەنگ بوو بوو، مەترسیی ئەوە هەبوو ئەم ئاکارە لەناو بچێ و بکەوێتە ناو شەپۆلی لە بیرچوونەوە. بەمجۆرە زانستی سلوك پەیدا بوو، کە ناوی لێنرا صۆفیگەری. خۆ دەبێ رێکخەر(ضابط)ێك هەبێ ئەم هەموو زانستانە رێکبخات، ئەویش قورئان و فەرموودەیە، هەر ئەوەشە، کە زانستی سلوك و صۆفیگەری رادەگرێ و هەروەها فیقهیش رێك دەخات، چونکە هەر خۆی سەرچاوەی ئەم زانستانەیە و کانگاکەیەتی.

هەروەها جۆرە سنووربەزاندن و لادانێ لە فیقهو بیروباوەڕ دەرکەوت، گرووپی موعتەزیلە و مورجیئە و جەبریە و خەواریج و هیتر پەیدابوون، بەهەمان شێوە سنووربەزاندن و لادان لە صۆفیگەریش پەیدا بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی رۆشنبیریی هیندی و یۆنانی و بیزەنتی و فارسی خۆیان خزاندە ناو رۆشنبیریی

ئیسلامیەوە، چەند ڕێبازێکی صۆفیگەریی گومڕاو لە ئاین بەدەر پەیدا بوون وەکو: حلول و حالیە (حالیە دەڵێن: شێخ حاڵەتی تایبەتیی هەیە و بەشەرع لێك نادرێتەوە) و ئەولیائیە (کە دەڵێ پلە و پایەی وەلی شەرع ناهێڵێ) و شەمرانیە (ئەوانەی رابواردن و تێکەڵبوون حەڵاڵ دەکەن) و حوبییە (ئەوانەی دەڵێن: هەر کە بەندە گەیشتە خۆشەویستی؛ ئیتر پەرستنی لەسەر نامێنێ) و موتەکاسلە (ئەوانەی واز لە دنیا دێنن و لە بەر دەرگایان سواڵ دەکەن) و... هیتر.[1]

شێخ عبدالقادر (رەحمەتی خوای لێبێ) لە ٤٨٨ ك. هاتە بەغدا بە مەبەستی ئەوەی ببێتە شەرعناس و فیقە فێر بێت، دوای ئەوەی فیقهی خوێند و پایەیەکی بەرزی لێ پەیداکرد، ئینجا سەیری کرد لادانێکی زۆریی ئاکاری لە کۆمەڵگای بەغدا دا هەیە و لە چوارچێوەی ئیسلام دەرچووەو گەیشتۆتە پلەیەکی زۆر نزم. بینی تەنیا فیقە چارەسەریی ئەمەی پێ ناکرێ، بۆیە ڕووی لە صۆفیگەری کردو دەچووە لای یەکێ لە کەڵەپیاوانی صۆفیگەری، کە حومادی کوڕی موسلیمی دەباس بوو، قوتابیەکانی (دەباس) دەیانزانی کە عبدالقادر پیاوێکی شەرعناسە، بۆیە سەریان لە ئامادەبوونی لەگەڵیان سوڕدەما و پێیان دەگوت: تۆ پیاوێکی شەرعناسی، بۆ دێیە لامان !؟ نەیان دەزانی، کە لە کەماڵ دەگەڕێ، کەماڵ بریتیە لە کۆکردنەوەی نێوان فیقهو صۆفیگەریی.

شێخ عبدالقادر فیقهو صۆفیگەریی لەگەل یەکتری کۆکردبوویەوە و فیقهی لەسەر صۆفیگەری بە پێش دەخست، چونکە فەرمانڕەوایە بە سەری، خۆشی پێش ئەوەی صۆفی بێ شەرعناس بوو.

لەساڵی ٥٢١ کۆچیەوە دەستی بەوانە گوتنەوە و ڕێنمایی کرد، هەر کە خەڵك هەستیانکرد تێگەیشتوو و زیرەك و دڵسۆزە، لێی گرد بوونەوە، لەوپەڕی وڵات ناوبانگی دەرکرد، هەر کە زانایان و خاوەن مەزهەبەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتی بینی لە نێوان خۆیاندا جیاڕان و کۆك نین، هەوڵێکی زۆری دا پێکیان بێنێ و هۆیەکانی جیاوازیی کێشە ناسەرەکیەکان لەناو ببات، چونکە بنچینەی

---

١ کتاب ( هکذا ظهر جیل صلاح الدین) للدکتور ماجد عرسان الگیلاني، ص ١٨٥ وما بعدها.

بیروباوەڕیان یەکە.

هەر کە بینی هەندێ لە گروپە صۆفیگەریەکان گومڕاو لە ئاین دەرچوونە، دژایەتییانی کردو بیروباوەڕە کانیانی پووچەڵ کردەوە و ڕێبازی صۆفیگەریی خستە ژێر باڵی شەریعەتەوە بۆ ئەوەی ڕێ بزر نەکات، بەڵکو شەریعەتی بە پێش تەریقەت خست و کردیە بنج و بنەوان و دادوەر لەسەری، زۆر جاران دەیگوت: پێویستە لە سەرتان پەیڕەوی بکەن بێ بیدعە کردن، فێری زانست بە ئینجا گۆشەگیربە، بە هەر دوو باڵی قورئان و سوننەت بەرەو پەروەردگار بفڕە، هەر حەقیقەتێ شەریعەت شایەتیی بۆ نەدا زندیقیە.. بەمجۆرە سلوکی بە فیقهەوە بەستایەوە، هەروەك سەردەمی پێغەمبەرﷺ و خەلیفە راشیدینەکانﷺ. ئینجا هەوڵی دا شێخەکانی تەریقەت لەیەکتری نزیك بکاتەوە، مادام سەرچاوەی هەموویان یەکێکە، کە قورئان و سوننەتە، بۆ ئەم کارە لەگەڵ گەورە شێخانی سەردەمی خۆی کۆبوویەوە وەکو: عەلی کوڕی هیتی، بەقا کوڕی بە تۆ، ئەبو سەعیدی قەیلوبی، عودەی کوڕی موسافیر، موسای زولی، ئەحمەدی روفاعی، عبدالرحمن تەفسونجی، قەزیبی بان، حەیاتی کوڕی قەیس و هیتریش. هەروەها لە حەجدا لەگەڵ شێخ ئەبو مەدینی شێخی مەغریب و شێخ عوسمانی کوڕی مەرزوقی قورەیشیی شێخی میسر کۆبوویەوە و بەڵێنیان دایێ، هەروەها لەگەڵ شێخ رەسەنی دیمەشقیی شێخی شامیش هەمان کۆبوونەوەی سازدا، ئەمەش لەنێوان ساڵانی ٥٤٦ و ٥٥٠ی کۆچی بوو بە پێی ڕای دکتۆر ماجید عورسانی گەیلانی،[1] بەڵام مامۆستا محەممەدی عەینی پێی وایە، کە لە ساڵی ٥٥٩ کۆچیدا بووە.[2]

بەمجۆرە شێخ نێوانی فیقهو صۆفیگەریی ڕێکخست و زانا و صۆفیەکانی کردە براو حەقیقەتی خستە ژێر باڵی شەریعەت، صۆفیگەریشی لەو بیدعە و گومڕاییانە پاك کردەوە، کە تێی کەوتبوون، بەم شێوەیە شەرعناس و صۆفیەکانی سەردەمی خۆی لێی نزیك دەبونەوە و لە قسەی دەرنەدەچوون، هەروەها داوایان لێی دەکرد،

---

١ كتاب ( هكذا ظهر جيل صلاح الدين)، د. ماجد عرسان الكيلاني، ص ١٨٧

٢ عبد القادر الكيلاني للاستاذ محمد العيني، النسخة الفرنسية، ص ٥٠.

که له قوتابخانەی نیزامیەی بەغدا وانەکانی بلێتەوە، لەگەڵ ئەوەی، کە لێپرسراوانی ئەو قوتابخانەیە لەسەر مەزهەبی شافیعی بوون؛ گەلی لە کەڵەصۆفیەکانی وەکو: عەلی کوڕی هیتی و قەیلوبی پێش دەرگای قوتابخانەکەی شێخیان دەماڵی و ئاوڕشێنیان دەکردو بێ ئیزن وەرگرتن نەدەچوونە لای، ئەمەش جۆرە ڕێزگرتنێکی ئەو بوو.[1]

شێخ ڕێبازەکەی خۆی بەم گوتەیە روون کردۆتەوە: ((جگە لە خوا کەس نابینێ، تەنیا گوێ لە خوا دەگرێ و پشت بەو دەبەستێ، بە نیعمەتی خوا شاد بووە و بەنزیك بونەوەی بەختیار بووە و خۆی رازاندۆتەوە و گەورە بووە، بە بەڵێنی دڵخۆش بووە و حەساوەتەوە و دڵنیا بووە، هۆگری فەرموودەکانی بووە، جگە لەو لەگەڵ کەس هەڵ ناکا، پەنای بردۆتە بەر یادکردنەوەی و داکاساوە، بەقای بەخوای مەزن هەیە، پشت بەو دەبەستێ، بەرووناکیی ناسینی رێ بەدەری دەکاو چۆتە ناو بوزگوڕی ئەوەوە)).[2]

شەعرانی لەبارەی ڕێبازەکەی شێخ عبدالقادرەوە دەڵێ: ((ڕێبازەکەی یەکخواپەرستییە، لە رووی وەسف و حوکم و حالەوە، لە دیارو نادیار جێبەجێی شەرع دەکا))[3]، شێخ عدی کوڕی موسافیر لە بارەی ڕێبازەکەیەوە دەڵێت: ((ڕێبازەکەی سیس بوونە لە ژێر باری قەدەر بەرەزامەندی دڵ و گیان و یەکبوونی دیارو نادیار و داماڵینە لە سیفەتەکانی نەفس)).[4]

شێخ بەقا کوڕی بەطو دەڵێت: ((ڕێگای شێخ عبدالقادر بەرەو خوا هێندەی ڕێگای هەموو شێخەکان بوو لە توند و تۆڵیدا، ڕێبازەکەی لە ڕووی وەسف و حوکم و حاڵەوە یەکخواپەرست بوو))[5]، شێخ عەلی کوڕی هیتی دەڵێ: ((ژیانی پێشووی بریتی بوو لە راسپاردنی کارەکانی بەخوا و قایل بوون بە بەشی خۆی

---

١ قلائد الجواهر، ص ١٩.

٢ فتوح الغیب: المقالة الثالثة.

٣ الطبقات الكبرى، ج ١، ص ١٢٩.

٤ سەرچوەی پێشوو، ب ١، ل ١٢٧.

٥ سەرچوەی پێشوو، ل١٢٧.

لەگەڵ پاکانەکردن لەهەموو هەوڵ و هێزێ، ڕێبازەکەی بریتی بوو لە ڕوونکردنەوەی یەکخواپەرستی، واتا: جگە لە خوا هیچیتری لە دڵدا نەبوو، هەروەها بەیەك زانینی یەکخوایی (واتا: تەنیا وەستان بە خوا و لەگەڵ خوا) لەگەڵ ئامادە بوون لە هەڵوێستی بەندایەتی نەبەهیچ شتێ و نە بۆ هیچ شتێ))[1].

ڕێباز ڕێگەیەکە بۆ ڕەزامەندیی خوا، ڕێبازیش دەبێ چەند بنەمایەکی هەبێ، کە لە سەری دامەزرێ و چەند باڵێکی هەبێ پێی بڕوا، ئەمیش خۆ جوانکردنە بە ئاکاری چاك، ئاکاری پێغەمبەر و یارە بەڕێزەکانی، هەروەها دوور کەوتنەوە یە لە ئاکاری بەد، ڕێبواری ڕاستەقینەی خوا دەبێ لەسەر بەلا ئارام بگرێ و لەسەر نیعمەت سوپاس بکا، هەروەها دەبێ ئەم سیفەتانەشی هەبێ: بێفیزی و نەرم و نیانی و دڵسۆزی و پشت بەستن بە خوا و کۆششکردن و ڕاستگۆیی و ئیخلاس و خۆشەویستی و زوهد، جگە لەمانە دەبێ خۆی بۆ ڕۆژی دوایی ئامادە بکاو لەو شتانە دوور کەوێتەوە، کە پێچەوانەی ئەمانەن. دەبێ شێخ بۆ قوتابی و ڕێبوارەکانی پێشڕەو بێ لە ئاکاری چاك و دەبێ قوتابی و ڕێبوارەکان سەر بە شێخ بن و بەڵێنیان لێ وەربگرێ، کە لێی دوور نەکەونەوە، بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی و ڕێبوارەکانی بە ڕێگای ڕاستدا ببات، ئەو ڕێگایەی، کە دەیانگەیەنێتە ڕەزامەندی خوای مەزن، ئائەمەیە کەل و پەلی شێخ عبدالقادر لە بنەماکانی ڕێباز و سلوك کە لەمانەدا خۆیان دەبیننەوە:

## ١) ئارام گرتن :

ئارام گرتن گرنگترین بنەمای ڕۆیشتنە بەرەو خوای مەزن و گرنگترین سیفەتی پێغەمبەران و وەلی و پیاو چاکانە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**أَشَدُّ النَّاسِ بَلاءً الأَنْبِيَاءُ ثُمَّ الصَّالِحُونَ ثُمَّ الأَمْثَلُ فَالأَمْثَلُ**: پێغەمبەران لە هەموو کەسێ زیاتر

---

[1] سەرچوەی پێشوو. التجريد : خاڵی کردنی دڵە لە هەموو شتێ جگە لە خوای مەزن.
التفريد: وەستانت بە خوا و تەنیا لەگەل خوا.

تووشی بەلا دەبن، ئینجا پیاو چاکان ئینجا هاووێنەی ئەوان.))[1].

ئارامگرتن سێ جۆرە: ئارامگرتن لەسەر گوێرایەڵیکردنی خوا، ئارامگرتن لەسەر گوناه، ئارامگرتن لەسەر بەلا و ناخۆشی.

شێخ عبدالقادر هەر لەو رۆژەی لە گەیلانەوە بەرەو بەغدا دەرچووە تووشی چەندەها بەلا بووە، شێخ بە هەژاری و برسێتی و رووتی و تەکینەوەی خەڵك لێیو ئیهانەکردنی تاقیکراوەتەوە، هەروەها بە بلاوبوونەوەی بەدکاریی لە بەغدا و ستەمی دەسەلاتدار و سەرکردەکان لەسەر خەڵکی رەمەکی تاقیکراوەتەوە، ئینجا بە مردنی گەلێ لە منداڵەکانی، لەسەر ئەم هەموو ناخۆشیانە ئارامی گرت و سکالای نەکرد، تا خوای گەورە خۆی ئەنجامێکی بۆ دادەنا.

شێخ (رەحمەتی خوای لێبێ) دەیگوت: ئارامگرە و دژایەتیی ئارەزوو بەکە و بەقەزا قایل بە، بەمە ئومێدی فەزڵ و بەخشینت هەبێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ : ئارامگرەکان بێ حسێب پاداشتی خۆیان وەردەگرن.﴾[2]، ئارامگرە و پەلەمەکە، بەقەزا قایل بەو پەلەمەکە، لەئەنجامدا ساردێتی لێبووردنی خواو نەرم و نیانی و بەخشندەییت دەگاتێ،[3] خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ : ئەی گەلی خاوەن بڕوایان! خۆڕاگرن، لە خۆراگریشا هەر لە پێشەوە بن، بۆ پاراستنی سنورگەل هەمیشە ساز و تەیار بن، لەخواش ترستان هەبێ، بەشکەم رزگار بن.﴾[4]. ئەی بڕوادار خوا فەرمانی ئارامگرتنی پێکردووی، ئینجا فەرمانی پێکردووی کە لە جیهادا ئارامت هەبێ و لەسەر سنوور بچەسپی و پارێزگاریی ئاینەکەی بکەیت و هەردەم لەگەڵ خوا بیت، دوایی ئاگاداری کردووی، کە واز لە ئارامگرتن نەهێنی و فەرمویەتی: لە خوا بترسن لە وازهێنانی ئارامگرتن.

---

١ رواه الترمذي: سنن الترمذي، كتاب الزهد، رقم: ٥٧.

٢ الزمر / ١٠، فتوح الغيب: المقالة: ١١.

٣ فتوح الغيب: المقالة: ٢٨.

٤ آل عمران / ٢٠٠.

واتـــا: واز لە ئارامگرتن مەهێنن، چونکە چاکە و بێ زیـانی لەودایـە، پێغەمبـەرﷺ فەرموویەتی: ((**الصَّبْرُ مِنَ الإيمَانِ كَالرَّأسِ مِنَ الجَسَدِ**: ئـارامگرتن لـە بڕوادا وەکو سەرە لە لەشدا.)) ئارامگرتن سەری هەموو چاکـەو بێ زیانییەکە لـە دنیـا و ڕۆژی دوایی، هەر لە ئارامگرتنەوە بڕوادار بەرەو حاڵەتی ڕەزا و قـایلبوون بـەرز دەبێتـەوە، ئینجا نەمانی(فناء) لە کردەوەکانی خوادا.[1]

هەروەها لە بارەی ئارامگرتنەوە لێیان پرسی، گوتی: ((ئارامگرتن وەستانێکی بە ئەدەبانەیە لەگەڵ بەڵا و وەرگرتنـی قەزایـەکانی خوایە بەسـینگ فراوانییـەوە لەسـەر فەرمانەکانی قورئان و سوننەت. ئارامگرتن چەند بەشێکە: ئـارامگرتنێك بـۆ خـوای مەزن، کە بریتیە لە خۆگرتن لەسەر فەرمان بە چاکە کردن و نەهی لـە خراپەکردن، ئـارامگرتنێك لەگـەڵ خـوای مـەزن، کـە بریتیـە لـە بێدەنگبـوون لـە ژێربـاری قـەزاو کاری لێت، ئارامگرتنێ لە سەر خـوای مـەزن، کـە بریتیـە لـە ئارەزوومـەندیکردنی بـەڵێن و هەڕەشـەی لـە هـەموو شتێ. بەجێهێشتنی خـەڵك بـۆ خۆشەویستیی حـەق کارێکی قورسە، ڕۆیشتن بـەرەو خـوا قورسـترە، ئـارامگرتن لەگـەڵ خـوا قورسـترە. هـەژاری ئـارامگر لـەلای خـودا لـە دەوڵەمـەندی سوپاسـگوزار چاکـترە، هـەژاری سوپاسـگوزار لـە هــەردووکیان چاکــترە، هـەژاری ئـارامگری سوپاسـگوزار لـە هەموویان چاکترە. کەس داوای بەڵا ناکا تەنیا ئەوەی پاداشتەکەی دەزانێ))[2].

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە بەڵاو ناخۆشی نەدەترسا و دەیگوت: ئەی کوڕی خۆم، بەڵا بۆ ئەوە نەهاتووە لە نـاوت ببـات، بـەڵکو بـۆ تاقیکردنـەوەی ئـارامگریی و بڕوات هاتووە. هەر وەك پێغەمبەرﷺ لەم بارەیەوە دەفەرمووێ: ((**الطُّـــهُورُ شَــطْرُ الإِيمَانِ وَالْحَمْدُ لله تَمْلأُ الْمِيزَانَ وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لله تَمْلآَنِ أَوْ تَمْلأُ مَا بَيْــنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالصَّلاةُ نُورٌ وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ وَالْقُرْآنُ حُجَّــةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا-أي مُحَرِّرَها مِنَ العَــذابِ-**

---

[1] فتوح الغيب: المقالة: ٣٠.

[2] قلائد الجواهر، ص ٧٢.

**أَوْ مُوبِقُهَا-أي مُهلِكَها بِغَضَبِ اللهِ تَعَـالَى-**: پاكی بەشێكە لە ئیمان، (الحمدلله) تەرازووی چاكە پڕدەكا، (سبحان الله و الحمدلله) نێوان ئاسمانەكان و زەوی پڕچاكە دەكەن، نوێژ رووناكییە، خێر و چاكە بەڵگەیە، ئارامگرتن رۆشناییە، قورئان بەڵگەیە بۆت یا بەڵگەیە لەسەرت، هەمووكەسێ كۆتاییی دێت جا خۆی فرۆشتووە یا خۆی كڕیوەتەوە واتا لە سزا رزگاری كردووە یاخود بە خەشمی خوا بەهیلاكی داوە.))[1] هەروەها دەفەرموێت: ((**إِنَّ عِظَمَ الْجَزَاءِ مَـعَ عِظَـمِ الْبَلاءِ، وَإِنَّ اللهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْمًا ابْتَلاهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا وَمَنْ سَخِطَ فَلَـهُ السَّـخَطُ**: گەورەیی پاداشت لەگەڵ گەورەیی بەڵایە، خوای مەزن ئەگەر میللەتێكی خۆشویست تاقیان دەكاتەوە، ئەوەی پێی قایل بێت رەزای خوای بۆ هەیە و ئەوەی پێی قایل نەبێت خەشمی خوای بۆ هەیە.)).[2]

## ٢) سوپاسكردن :

سوپاسكردن یەكێكە لە بنەماكانی رۆیشتن بەرەو خوای مەزن، سوپاسكردن تەنیا بە زمان نابێ بەڵكو دەبێ بەزمان و ئەندامەكانی لەش بێ، بەگوتە و بەكردەوە بێ، ابن القیم دەڵێت: ((سوپاسكردن بەردەوامبوونی دڵە لەسەر خۆشویستنی نیعمەت بەخش و (خوا) و بەردەوامبوونی ئەندامەكانی لەشە لەسەر گوێڕایەڵیكردنی و بەردەوامیی ومانە لەسەر یادكردنی و ستایشكردنی))[3].

شێخ عبدالقادر بەدرێژاییی ژیانی لە ئارامگر و سوپاسكەرەكان بووە، ئارامی لەسەر بەڵا گرتووە و سوپاسی خوای كردووە، بەزمان و دڵ و ئەندامەكانی لەشی سوپاس و ستایشی نیعمەتی كردووە.

---

١ رواه مسلم: رياض الصالحين – باب الصبر رقم: ٢٥.

٢ رواه الترمذي وقال حديث حسن.

٣ مدارج السالكين لأبن القيم، ج ٢، ص ١٣٦.

شێخ لەبارەی سوپاسەوە لێیان پرسیوە و گوتوویەتی: ((راستیی سوپاسکردن، دان نانە بە نیعمەتی خوا لەرووی ملکەچی و بینینی منەت و پاراستنی رێز و حورمەت، ئەمەش دابەش دەکرێتە سەر سوپاسکردن بە دڵ))[1].

## ٣) بێ فیزی :

بێ‌فیزی یەکێکە لە سیفەتەکانی پێغەمبەران و پیاوچاکان، خوای مەزن دەفەرمووێ: ﴿وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ: باڵی خۆت بۆ بڕوا داران بنەوێنە.﴾[2]، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((**مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلاَّ عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ**: خێر و بەخشین ماڵ کەم ناکا، هەر بەندەیێ لێبووردنی هەبێ خواسەر بەرزی دەکا، هەر کەسێ بێ فیزی بۆ خوا بنوێنێ خوا پایەی بەرزدەکاتەوە.))[3].

شێخ عبدالقادر (رەحمەتی خوای لێبێ) هەموو شەوێ داوای دەکرد، کە سفرە رابخرێ و لەگەڵ مێوانەکانی دەیخوارد و لەگەڵ بێ‌دەرەتان دادەنیشت، لەسەر قوتابیانی زانست بە ئارام بوو، ئەوەی لەگەڵی دابنیشتایە هەستی بەوە نەدەکرد، کە کەس لەو بەرێزتر هەیە، گەر هاورێیەکانی دیار نەبان لێیانی دەپرسی و پارێزگاریی هاورێیانی دەکرد، لە خراپەکانیانی دەبووری و ئەوەی سوێندی بۆ بخواردایە بڕوای پێ دەکرد. پارچە زەویەکی لە گوندی هەبوو لای یەکێ لە برادەرەکانی و گەنمی لێ دەچاند و هەموو ساڵێ تۆی دەکرد. هەندێ لەبرادەرەکانی گەنمەکەیان دەکردە ئاردو چوار پێنج کولێرەیان لێدەکرد و ئێواران بۆیان دەهێناو ئەویش پارچە پارچەی دەکردو دەیدایە ئامادەبوان و ئەویتریش بۆ خۆی دەهێشتەوە. (موزەفەر)ی خزمەتکاری بەتەبەقی نانەوە لەبەر دەرگای ماڵی شێخ دەوەستاو دەیگوت: کێ

---

١ قلائد الجواهر، ص ٧١ بەدەستکارییەوە.

٢ الحجر / ٨٨.

٣ موسلیم گێراوێتیەوە ( ریاض الصالحین رقم ٥٥٥).

نانی دەوێ، کێ نانخواردنی ئێوارەی دەوێ، کێ دەیەوێ شەو بمێنێتەوە؟ گەر دیاریەکیان بۆ بهێنابایە دابەشیدەکرد، یا هەندێکی دابەشدەکردە سەر ئامادەبوان و بەخشیشی دەدایە خاوەن دیاریەکە، شێخ نەزری وەردەگرت و لێی دەخوارد.[1]

((شێخ موعەممەری جەرادە گوتی: چاوم لە شێخ عبدالقادر ئاکار چاکتر و سینگ فراوانتر و دەروون بەخشندەترو دڵ بەبەزەیی تر و بەڵێن پارێزتر و دڵسۆزتری نەدیت، شێخ لەگەڵ شکۆمەندی و پلەو پایە بەرزی و زانست زۆریی لەگەڵ بچووك دەوەستا و رێزی گەورەی دەگرت، سەرەتا ئەو سەلامی دەکردو لەگەڵ گەدایان دادەنیشت و لەگەڵ هەژاران بێفیز بوو، بۆ هیچ گەورە پیاو ماقوڵێ هەڵنەستاوەتەوە و نەچۆتە بەردەرگای وەزیرو سوڵتانێ))[2].

((لەگەڵ شکۆمەندیی رێزی یەکێ لە ئاکارەکانی ئەوە بوو، کە لەگەڵ گچکە و کەنیزە رادەوەستا، لەگەڵ هەژاران دادەنیشت و جل و بەرگی پاك دەکردنەوە))[3].

شێخ دەیگوت: بێ فیز بن و بە دەعیە مەبن، بێفیزی بەرزت دەکاتەوە و بەدەعیەیی نزمت دەکاتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**مَنْ تَوَاضَعَ لِلَّهِ رَفَعَهُ اللَّهُ**: هەر کەسێ بۆ خوا خاسکاری بکات خوای گەورە پایەی بەرز دەکاتەوە.))[4]

هەروەها دەیگوت: گەر خوای گەورەت توورەکرد ئەوا دەعیەت لەسەری لێداوە، ئەگەر بانگدێر بانگی داو بۆ نوێژ هەڵنەستای، ئەوا دەعیەت لەسەری لێداوە، ئەگەر ستەمت لە یەکێ لە خولقێنراوەکانی خوا کرد، ئەوا دەعیەت لە سەری لێداوە، تۆبە بکەو لە تۆبەکەت دڵسۆزبە پێش ئەوەی خوا لە ناوت بەرێ، هەروەك نەمرود و پاشایەکانی تری لە ناو برد))[5].

---

١ قلائد الجواهر، ص ٨.

٢ قلائد الجواهر، ل ١٩.

٣ الطبقات الكبرى للشعراني، ج ١، ص ١٢٦ و دوای ئەو.

٤ الفتح الرباني: المجلس: ٥٩.

٥ سەر چاوەی پێشوو : المجلس : ٣٤ .

## ٤ ) ڕاستگۆیی و دڵسۆزی :

خواپەرستی تەنیا بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی دەسازێ، هەروەها ڕێبازیش هەر بە ڕاستگۆیی دڵسۆزی دەسازێ، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێ:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ : تەنیا ئەو فەرمانەیان پێدرا بوو، کە بە دڵسۆزییەوە خوا بپەرستن و ئاینی خالیس بۆ خوا دابنێن و خۆیان پاك بکەنەوە و نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەمەیە ئایینی راست و پایەدار و دروست.﴾[1]، هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ئەی ئەوانەی بڕواتان بە خوا هێناوە لە خوا بترسن و لەگەڵ راستگۆیان بن.﴾[2]

شێخ عبدالقادر بە درێژاییی ژیانی راستگۆو دڵسۆز بوو لە حاڵ و گوتە و کردەوەکاني، دایك و باوکی بەمجۆرە پەروەردەیان کردبوو، هەر بەمجۆرەش مایەوە، تا گەیشتە خوای خۆی، شێخ دەیگوت: ((رۆڵە، راستگۆ و دڵسۆزبە، گەر ئەو دوانە نەبوایە هیچ کەسێ لە خوا نزیك نەدەبوویەوە.. خواناس بە باڵی دڵسۆزی لە تاریکیی قەفەسی گەردوون دەفڕێ بەرەو فراوانیی ڕووناکیی پیرۆز، لەدوای فڕین دادەبەزێتە ناو سێبەری گوڵزارێ، کە کورسیی راستگۆییی تێدایە.. رۆڵە، ڕێگای بۆ خوا یەکێ پێیدا دەڕوا، کە توێشووی راستگۆییی هەبێ و نایگاتێ تەنیا بەبەرۆژوو بوون لە دنیا و ئەوەی تێیدا نەبێ.. ئەگەر نەفس لە لێڵیی مرۆڤایەتی بێگەرد بوویەوە، ئەوا فەرمانەکان جێبەجێ دەکا.. خۆشی بۆ ئەو کەسەی، کە لە پاڵدانەوەی خافڵەتیی ژێری بەئاگا بێتەوە و شوێنی حاڵی پاك بێتەوە بە نزیك بوونەوە لە خوای، بە ئەدەبەوە بەرەو خێراترین حسێبکەر دەربچێ و قۆڵ و بازووی هەڵ بکا بۆ پێشبڕکێی رۆژی دوایی، لە نەفسی خۆی بپێچێتەوە لەو شتەی کە دەبێ

---

١ البينة / ٥. ٢ التوبة / ١١٩.

لێی دەربچێ، دنیا مەیدانی تێپەڕەو ڕۆژی بەپابوونەوە زەحمەتتر و تاڵترە))[1].

شێخ عبدالقادر دەیگوت: ((بنچینەی کردەوەکان یەکخواپەرستی و دڵسۆزییە، ئەوەی یەکخواپەرستیی نەبێ و دڵسۆزیی نەبێ کردەوەی نییە، بنچینەی کردەوەکانت بە یەکخواپەرستی و دڵسۆزی پتەو بکە، ئینجا بە هەوڵ و توانای خوای مەزن کردەوەکانت بنیات بنێ نەك بە هەوڵ و توانای خۆت))[2].

((هەر کردەوەیێ دڵسۆزیی تێدا نەبێ توێکڵە و کاکڵی نییە، دارێکی درێژ کراوە و گیانی تێدانییە، وێنەیەکی بێ واتایە، ئەمەش کردەوەی دووڕووەکانە))[3].

## ٥) پشت بەستن بە خوای مەزن:

بەرزترین سیفەتی ڕێبوارانی صۆفیگەرییە، بە لکو سیفەتێکە لە هەموو حاڵەتەکاندا پێوەیان بەندە، بەقایی بوونە بە خوای مەزن، نائومێد بوونە لەوەی لەدەست خەڵکییە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥ: ئەوەی پشت بە خوا ببەستێ خوای بەسە.﴾[4]

شێخ عبدالقادر بە درێژاییی ژیانی پشتی بە خوا بەستبوو لە هەموو حاڵەتەکانیدا، لەکاتی هەژاری و بێ هێزیی پشتی بە خوا بەستبوو، لە کاتی دەوڵەمەندی و بە هێزیی پشتی بە خوا دەبەست و دەیگوت: ((ئەوەی دەیەوێ ئایینی خوا بەتین بێ، با پشت بەخوا ببەستێ، چونکە پشت بەستن دڵ چاك دەکاتەوە و بەهێزی دەکاو پاکخویی دەکا و فێری ڕێڕونی دەکا و شتی سەیرو سەمەرەی نیشان دەدا.. ئەوەی دەیەوێ لە دنیا و ڕۆژی بە پابوونەوە دەوڵەمەند بێ، با هەر لە خوا بترسێ و هەر لەبەر دەرگای ئەو بوەستێ))[5].

---

١ قلائد الجواهر، ص ٦١.

٢ الفتح الرباني: المجلس / ٦.

٣ سەر چاوەی پێشوو، المجلس / ٢٤.

٤ الطلاق / ٣.

٥ الفتح الرباني: المجلس: ٤٢.

## ٦) زوهد لە دنیا و ویستنی ڕۆژی بەپاوبوونەوە :

سلوك بەبێ زوهد نابێ، زوهد دروشمی هەموو پێغەمبەر و وەلی و پیاو چاکانە.

زوهد ئارەزوو نەکردنە لە شتێ، بە پێی زاراوەی صۆفیەکان: بریتیە لە ڕقلێبوونەوەی دنیا و دوور کەوتنەوە لێی.[1]

شێخ عبدالقادر (رەحمەتی خوای لێبێ) هەموو ژیانی بە زاهیدی بردەسەر؛ هەر کە هەژار بوو زاهید بوو، دینارەکانی خستە بەردەم دزەکان، هەر کە لە گەیلانەوە بەرەو بەغدا دەهات، هەر کە دنیا ڕوی تێکرد زاهید بوو، هێندە گرنگیی پێ نەداو نەیهێشت دنیا لە دەستی تێپەرێ و بەرەو دڵی بچێت، شێخ خواردنی دەدا خەڵکی و رووتی جل و بەرگ دەکردو بێ حسێب دەیبەخشی، تا (ئیبن جەوزی) لە بارەیەوە گوتی: ((ناوبانگی بە زوهد دەرکرد و رێبازی هەبوو و بێدەنگ بوو))[2].

شێخ دەیگوت: ((ئەوەی رۆژی دوایی بوێ دەبێ لە دنیا زوهدی هەبێ، ئەوەی خوای مەزنی بوێ دەبێ لە رۆژی دوایی زوهدی هەبێ، واز لە دنیای دێنێ بۆ رۆژی دوایی و واز لە دوایی دێنێ بۆ خوای ... گەر ئەوەی بۆ بوو، خەم و پەژارە لە دڵی نامێنێ و مەینەت لە دەروونی نامێنێ، هێمنی دایدەگرێ و خدو بەخوا دەگرێ))[3].

هەروەها دەڵێ: ((برایەکەم، تو خوا بە درێژیی ژیان و زۆریی سامان و پلە و پایە هەڵنەخەڵتێی، چونکە لە نێوان گۆڕانی شەوو رۆژدا، کاروبار و رووداوی سەیر ڕوو دەدا، ئاگات لە خۆ بێ ئا ئەوە دنیایە، شیری هەڵکێشاوە بۆ کوشتنت، دنیا زۆردار و مەکربازە، هەر هەلی بۆ هەڵکەوێ هێرشت دەکاتە سەرێ، چەندی وەکو تۆ بەبریق و باقی هەڵخەڵەتاو مەیدانی تەماحی بۆ فراوانکردو ئەویش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوو و گوێی لە سوێندەکانی گرت و بەدوای ئارەزووی دنیا کەوت،

---

١ التعريفات، ص ١٥٣.

٢ المنتظم لأبن الجوزي، ج١٠، ص ٢١٩.

٣ فتوح الغيب: المقالة / ٥٤.

ئینجا لە ناکاو کاسەیێ ژەهری دایێ و هەر هێندەی زانی لە ئاوەدانی دابڕا))[1].

هەروەها دەڵێت: ((ڕۆڵە، ڕۆژی دوایی بە پێش دنیا بخە، تا هەردووکیان بە دەست بێنی، ئەگەر دنیات بە پێش ڕۆژی دوایی خست هەردووکیانت لە کیس دەچێت و سزات وەردەگری.. بڕوادار بۆ دنیا و ڕۆژی دوایی هەوڵ دەدا، بە پێی پێویستی هەولی دنیای دەدا قەناعەتی پێ دەکا وەکو توێشووی سوارێکی نەزان، کە هەموو مەبەستی دنیا بێ، خواناسیش هەموو مەبەستی ڕۆژی دواییە و ئینجا خوای خۆی))[2].

((دنیا دەریایە، شەرع کەشتییە، کەشتیەوان لوتفی خوای مەزنە، ئەوەی لە پەیڕەویکردنی شەرعی لادا لە دنیادا نقوم دەبێ، ئەوەی پەنای بردە بەر کەشتیی شەرع و لەوێ دانیشت، کەشتیەوان دەیکاتە جێگری خۆی و کەشتی و کەل و پەلەکەی دەداتێ، بەجۆرە هەرکەسێ واز لە دنیا بێنێ و بەزانستەوە خەریك بێ و لە سەر ئازار ئارام بگری دەبێتە خۆشەویستی شەرع.. خوای گەورە هەندێ بەندەی هەیە ناوی لێناون کارسازەکان، بە خۆشی دەیان ژێینی، بە خۆشی دەیان مرێنی، بە خۆشیش دەیان باتە بە هەشت))[3].

((ڕۆژی دواییت بکە سەرمایەت و دنیاشت قازانجەکەی، کاتەکەت بۆ بەدەستهێنانی دواییت بچوێنە، ئینجا ئەگەر هەندێ لە کاتەکەت زیاد بوو لە دنیات بیبەسەر.. ئەگەر بە زوهدی لە دنیات گوێڕایەڵیی خوای مەزنت کرد؛ دەبیت بە تایبەتەکانی خواو گوێڕایەڵ و خۆشەویستەکانی، ڕۆژی دواییشت بۆ پێکدێ، کە بە هەشت و نزیکیە لە خوا، هەروەها دنیا لە خزمەتت دادەبێ و ئەو بەشەی بۆت دانراوە دێتە بەردەستت))[4].

---

١ قلائد الجواهر، ص ٦٠.

٢ الفتح الرباني: المجلس / ١٣.

٣ سەر چاوەی پێشوو: المجلس / ٦٢، ص ٣٣٧ .

٤ فتوح الغيب: المقالة / ٣٦.

((دنیا وەکو دارێکە، ئارام یەکەم بەرێتی و تاڵە، کۆتاییەکەشی شیرینە، هیچ کەسێ ناگاتە شیرینیەکەی، تا تاڵییەکەی نەچێژێ، ئەوەی ئارامی لە سەر بەڵای دنیا گرت نیعمەتەکەی بۆ شیرین دەبێت، کرێگرتە دوای ماندوو بوون و ئارەق رشتنی کرێیەکەی دەدرێتێ.. ئەگەر بەندە لە سەر جێبە جێکردنی فەرمانەکانی خوا و دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکانی و خۆدانە دەست قەدەرەکانی ئارامیگرت، خوای گەورە لە کۆتاییی ژیانیدا خۆشیی ژیانی پێدەبەخشی))[1].

## ٧) قایلبون:

قایلبوون رەزای دڵە بە تاڵیی قەزای خوای مەزن، ئەمەش سیفەتێکی پەیوەستە بە رێبوارانی تەریقەت.

شێخ (رەحمەتی خوای لێبێ) لە هەموو حاڵەتەکانی ژیانی بە فەرمانی خوا قایل بوو و دەیگوت: ((ئەدەبت جوان بکە، هەمیشە بێدەنگ و ئارامگر و رازی بە لەگەڵ خوای مەزن.. چونکە خوا کارزانە و کاربەجێیە و دژایەتی لە کارەکانیدا نییە و بێهوودە هیچ کارێ ناکا.. بەرامبەر خوا گومانت چاکبێ و ئارامگرە و قایل بە، ئەوەی بۆ تۆیە لێت ناسەندرێتەوە و ئەوەی بۆ تۆ نییە ناتدرێتێ.. لە پاڕانەوەی نائومێد مەبە و تاوانباری مەکە لە درەنگیی وەڵامدانەوەی، چونکە گەر قازانچ نەکەیت زیانیشت نەکردووە، ئەگەر بە خێرایی وەڵامت نەداتەوە، ئەوا بە درەنگەوە پاداشتت دەداتەوە، لە فەرموودەیەکی راستی پێغەمبەرﷺ هاتووە: **((العَبدُ يَرَى فِي صَحَائِفِهِ حَسَنَاتٍ يَومَ القِيَامَة لاَ يَعرِفُهَا فَيُقَالُ لَهُ إنَّهَا بَدَلُ سُؤالِكَ فِي الدُنيَا الَّذي لَم يُقدَرْ قَضَاؤُه فِيهَا–أوْ كَمَا وُرِدَ–**: بەندە لە رۆژی بە پابوونەوە دا هەندێ چاکەی خۆی لەلاپەڕەکانی بەدی دەکات و نازانێ هی چییە، پێی دەگوترێ ئەمە بریتیی ئەو داوایانەیە، کە لە دنیا داوات کردبوون، خوا بۆتی دانەنابوو.))[2].

---

١ فتوح الغيب: المقالة / ٤٥.

٢ سەرچاوەی پێشوو: وتاری / ٣٤.

## ٨) خۆشەویستی:

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ : ئەی محەممەدﷺ پێیان بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ؛ پەیڕەویی من بکەن خوا خۆشتانی دەوێ و لە گوناهەکانتان دەبووری، خوا لێبووردە و دلۆڤانە.﴾[1]

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، هەر کەسێ لە ئایینی خوا هەڵگەڕێتەوە، خوا لە ئایندەدا کۆمەڵێك پەیدا دەکا، کە خۆشیانی دەوێ و خۆشیان دەوێ، بەرامبەر بڕواداران نەرم و نیان و بەرامبەر بێبڕوایان سەر بەرز و توندوتیژن، لە پێناو خوا تێدەکۆشن و لە سەرزەنشتی کەس ناترسێن، ئەوە فەزلی خوایە و ئەوەی بیەوێ دەیداتێ، خوا زانایەو دەس گوشادە.﴾[2]

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ: خوای گەورە تۆبەکارانی خۆش دەوێ، هەروەها ئەوانەشی خۆش دەوێ کە خۆیان بە پاك و تەمیزی رادەگرن.﴾[3]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ خوا تەقوادارەکانی خۆش دەوێ.﴾[4]، ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ : خوا چاکەکارانی خۆش دەوێ.﴾[5]، ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ: خوا ئارامگرەکانی خۆش دەوێ.﴾[6]،

---

١ آل عمران / ٣١.
٢ المائدة / ٥٤.
٣ البقرة / ٢٢٢.
٤ التوبة / ٤.
٥ آل عمران / ١٣٤.
٦ آل عمران / ١٤٦.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ: خوا ئەوانەی خۆش دەوێ کە پشتی پێ دەبەستن.﴾[1]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ : خوا داد پەروەرەکانی خۆش دەوێ.﴾.[2]

خۆشەویستی دروشمی رێبوارە راستگۆیەکانە و کانگای هەموو سیفەتە چاکەکانی رێبوارانی تەریقەتە، کانگای ئارامە ئەگەر تاقیکرانەوە، کانگای سوپاسە ئەگەر نیعمەتیان لەگەڵ کرا، کانگای رەزایە بۆ ئەو شتەی کە بۆیان دانراوە، لەپێناو خۆشەویستاندا نەماون، ویستیان ویستی دولبەرە، هیچیان ناوێ گەر ئەو نەیەوێ، کاریێ ناکەن گەر فەرمانیان پێنەکرێ، قەدەغەی شتێ ناکەن گەر قەدەغەی نەکرێ، جگە لەو سەیری کەس ناکەن، لەو نەبێ بیر لە کەس ناکەنەوە، فەرموویەتی: ئەو تۆبەکارانی خۆشدەوێ، ئەوانیش تۆبەیان کرد، پاکەکانی خۆشدەوێ، ئەوانیش خۆیان پاککردەوە، تەقوادارانی خۆشدەوێ، ئەوانیش لە خواترسان، چاکەکارانی خۆشدەوێ، ئەوانیش چاکەیان کرد، ئارامگرانی خۆشدەوێ، ئەوانیش ئارامیان گرت، خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ، ئەوانیش دادپەروەرییان کرد.

شێخ دەڵێت: ((... تۆ نازانی خوای گەورە جوامێرە، تۆی بۆ خۆی خولقاندووە و تۆش دەتەوێ بۆ هیتر بیت. ئایا گوێت لە فەرمانی خوا نەبووە ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ: ئەوانی خۆش دەوێ و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێ.﴾، هەروەها فەرموودەکەی ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ: جنۆکەو مرۆڤم تەنیا بۆ پەرستن خولقاندووە.﴾، ئایا گوێت لە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ نەبووە: ((**إذَا أَحَبَّ اللهُ عَبْدَاً أبْتَلاَهُ، فإنْ صَبَرَ أفتَنَاهُ، قِيلَ: يَا رَسُولَ الله، وَمَا أفتَنَاهُ ؟ قَالَ: لَمْ يَذرْ لَهُ مَالاً وَلاَ وَلَدَاً، وَذَلِكَ لأَنَّهُ إذَا كَانَ لَهُ مَالٌ وَوَلَدٌ أَحَبَّهُمَا، فَيَصِيرُ مُشْتَرِكَاً بَيْنَ اللهِﷻ وَبَيْنَ غَيْرِه، وَاللهُ تَعَالَى لاَ يَقْبَلُ الشِرْك**...: ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆشویست توشی بەڵای دەکا، ئەگەر ئارامی گرت تاقی دەکاتەوە، گوتیان ئەی

---

[1] آل عمران / ١٥٩.

[2] المائدة / ٤٢.

پێغەمبەری خوا تاقیکردنەوەی چیە؟ فەرمووی: کوڕ و ماڵی نەداتێ، چونکە ئەگەر کوڕ و سامانی هەبێ خۆشیانی دەوێ، جا لەگەڵ خۆشەویستیی خوا هاوبەش دەبێ، خوای گەورەش هاوبەشی قەبوڵ ناکات....))، ئەو کاتە هۆکارەکانی وەکو: سامان و کوڕ و کەس و کارو هاوڕێ و حوکم و زانین زیانیان بۆ دڵ نابێت چونکە ئەوانە هەموو دەکەونە دەرەوەی دڵەوە و خوا غیرەی نابزوێ و.. دەبێتە کەرامەتێکی خوایی بۆ بەندەکەی، دەبێتە نیعمەت و رۆزی و سوودێك لە خواوە بۆ ئەوانەی دێنە لای.[1]

ئەم خۆشەویستیە قول و راستگۆیەی خواو پێغەمبەرﷺ لە نەتەوەی ئیسلامدا شیعرێکی وای بەرهەمهێنا، کە وێنەی لە هیچ نەتەوەیەکی تردا بەرچاو ناکەوێ، ئەویش شیعری صۆفیانەیە و کۆمەڵێ شاعیری وای هێناوەتە کایەوە، کە لە مێژوودا نەمرن و شیعرەکانیان بۆ گەلێ زمانی دنیای وەرگێردراوە، وەکو رابعەی عەدەویە، ئەبوحەسەنی نوری، ئەحمەدی روفاعی، سەمنونی موحیب، شبلی، ذی‌النونی میسری، تەقی‌الدینی کوڕی تەمام و ابن الفارض و عطار و سەعدی شیرازی و حافزی شیرازی و جەلال الدینی رۆمی و محەممەد ئیقبال.

شێخ عبدالقادر لەم بوارە دەستێکی باڵای هەبووە و لەو کاتەی، کە باسی کتێب و دانراوەکانی دەکەین بەویستی خوا دەچینە سەر هەندێ لە شیعرەکانی و دەیان ناسین.

## ٩) کۆششکردن:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ: ئەوانە کۆششیان کردو هەوڵیان دا بگەنە ئێمە، رێگای گەیشتنیان پێ نیشان دەدەین و خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە چاکە دەکەن.﴾[2]

---

[1] فتوح الغيب: المقالة / ٣٢.

[2] العنكبوت / ٦٩ .

جورجانی له (التعریفات)ەکەیدا دەڵێ: ((موجاهده لە زماندا جەنگینە، لە شەرعدا جەنگینە لەگەڵ نەفسی بەدکردار و بە پێی داوای شەرع هەڵی گرێ کە زەحمەت بێ لە سەری جێبەجێی بکات))[1].

ڕێبوارانی صۆفیگەریی تەنیا بە کۆششکردن (مجاهدة) دەتوانن بگەنە مەبەستیان، کە ڕەزامەندیی خوایە، بە جەنگین لەگەڵ نەفسیان، چونکە نەفس پێش هەوڵدان لەگەڵی و ڕاهێنانی لە بەدخوازەکانە، نەفس گیان نییە، گیان هەر وەکو شێخ عبدالقادر دەفەرمووێ ئاسمانییە و غەیبیە، بەڵام نەفس خاکییە زەمینیە. بوصیری لە (بوردە)کەیدا دەڵێ: -

وخالف النفس والشيطان وأعصهما

وإن هما محضاك النصح فاتّهم

واتە: دژایەتی نەفس و شەیتان بکەو لێیان عاسیبە، ئەگەر هەردووکیان ئامۆژگارییان کردی، تاوانبارت دەکەن.

نەفس پێش ئەوەی لەگەڵی هەوڵ بدرێ بە شەهوەت و ئارەزووەکانیەوە بەندە، ئەمەش نەفسی بەدکردارە (الامّارة بالسوء)، بۆیە دەبێ بە یادکردن و خواپەرستی و سوننەتی زۆر کۆشش و هەوڵی لەگەڵ بدرێ بۆ ئەوەی بگاتە پایەی نەفسی سەرزەنشتکار (اللوّامة)، ئینجا بگاتە نەفسی دڵنیاو نەفسی ڕازی و نەفسی ڕازیکراو و هەورازتر.

شێخ عبدالقادر دەفەرمووێ: ((دنیا هەمووی دانایی و کارکردنە، ڕۆژی دواییش هەمووی توانایە، دنیا لەسەر دانایی دامەزراوە، ڕۆژی دواییش لەسەر توانا، کردەوە لەماڵی دانایی(حکمە) جێ مەهێڵە، بە پێی حیکمەتەکەی کاربکەو پشت بەتوانای مەبەستە، قەدەر مەکە بیانووی نەفست و واز لە کارکردن بهێنی، بیانوو هێنانەوە بە قەدەر بەڵگەی تەمبەڵانە، بیانوو هێنانەوە بەقەدەر لە فەرمان و

١ كتاب التعريفات للجرجاني، ص ٢٥٩ .

نەهی کردن دروست نییە.[1]

هەروەها دەڵێت: ((هەرچەندە لەگەڵ نەفست بجەنگی و بەسەریدا زاڵ بیت و بە شمشێری ناڕێکی بیکوژی خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە، هەرچەندە دژایەتیی کردی و داوای شەهوەت و چێژی لێکردی، دەبێ بگەڕێیتەوە دژایەتیکردن لەگەڵی بۆئەوەی هەمیشە پاداشتت بۆ بنووسرێ، ئەمەش واتای ئەم فەرمودەیەی خوایە: ﴿وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ : پەروەردگارت بپەرستە تا ئەو کاتەی مردن دەتگاتێ.﴾[2] چونکە نەفس حەزی لە هیچ پەرستنێ نییە و دژی ئەمەی دەوێ، تا دەگاتە دڵنیابوون(یقین)، واتا: مردن.. ئەگەر بڕوادار تامردنی لەسەر ئەم کۆششکردنە بەردەوام بوو، خوای گەورە شتێکی وای پێ دەبەخشێ کە بە هەشتی پێ مسۆگەر بکات، هەروەك خوا دەفەرمووێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ : بەڵام هەرکەسێ کە لە گەورەیی پەروەردگار ترساوە و نەفسی خۆی لە هەواو هەوەس گێڕاوەتەوە، بەڕاستی بە هەشت جێیەتی.﴾[3]

هەروەها (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ((خەڵکی کۆششکردن و لێپرسینەوە وخاوەن ویست و توانا، دە سیفەتیان هەیە و تاقییان کردۆتەوە، جا ئەگەر بە ویستی خوا جێبەجێیان کرد ئەوا دەگەنە قۆناغی مەزن و پیرۆز:

یەکەم: نەبە درۆ و نەبە ڕاست سوێند بە پەروەردگاری مەزن نە خوا.

دووەم: بە گاڵتەو بە ڕاست لە درۆ دووربکەوێتەوە.

سێیەم: ئاگای لەوەبێ کە بەڵێن بە یەکێ بداو نەیهێنێتە دی.

چوارەم: لە نەفرەتیکردنی هەر خولقێنراوی دوور کەوێتەوە، یا ئازاری هیچ شتێ نەدا هەر لە گەردیلەیێك بەرەو سەرتر.

---

١ الفتح الرباني: المجلس / ٥١ .

٢ الحجر / ٩٩ .

٣ فتوح الغيب: المقالة / ٦٤، النازعات: ٤٠، ٤١.

پێنجەم: ئەگەر ستەمیشی لێکردبێ دوعا لە هیچ کەسێ نەکا.

شەشەم: شایەتیی بێبڕوایی و هاوبەشپەرستی و دووڕوویی لەسەر هیچ موسڵمانێ نەدا (بە واتای هیچ یەکێ لە موسڵمانان کافر نەکات)؛ چونکە لە ڕەحمەت نزیکترە و لە پلەو پایە بەرزترە و زۆر دوورە لەوەی کە بچێتە ناو زانیینی خواوە.

حەفتەم: سەیری گوناهو کردەوەی بەد نەکا و ئەندامەکانی لێیان بپارێزێ.

هەشتەم: هیچ بارگرانیەك چ گەورە بێ و چ گچکە نەخاتە سەرشانی هیچ کەسێ؛ چونکە سەربەرزیی خوا پەرستان وشەرەفی تەقواکاران لەوەدایە و هەر بەمەش لەسەر فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە بەهێز دەبێت.

نۆیەم: دەبێ تەماحی لە هەموو مرۆڤێ بڕیبێ و چاوی لەو شتانە نەبێ کە لە دەستیانە، چونکە ئەمە گەورەترین سەربەرزییە و بێگەردترین دڵنیاییە و پشت بەستانێکی تەواوە بەخوا، ئەو دەرگایە کە لە دەرگایەکانی متمانەکردن بە خوا و جۆرێکە لە جۆرەکانی زوهدو خۆ پارێزی (ورع) بەمەبەست دێت و دروشمەکانی تەواو دەبێت.

دەیەم: بێ فیزی، چونکە سەربەرزی و سەرفرازی لای خواو خەڵکدا بەمە تەواو دەبێ، ئەم سیفەتە بنچینەی هەموو سیفەتەکانی ترە، کە بەندە بە هۆیەوە دەگاتە قۆناغی پیاوچاکان، بێ فیزی ئەوەیە بەندەبگاتە هەرکەسێ، بڵێت: دوورنییە ئەمە لای خوا لەمن چاکتربێت...))[1]

## ١٠) بەزەیی:

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ ((**الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمْ الرَّحْمَنُ ارْحَمُوا مَنْ فِي الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ**: ئەوانەی بەزەییان بەخەڵك دادێ خوا بەزەییی پێیان دێتەوە، ئەوەی لەسەر زەویە بە بەزەیی بن لەگەڵی، ئەوەی لە ئاسمانە بەزەییتان پێ

١ فتوح الغيب: المقالة / ٧٨. بەدەستکارییەوە.

دەكات.))[1]

ڕێبازی صۆفیگەریی دڵ پاك دەكاتەوە لە لیڵی و بەزەییی دەخاتە ناو بەندەكان، شێخ عبدالقادر بەزەییی بە هەموو خەڵكێ دەهاتەوە بە تایبەتی هەژارەكانیان. سەیری بكە كە ئامۆژگاریی (عبدالرزاق)ی كوڕی دەكاو دەڵێ: ((لە دنیادا دوو شتت بەسە: هاوڕێیەتی هەژار و ڕێزگرتنی وەلی، بەسەرفرازییەوە هاوڕێیەتیی دەوڵەمەندەكان بكە و بە نەرم و نیانیش هاوڕێیەتی هەژاران))[2].

هەروەها دەیگوت: ((پاكی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی، كە ئامۆژگاریی خەڵكی خستە دڵمەوە و كردییە گەورەترین خەمی من، من ئامۆژگاریكەرم و لەسەر ئەوە پاداشتم ناوێ، كرێی خۆم لە پەروەردگاری مەزن وەردەگرتووە، من دنیاخواز نیم، من بەندەی دنیا و ڕۆژی دوایی نیم، جگە لە خوا بەندەی هیچ نیم، شادیم بەسەركەوتنتانە، خەمم لە لەناوچوونتانە))[3].

شێخ دەیگوت: ((گەر بم توانیبایە لەگەڵ هەمووتان دەهاتمە گۆڕەوە و وەڵامی فریشتەكانم دەدایەوە، ئەمەش لەبەر بەزەیی هاتنەوە پێیانە))[4]. ((ئەی خەڵكی خوا من چاكسازیی و سوودی ئێوەم دەوێ بەگشتی، ئومێدم وایە دەرگاكانی دۆزەخ داخرێن و هیچ كەسێكی نەچێتە ناو، دەرگاكانی بەهەشت بكرێنەوە و كەس قەدەغە نەكرێ لە چوونە ناوی، من كە ئاواتەخوازی ئەوەم، چونكە ئاگاداری ڕەحمەتی خوای مەزن و بەزەییەكەیم لەسەر خولقێنراوەكانیدا.))[5]

هەروەها دەیگوت: ((چۆن بەزەییان بە گوناهباراندا دێتەوە، خۆیان شایانی بەزەیین، ئینجا دەیگوت: ئەگەر كوڕی یەكێكتان لای بێبڕوایێ دیل بوو ئایا هەوڵی ڕزگاربوونی نادا، خواناسیش بەمجۆرەیە، كە خەڵك هەموو وەكو كوڕی ئەون.))[6]

---

١ رواه ابوداود والترمذي: (جامع الاصول ٤:٥١٥ رقم ٢٦١٥).

٢ الفيوضات الربانية، ص ٢٨.

٣ الفتح الرباني: المجلس / ٦.

٤ سەرچاوەی پێشوو: المجلس / ٦٢، ص ٣٦٧.

٥ الفتح الرباني: المجلس / ٤٩.

٦ سەرچاوەی پێشوو: المجلس/ ٥٣.

هەندێ ئاکاری تریش پێویستە لە ڕێبواری صۆفیگەریدابن، وەکو نەرم و نیانی و بەخشندەیی و خۆپاریزی و لە خواترسان، شێخ عبدالقادر بەشێکی زۆری لەو سیفەتانە هەبوو، چەند نموونەیەکمان لەنەرم و نیانیی دیت لە سەرەتای هەڵس و کەوتی لەوانە خوێندن و وانە گوتنەوەیدا.

لە بارەی بەخشندەییشی چەند نموونەیەکمان کەوتە بەر چاو و چۆن سوالکەری ڕەت نەدەکردەوە، گەر بە یەکێ لە دوو کراسەکەی بوایە، هەروەها حەزی خواردن بەخشینەوە بوو، ئەگەر هەزار دیناری بەدەست بکەوتایە شەوێك لای نەدەمایەوە، موزەفەری خزمەتکاری بەسەبەتەی نانەوە لە پێش دەرگای ماڵی شێخ دەوەستا و بانگی دەکرد: کێ نانی گەرەکە، کێ نانی ئێوارە دەخوا، کێ شەو دەمێنێتەوە.[1]

بەلام خۆپاریز(ورع)ی و لە خواترسانی لەوە بەناوبانگترن کە باس بکرێن، پێشتریش زۆر باسمان لێیانەوە کردووە.

سیفەتێکی تری تایبەت بە شێخ ئەوەیە، کە شکۆ و هەیبەت گرانییە، گەورەپیاو و میر و زانایان سامیان لێی دەکرد، لەبەر سام و هەیبەتی، برادەرەکانیش نەیان دەتوانی زۆر چاو لە چاوی بنێن. بۆیە قازیی بەغدا محەممەدی کوڕی حامیدی بەغدایی گوتوویەتی: شێخ عبدالقادر زۆر بە سام و شکۆ بوو، ڕوخساری شکۆ و سامی لێ دەباری.

خەڵکی دەهاتنە کۆڕ و وانەکانی و زۆر بەڕێز و ملکەچیەوە دادەنیشتن، ئیبن ڕەجەب لە کتێبەکەی (الذیل علی طبقات الحنابلة)دا گوتویەتی: خەڵك پێی قایلبوون، حاڵ و گوتەو کەرامەت و کەشفەکانی و سام و هەیبەتی ناوبانگی دەرکردو پاشاو گەدا لێی دەترسان))[2].

حافز عمادالدین بن کثیر لە مێژووەکەیدا گوتوویەتی: ((... شێخ فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپەی جێبەجێ دەکرد و لە سەر زەنشتی کەس نەدەترسا جا چ

---

١ قلائد الجواهر، ص ٨.

٢ ص ١٣٤.

خەلیفە بوایە یا وەزیر و دەسەڵاتدارو قازی و تایبەت و گشتی بایە، لە پێش خەڵکی و لە سەر مینبەر و لە کۆڕ و کۆ بوونەوەکان ئەرکە کەی بە جێ دەهێنا)) [1].

شێخ عبدالقادر لە رۆژی هەینی لە مزگەفتێ پشمی ئیتر خەڵکەکە بە (یرحمـــك الله) وەڵامیان دایەوە و بووە دەنگە دەنگ لە ناو مزگەفتێ، خەلیفە (المستنجد بـــالله ابن المقتضی لامر الله) لە میحرابێ بوو، گوتی: ئەم هەرایە چییە ؟ پێیان گوت: شێخ عبدالقادر پشمیوە، ئەمەی بەلاوە زۆر گەورە بو و ترسا.)) [2].

## گوێگرتن :

دوای ئەوەی بنەما ئاکاریەکانی رێبازی قادریمان زانـی، با ئێستا بیرو بۆچوونـی شێخ عبدالقادر (رەحمەتی خوای لێبێ) لە بارەی گوێگرتنەوە بزانین.

ئیبن تەیمیە (رەحمـەتی خـوای لێبێ) دەڵێـت: ((بـەڵام گوێگرتـن لـە قەسیدەی ئاوازدار و کۆبوونەوە لـە سەری، گـەورە شـێخەکان ئامادەی ئـەمجۆرە گوێگرتنانـە نەبوونـە، وەکـو: فوزەیـلْ کـوڕی عـەیاز و ئیـبراهیمی کـوڕی ئەدهـەم و مـەعروفی کـەرخی و ئـەوانیتری وەکـو شـێخ عبدالقـادری گـەیلانی و شـێخ عـەدی کـوڕی موسافیر ... ئەوانە ئامادەی ئەو گوێگرتنانە نەبوونـە، کـە بیدعـەی تێدابـووە، بـەڵکو ئامـادەی گوێگرتنـی شـەرعی بـوون، گوێگرتنــی پێغەمبــەران و پـەیڕەوانیان وەکـو گوێگرتنی قورئان ڕەوادارە..)) [3].

بەڵام شێخ عبدالقـادر دەڵێـت: ((دڵ خـۆی بـڕەوادارە، خــۆی یەکخواپەرسـتە، خۆی دڵسۆزە، خـۆی تـەقوادارە، خـۆی خۆپـارێزە، خـۆی زاهیـدە، خـۆی دڵنیایـە، خۆی خواناسـە، خـۆی کارکـەرە، خـۆی میرە، ئـەوانیتر هـەموو سـەربازو پـەیرەوی ئەون، ئەگەر گوتت: هیچ خوایێ نییە، کە شـایانی پەرستن بێ جگـە لـەو، سـەرەتا

---

١ قلائد الجواهر، ص ٨.

٢ قلائد الجواهر، ل ١٩.

٣ فتاوي ابن تيمية، كتاب التصوف، ص٥٣٢ ودوای ئەو

ئەمە بە دڵ بڵـێ، ئینجا بە زمانت))[1].

((ئەوەی بە دڵ یـادی خـوا بکاتـەوە ئـەوە یـاد کـەرە، ئـەوەی بـە دڵـی یـادی خـوا نەکاتەوە ئەوە یادکەر نییە، زمان خزمەتکار و شوێنکەوتوی دڵە))[2].

هەروەها (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵـێ: ((ئەگـەر لـە زەمـاوەندی ژنگواستنەوە ئامادەبوایە گوێی لە تـەپڵ و زوڕنـا و عـود و نـای و دووزەڵـە و رەبابـە و تـەنبور- کـە تورکـەکان یـاریی پـێ دەکـەن- نـەدەگرت، چونکـە ئەوانـە هـەموو حـەرامن، بـەڵام دروستە دەفە لە ژن مارەکردن و ژن گواستنەوەدا بەکار بێـت، گوێگرتـن بـە پیـك و دووزەڵـە لەگـەڵ هەڵپـەڕکێ ناپەسـەندە(مکـــــروە). هـەندێ لەوانـەی قورئانیـان راڤەکردووە لە ئایەتی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ﴾[3] دەڵێـن ئـەوە گۆرانی و شیعرە.[4]

((بـەڵام بـە ئـاواز گوتنـی شـیعری عـوزری دووجـۆرە: حـەڵاڵ و حـەرام، ئـەوەی دروستە و حەڵاڵە نابێ شتی گاڵتەئامێزی تێدابێ، حەرامەکەشـی تێیدایـە، بـەڵام ئـەو شیعرانەی، کە بۆ رابواردنن دروست نین، جا سوکیی تێدابێ یان نەبێ))[5].

((پێویستە رێبوارانی صۆفیگەری گـوێ نـەگرن و بەویستی خۆیـان بـۆی نـەچن، ئەگەر گوێگرتن بێ مەبەست هاتە پێشەوە گوێگر دەتوانێ بە ئەدەبەوە دابنیشێ و لـە دڵـەوە یـادی خـوا بکـات و دڵـی خـۆی لـە خافڵـەتی بپـارێزێ.. ئەگـەر ئەوانـە لـە مەبەستیان راستگۆن ئەوا دڵ و ئەندامەکانیان بـێزار نـەدەکرد بـە غـەیری گوێگرتنـی قورئـان، چونکـە قورئـان گوتـەو سـیفەتی خۆشەویستەکەیانە، یـادی خــوا و یـادی وەلییە تۆبەکارەکان و یادی ئەوانی رابوردوو و دڵدار و دولبەر و رێبوار و مـورادی تێدایە))[6].

---

١ الفتح الرباني: المجلس / ١٥.
٢ سەرچاوەی پێشوو: المجلس / ٢٣.
٣ لقمان / ٦.
٤ الغنية، ج ١، ص ٢٠.
٥ سەرچاوەی پێشوو، ب ١، ل ٣٥.
٦ سەرچاوەی پێشوو، ب ٢، ل ١٧٩.

رای شێخ ئەوەیە، کە بە ئەنقەست ئامادەی گوێگرتن نەبیت، بەڵام گەر گوێگرتنەکە لە خۆیەوە ڕێك کەوت دروستە، هەرچەندە کە گوێگرتن لە قورئان لەو چاکترە، شێخ گوێگرتن حەرام ناکات، چونکە پێغەمبەرﷺ حەرامی نەکردووە. گوێگرتن لە رێ پێدراوەکانە، شاعیر دەڵێ:

هەر کەسێ سۆزی، سۆزی راستی بێ
پێویستیی نییە، بە گۆرانی بێژ
لە خودی خاوەن، بەزمێکی کۆنە
هەمیشە مەبەستە، بە بێ وتووێژ

## شێخی رابەر:

ڕێبازی راست هەر دەبێ رابەرێکی هەبێ و رابەرایەتیی ڕێبوارانی بکات، تاکو تووشی کۆڵەڕێ نەبن و ڕێگەی راست بزر نەکەن. ئەمەیە بیرو بۆچوونی شێخ عبدالقادر، لە دێرزەمانەوە پێغەمبەرﷺ و خەلیفە راشیدینەکان و شوێنکەوتوو و والیی شارەکان بەم ئەرکە هەڵدەستان، بەڵام دوای ئەوەی دەسەڵات و قورئان لە یەك جودا بوونەوە، قورئان پێویستیی بە رابەر و رێنیشاندەران هەبوو بۆ ئەوەی ڕێنمایی خەڵکی بکەن، خۆ ئەگەر ئەم کارە تەنیا لە کتێبان وەربگیرابایە، ئەوا خوای گەورە پێغەمبەرانی نەدەنارد و زانایان نەدەبوونە میراتگری پێغەمبەران و قوتابخانەو زانستگاکانیش دانەدەمەزران.

شێخ عبدالقادر لە بارەی شێخی رابەرەوە دەڵێت: ((نابێ شێخ لە سەر بەرماڵی کۆتایی دابنیشێ و شمشێری چاودێریی خوایی ببەستێ، تا دوازدە سیفەتی لێ نەیەتەدی: دوانیان لە سیفەتەکانی خوان، شێخ دەبێ (ستّار و غفّار) بێ، واتا: خەوش داپۆش و لێبووردە، دوانیان لە سیفەتەکانی پێغەمبەرنﷺ کە ئەمانەن: دەبێ دڵسۆز و هاودەم بێ، دوانیان لە سیفەتەکانی ئەبوبەکری سدیق بێ: دەبێ راستگۆ بێ و هیتریش بەراست بزانێ، دووسیفەتی عومەری کوڕی خەتابی هەبێ: دەبێ (أمّاراً نهّاءً) بێت، واتا: فەرمان بە چاکە بکاو نەهی لە خراپە بکات،

دووسیفەتی عوسمانی کوڕی عەفانی هەبێ: دەبێ خواردن بداتە خەڵکی و لەو کاتەی خەڵك نووستوون شەو نوێژ بکات، دووسیفەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیبیشی هەبێت: دەبێ زانا و ئازابێت))[1].

هەروەها گوتوویەتی: ((پێویستە لە سەر شێخی تەریقەت بە حوکمی ئامۆژگاری هەڵس و کەوت لەگەڵ مورید بکا و بە چاوی سۆز ئاگاداریی بکا، گەر بەرگەی وەرزشی قورسی نەگرت بە نەرمی لەگەڵی بجووڵێتەوە و وەکو دایك پەروەردەی بکاو وەکو باوکێکی دڵسۆزی گرانی ژیر ئاگاداریی بکا، سەرەتا لەگەڵی بە ئاسان دەست پێ بکاو داوای شتێکی لێ نەکا، کە لە دەرەوەی توانای ئەو بێ، ئینجا فەرمانی قورستری پێ بکا دوای ئەوەی، کە بەڵێنی گەڕانەوە لە گوناهانی لێ وەرگرتبێ و لەسەر گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی خوا بەردەوام بێ، چونکە بەڵێن بنچینەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە هەیە لەکاتی بەیعەتکردنی یارانی، ئینجا زیکری فێر بکات.

## کەواتە شێخی رابەر دەبێ:

**یەکەم:** ببێتە پێشڕەوێکی چاکی موریدەکانی و هەموو خەڵکی، بۆیە دەبێ زانا و کارکردە و دڵسۆز و راستگۆ و بەڕێز بێت، ئاکار و سیفەتی صۆفیەکانی هەبێ، بەسام و شکۆبێ بۆ کارتێکردن لە نەفسی موریدەکانی، رێگایان نیشان بدا، ئەو شێخە بێ گوناه نییە بەڵکو بە قورئان و سوننەتەوە پابەندە.

ئیبن تەیمیە لە کتێبەکەی (السلوك)دا دەڵێ: ((بەڵام ئەو رێبوارانەی کە لە سەر بیروباوەڕی خۆیان بەردەوامن وەکو گرووپی شێخە سەلەفیەکان، بۆ نموونە: فوزەیلی کوڕی عەیاز، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، ئەبو سلێمانی دارانی، مەعروفی کەرخی، سڕی سەقەتی، جونەید و هەندێکی تر لە پێشینەکان، وەکو شێخ عبدالقادری گەیلانی و شێخ حەمماد و شێخ (ابو البیان) و هەندێکی تر لە پێشینەکان، ئەگەر رێبوار لە هەواش بفڕی یان لەسەر ئاویش بڕوا، رێگای نادەنێ لە فەرمان و نەهی

---

[1] قلائد الجواهر، ص ١٣.

شەرع دەربچێت، بەڵکو دەبێ هەتا مردنی ئەوەی فەرمانی پێکراوە بیکات و لە قەدەغەکراوەکانیش بتەکێتەوە، ئەمەش گوتەی گەلێ لە شێخەکانە، وەکو گوتەی شێخ عبدالقادر لە کتێبەکەی (فتوح الغیب): لە نەفسی خۆت دەرچۆ و وازی لێ بێنە و هەموو شتێ بدە دەست خوای مەزن، فەرمانی جێبەجێ بکەو قەدەغەکەی مەشکێنە و هەواو فیز نەچێتە دڵتەوە.. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ: بە دوای هەواو ئارەزوومەکەوە، ئەگینا ڕێگای خوات لێ گوم دەکات.﴾[1].))[2]

**دووەم:** چاودێری موریدەکانی بێ، ڕێگای ڕاستیان نیشان بدات و فێری چۆنیەتیی هەڵس و کەوتیان بکات و بەڵێنیان لێ وەر بگرێ، کە پێی پابەندبن و لەسەری بڕۆن، ئینجا دوایی چاودێریی ڕۆیشتنیان بکات و بێئاگا وریا بکاتەوە و بە بیری لەبیرچوویان بهێنێتەوە و ڕێنمایی گومڕایان بکات، شێخ دەستووری هەڵس و کەوتی موریدەکانی دادەنێ و بەهەر یەکێکیان دەڵێت: ((ئامۆژگاریت دەکەم، کە لە خوا بترسی و گوێڕایەڵی بیت و بەلایەنی دیار(ظاهر)ی شەرع پابەند بیو دڵت-سینگت- سەلامەت بێ و نەفست بەخشندەبێ و ڕووت گەشاوەبێ و خێرخواز بی و واز لە ئازاردان بێنی و ڕێزی شێخەکان بپارێزی و هاوڕێیەتیی برایەکان بکەی و واز لە دووبەرەکی بهێنی و بەرگەی ئازاربگری و بەرژەوەندیی خەڵکی بە پێش خۆت بخەیت و لە ئایین و دنیا یارمەتیت هەبێ. ڕاستیی دەوڵەمەندی ئەوەیە واز لەو کەسانە بێنی کە وەکو تۆن، صۆفیگەری لە گوتی و گوتوویانە وەرنەگیراوە، بەڵام لە برسێتی و بڕینی شایستەو پەسندکراوەکانەوە وەرگیراوە، سەرەتا داوای زانست لە هەژاران مەکەو بە نەرم و نیانی لەگەڵی دەست پێ بکە، چونکە زانست تووشی نامۆیی دەکاو نەرم و نیانی دەبێتە هاودەمی، صۆفیگەری لەسەر هەشت ئەدگار دامەزراوە: بەخشندەیی بۆ حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام)، ڕەزامەندیی بۆ ئیسحاق(علیه السلام)، ئارام بۆ ئەیوب(علیه السلام)، هێما بۆ

---

[1] ص ٢٦.

[2] کتاب السلوك لأبن تیمیة، ص ٥١٦.

زەکەریياﷺ، غوربەت بۆ یەحیاﷺ، خوری و زبر پۆشی بۆ موساﷺ، گەڕان بۆ گەشت بۆ عیساﷺ، هەژاریی بۆ محەممەد، دروودی خوا لەسەر ئەوو هەموو پێغەمبەران و خزم و کەس و کارو هەموو یارەکانی بێت))[1].

## بنەماکانی ڕێبازی قادری :

شێخ عبدالقادر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) حەفت بنەمای بۆ ڕێبازەکەی داناوە، کە ئەمانەن: کۆششکردن (المجاهدة)، پشت بە خوا بەستن (التوكل)، ئاکار چاکی (حسن الخلق)، سوپاسکردن (الشكر)، ئارامگرتن (الصبر)، قایلبوون (الرضا)، ڕاستگۆیی (الصدق)، داوای لە موریدەکانی دەکا، کە پەیڕەویی بکەن و لەسەری بڕۆن بۆ ئەوەی بتوانن هەڵس و کەوتی ڕێبازەکەی ببەنە سەر.

هەروەها دەڵێ:

(١) بەلام کۆششکردن دەگەڕێتەوە بۆ فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا ﴾[2]، هەروەها بۆ فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ((أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةَ حَقٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ)). هەرکەسێ لە سەرەتاوە خاوەن هەوڵ و کۆشش نەبێ هیچ بۆنێکی خۆش لە ڕێبازەکەوە وەرناگرێت.. مەبەست لە کۆششکردن پێچەوانەی هەوای نەفسەو نەفسی خۆی بە ڕێشمەی تەقوا و لە خوا ترسان ڕێشمە بکات، کۆششکردن پێك نایێ بە چاودێری نەبێ، چاودێری ئەوەیە خوا بپەرستی وەك ئەوەی ببینی، ئەگەر تۆ نەیبینی ئەو تۆ دەبینی. چاودێریش بەم چوار ئەدگارە دێتە دی:-

١ – ناسینی خوای مەزن.

٢ ناسینی ئیبلیسی دوژمنی خوا.

---

١ فتوح الغيب: المقالة / ٧٥ بە دەستكارييەوە.

٢ العنكبوت / ٦٩.

٣  ناسینی نەفسە بەدکارەکەت.

٤  ناسینی کارکردن بۆ خوای گەورە، کە بریتیە لەوەی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی.

(٢) پشت بەستن بەخوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم فەرموودەیەی پەروەردگار: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ: هەر کەسێ پشت بەخوا ببەستێ، ئەوا ئەو کەسە خوای بەسە.﴾[١]، راستیی پشت بەخوا بەستن ئەوەیە، کە کارەکانت بدەیتە دەست خوا ... ئیتر بەندە تێدەگا کە بەشێکەی گۆڕانی بۆ نییە، ئەوەی بۆی دانرابێ دەیدرێتێ، ئەوەی بۆی دانەنرابێ بە دەستی ناکەوێ. ئیتر دڵی دادەکەوێ و لە خوای خۆی دڵنیا دەبێ..

پشت بە خوا بەستن سێ پلەی هەیە: متمانە کردن، پاشان خۆدانە دەست، پاشان کارپێ سپاردن؛ ئەوەی متمانە لەسەر خوادەکا بە بەڵێنی خوا ئارام دەگرێ، خاوەنی خۆ دانە دەست بەزانینەکەی قایل دەبێ، خاوەنی کار پێ سپاردن بە فەرمانی خوا قایل دەبێ ... بەڵام ئەو جووڵانەوە دیارەی کە بە هەوڵدانی دەیکا لەگەڵ پشت بە خوا بەستنی دڵی دژایەتی نییە، چونکە شوێنی پشت بە خوا بەستن دڵە، کە بڕواهێنانی تەواوە، ئەوەی بڕوا بە هەوڵدان نەهێنێ بڕوا بە سوننەت ناهێنێ، ئەوەی بڕوا بە پشت بەستن نەهێنێ بڕوا بە بڕوای خۆی ناهێنێ، ئەگەر یەکێ لە هۆکارەکان نەهاتەدی بە قەدەری خوایە، ئەگەر هۆکارەکانیش ئاسان بوون هەربە قەدەری خوایە. پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ ((**أعْقِلْهَا وَتَوَكَّل**: ببەستەوە (وڵاغەکە) ئینجا پشت بە خوا ببەستە.))[٢].

(٣) بەڵام ئاکار چاکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو فەرموودەیەی خوای گەورە، کە بە پێغەمبەری فەرموو: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ: ئەی محەممەدﷺ تۆ لەسەر ئاکارێکی بەرزی.﴾[٣] لە ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕنەوە ((**قِيلَ يَا رَسُولَ الله، أيُّ الْمُؤْمِنِينَ**

---

١ الطلاق / ٣.    ٢ رواه الترمذي.    ٣ القلم / ٤.

أَفضَلُ إِيمَانًا؟ قَالَ ﷺ: أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا: بەپێغەمبەریان گوت: چ بڕواداری لە هەموان چاکترە؟ فەرمووی: ئەوەی ئاکارەکانی لە هەموویان چاکتربێت.))

ئاکارچاکی چاکترین سیفەتی بەندەیە و گەوهەری پیاوان بەو بەدیار دەکەوێ، مرۆڤ بەئاکارەکانی شووره دراوە و بە خولقاندنی بەناوبانگە ... ئاکار چاکی لەگەڵ خوا جێبەجێکردنی فەرمانەکانێتی و واز هێنان لە قەدەغەکراوەکانێتی، لە هەموو حاڵەتێ گوێڕایەڵی بی، بێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشتی لێ بکەی و هەموو قەدەرکراوێ بدەیتە دەست ئەو بێ تاوانبار کردنی، بەبێ هاوبەشی بەتەنیای بزانی، بەڵێنەکانیت پێ ڕاست بێ بەبێ گومانکردن.

(٤) بنچینەی سوپاس کردن بۆ ئەم ئایەتە دەگەڕێتەوە: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ: ئەگەر سوپاس بکەن زیاترتان پێ دەبەخشم.﴾[1]، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((أَفَلا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا: ئایا بەندەیەکی دەم بە سوپاس نەبم؟)).

ڕاستیی سوپاسکردن لای تەحقیقکاران بریتیە لە: دان نان بە نیعمەتی خوا لە ڕووی ملکەچییەوە.. سوپاسکردن دەبێتە چەند بەشێك: سوپاس کردن بەزمان، کە بریتیە لە دان نان بە نیعمەت لەڕووی ملکەچی و زەبونییەوە، سوپاس کردن بە لەش و ئەندامەکانی لە ڕووی خزمەت و وەفاوە، سوپاسکردن بە دڵ بریتیە لەمانەوە لەسەر بەرماڵی شهود و پاراستنی ڕێزی ئەو حاڵە.. بەگشتی سوپاسکردن ئەوەیە، کە بە هۆی نیعمەتی خواوە سەرپێچیی نەکەیت.

(٥) ئارامگرتن لە بنچینەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم فەرموودەیەی خوا: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾.[2]

ئارامگرتن سێ جۆری هەیە: ئارامگرتنێ بۆ خوای مەزن، لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و نەشکاندنی قەدەغەکانی، ئارامگرتنێ لەگەڵ خوای مەزن، کە بریتییە لە ئارامگرتن لە سەر قەزاو قەدەرەکانی لە هەموو بەڵاو تەنگانەیەکدا،

---

١ ابراهیم / ٧.

٢ آل عمران / ٢٠٠.

ئارامگرتنێ لە سەر خوای گەورە. ئەوە ئارامگرتنە لەسەر بەڵێنی ڕۆژیدان و رزگاربوون و سەرکەوتن و پاداشتی ڕۆژی بەپابوونەوە ... ئیمامی عەلی﷛ فەرموویەتی: ((**الصَّبرُ مِنَ الإيمَانِ بمنزلة الرَّأس مِنَ الجَسَدِ**: ئارامگرتن لە بڕوادا وەکو سەرە لە لەشدا.)).

(٦) ڕەزامەندیی بۆ ئەم ئایەتە دەگەڕێتەوە: ﴿**رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ**: خوا لەوان ڕازیە و ئەوانیش لەخوا ڕازین.﴾[1]. ئیبن عەباس﷛ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((**ذَاقَ طَعْمَ الإيمَانِ مَنْ رَضِيَ باللهِ ﷻ ربًّا**: ئەوەی بە خوا ڕازی بێ و بەمەزن و شکۆمەندی بزانێ چێژی ئیمان دەچێژێ.)).. بزانە هەرکەسێ بە قەزا قایل بێ دەحەسێتەوە، هەرکەسێ پێی ڕازی نەبێ ئازار و ماندووبوونی لە دنیا نابڕێتەوە، هەر ئەوەی بە دەست دەکەوێ کە بۆی بەشکراوە. هەر کەسێ هەواو هەوەسی دادوەر بێ لەسەری بەقەزا قایل نییە، چونکە هەواو هەوەسی دژی خوای مەزنە. هەواو هەوەسی نەبوو، ئەگەر بوو ئێمە نەبووین.. بە گشتی مرۆڤی قایل ئەو کەسەیە، کە گازاندە لە سەر قەدەری خوا ناکات.

(٧) بەڵام ڕاستگۆیی لە بنەڕەتدا بۆ ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە دەگەڕێتەوە: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ**﴾[2]. بزانە ڕاستگۆیی کۆڵەکەی ئایینە و بەو تەواو دەبێ و یاساکەی لەودایە و دووەم پلەی پێغەمبەرایەتییە. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ: بەڕاستی ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەن، کە خوا نیعمەتی لەگەڵ کردوونە لە پێغەمبەر و ڕاستگۆ و شەهید و پیاو چاکان.﴾[3]، ڕاستگۆیی بریتییە لە یەکسان بوونی نهێنی و ئاشکرای مرۆڤ.[4]

* * *

---

١ البينة / ٨.

٢ التوبة / ١١٩.

٣ النساء / ٦٩.

٣ الغنية، ج ٢، ص ١٨٢.

ئەمە ڕێبازی قادرییە لە پەروەردە و سلوك، ئەمە بنەماو دەستوور و ویردەکانێتی، کە لە چوارچێوەی قورئان و سوننەت دەرناچی و شەریعەت دەکاتە دادوەر لەسەر حەقیقەت، فیقهیش رابەرێکە، کە صۆفیگەری لەبەر رۆشناییەکەی دەڕوات. هەروەها داوای ئاکاری چاك و دوورکەوتنەوە لە ئاکاری ناشایستە و خۆش گوزەرانی لە نێوان خەڵك دەکا، سەرەڕای ئەمەش داوای ئەوە دەکا، کە ئاکاریان وەکو ئاکاری کۆمەڵگای ئیسلامی یەکەم بێ، کۆمەڵگای یارانی پێغەمبەرﷺ، بۆ ئەوەی ببنە چاکترین میللەت لە سەر زەوی، ئەمەشی وەکو هەموو ڕێبازە صۆفیگەریە سوننیەکانی تر.

شێخ عبدالقادر (رەحمەتی خوای لێبێ) بەپێی بۆچوونی خۆی راستیی صۆفیگەریی دیاریکردووە، صۆفیگەریی بە جل و بەرگی خوری و ڕوو زەرد هەڵگەڕان و حەکایەت خوێندنەوەی پیاوچاکان بە زمانێکی لەرزۆك و پەنجە جووڵاندن بە تەسبیحات پێك نایێت، بەڵکو صۆفیگەریی هەوڵ و تەقەلا و کارو دڵسۆزییە، بەراستگۆیی لە خوا خوازی و زوهد لە دنیا و دەرکردنی خەڵك لە دڵ پێك دێت،[1] بەمەرجێ دڵ تەنیا خوای تێدابێ.

شێخ صۆفیگەریی خستە ژێر سایەی فیقهەوە. بەلای ئەو، هەر حەقیقەتێ گەر شەریعەت پاڵپشتی نەکا زەندیقییە، نەیهێشت شەریعەت لە تەوەری رامیاری بخولێتەوە. چونکە ئەمە دەبێتە بەلایەك و ڕامیاری و شەریعەت هەردووکیان تێکدەدا، بۆیە دژی ئەو زانا بەدانە دەوەستا، کە بەگەڵ پاشاو فەرمانڕەواکان کەوتبوون و بەپێی ویستیان دەقی شەریعەتیان بۆ دەگۆڕین. شێخ بەوانەی دەگوت: ((ئەی ناپاکان(خائین)ی کردەوە و زانست، ئەی دوژمنانی خواو پێغەمبەری خواﷺ، چەندەها جار بۆ چڵ و چێوی دنیا و چێژو ئارەزووی دووڕوویی لەگەڵ پاشاو دەسەڵاتداران دەکەن.. خوایە تەوبە لە من و لەوان قبوڵ بکە و لە زەبونی دوڕوویی و کۆتی هاوبەشپەرستی رزگاریان بکە.))[2].

---

١ الفتح الرباني: المجلس / ٢٥.

٢ کتاب رجال الفكر والدعوة في الاسلام، ص ٢٤٨ و دوای ئەوە.

شێخ لە موریدەکانی قایل نەدەبوو، کە شێخ بەبێ گوناە تێ بگەن، لەم بارەیەوە دەیگوت: ((ئەگەر مورید شتێکی لە شێخ بۆ دەرکەوت کە لەگەڵ شەرع ناگونجێ، پێویستە بە ئاماژەپێکردن و نموونە هێنانەوە شێخەکەی ئاگادار بکاتەوە... بڕوای بە بێ گوناهی شێخ نەبێت))[1].

بەڵام ئەو ئەڵقە یاد(ذکر)انەی کە ئێستا لە ڕێبازی قادریی دەبەسترێ و بە دەنگ و ئاواز قەسیدە و مەقامی تێدا دەخوێنرێتەوە، لەو بنەمایانە نییە، کە کاتی خۆی شێخ بۆ ڕێبازەکەی داناوە، بەڵکو هەروەکو بینیمان ڕقی لێ دەبوویەوە و قورئان خوێندنی پێ باشتر بوو لەو کارە. لەوانەیە شێخەکانی ڕێبازی قادریی، کە لە دوای شێخ عبدالقادرەوە هاتن ئەمەیان داناوە و بنچینەکەیان داڕشتووە.

مامۆستا ئەبوحەسەنی نەدەوی لە کتێبەکەی (رجال الفکر والدعوة في الاسلام)دا دەڵێت: ((شێخ عبدالقادری گەیلانی خۆی موریدەکانی پەروەردە دەکرد و سەرپەرشتیانی دەکرد و وایانی لێکردبوون، کە هەست بە لێپرسینەوە بکەن دوای تۆبە و بەیعەت و نوێکردنەوەی ئیمان. شێخ پەیوەندییەکی گیانی ئاینیی زۆر بەتینی لەگەڵ موریدەکانی هەبوو بە هەوەنتە هەڵنەدەوەشایەوە. ئەو موریدانەی کە خۆگرو هەڵکەوتوو و بە توانا بوون لەسەر پەروەردەکردن، شێخ مۆڵەتی شێخایەتیی پێدەدان و لەوڵاتان بڵاو دەبوونەوە و داوای خەڵکیان بۆ ئیسلامەتی دەکردو نەفسەکانیان پەروەردەکردو لەگەڵ هاوبەشپەرستی و بیدعە و نەزانی و دووڕشوویی دەجەنگێن ... خەلیفە و قوتابییەکانی شێخ ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لەسەر پاراستنی گیانی ئیسلام و تیشکی ئیمان و گەرم و گوڕی بانگەوازیی و جیهاد و هێزی هەڵگەڕانەوە لەسەر ئارەزووە بەدەکان، ئەگەر ئەوانە نەبوونایە مادە پەرستی میللەتی قووت دەداو تیشکی ژیان و خۆشەویشستی لە سینگی ئەندامەکانی دەکوژایەوە، هەروەها فەزڵێکی گەورەیان هەبوو لەسەر بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەو شوێنە دوورانەی، کە سوپای موسڵمانەکانی نەگەیشتێ و ئیسلام بە

---

[1] الغنیة، ج ٢، ص ١٦٤.

سایەی ئەوانەوە لە ئیفریقیا و هیند و ئەندۆنیسیا و چین ودوورگەکانی زەریای هیندی بڵاو بوویەوە.

هەرکە تەتەرەکان دەستیان بەسەر جیهانی ئیسلامیداگرت، ئەو خەلیفە دڵسۆزانەی، کە مێژوو ناوی زۆریانی لە بیر کردووە توانییان خۆیان بخزێننە ناو دڵی ئەو دڵڕەقانە و ئیسلامیان لەلا خۆشەویست بکەن و داوای ئیسلامبوونیان لێ بکەن، تا زۆربەیان، یان هەموویان موسڵمانبوون و بوونە پارێزەری ئیسلام دوای ئەوەی کە دوژمنی بوون، (تۆماس ئەرنۆلد) لە کتێبەکەی (الدعوة الی الاسلام)دا زۆر سەری لەم ڕووداوە سوڕماوە.[1]

1 رجال الفكر والدعوة في الاسلام، الندوي، ص ٢٨٢ و دوای ئەوە.

# بەشی چوارەم

# کەرامەتەکانی شێخ عبدالقادر

کەرامەت هەموو کارێکی لە رادە بە دەرە و دوورە لە داوای پێغەمبەرێتی و خوا لەسەر دەستی وەلییەکانی دەری دەخات، بەڵام پەرجوو(معجزة) هەموو کارێکی لە رادە بەدەرە و خوای گەورە لەسەر دەستی پێغەمبەرێ ئاشکرای دەکا، وەکو بەڵگەی پێغەمبەرێتیەکەی. هەر شتێ بە پێچەوانەی ئەمە بێ ئەوا لە شەیتانەوەیە. هەموو کەرامەتی وەلییەك لە هەمان کاتدا پەرجووی ئەو پێغەمبەرەیە، کە لایەنگریی دەکا.

کەرامەت بە قورئان و سوننەت چەسپاوە، خوای گەورە لە بارەی مەریەمی کچی عیمرانەوە دەفەرمووێ: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا: هەر کاتێ زەکەریا دەچووە لای مەریەم لە میحراب خواردن و رۆزیی لە لا دەدی کەلەو کاتەدا نەبوون.﴾[1]، ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا: لقی ئەو دار خورمایە بۆلای خۆت راوەشێنە، تا خورمای تەڕو تازەت بۆ بوەرێنێ.﴾[2]، ئەمانە هەردووکیان بۆ مەریەم کەرامەتن، چونکە پێغەمبەر نەبوو. هەروەها چیرۆکی ئەوەی زانستی خوایی هەبوو لەگەڵ حەزرەتی سلیمان و هێنانی کۆشك و سەرای بەلقیس بە چاوتروکانێك. چیرۆکی یارانی ئەشکەفت و

---

١ آل عمران / ٣٧.

٢ مريم / ٢٥.

سەگەکەیان، چیرۆکی (ذي القرنـين)، چیرۆکی پیاوە چاکەکە لەگەڵ حەزرەتی موسا، ئەمانە هەموویان بە قورئان سەلمێنراون. لـە فـەرموودەکانی پێغەمبەرداﷺ زۆر گوتـەی وا هەیـە کـە بوونـی کەرامـەت دەسـەلمێنێ، وەکـو فـەرموودەی یـارانی ئەشـکەفت و فـەرموودەی جورەیجـی راهیـب و فـەرموودەی ئوسـەیدی کـوڕی حوضەیر و عەبادی کوڕی بیشر، رەزای خوایان لـێ بێ، فەرموودەی دایکی ئەیمـەن و سەفەرکردنی لەو کاتەی کە بەڕۆژوو بووە، گوتەی عومەری کوڕی خەتاب (یـا سارية الجبل) و گەلێکی تر.

شێخ موفق الدیـن کـوڕی قودامـەی مەقدیسـیی خـاوەنی کتێبـی (المغـني) گوتوویەتی: ((نەمدیووە کـەس هـەندی شێخ عبدالقـادری گـەیلانی کەرامـەتی لـێ بگێڕنەوە))[1].

شێخ عیزودینی کوڕی عبدالسلام شێخی شافیعی گوتوویـەتی: کەرامـەتی هیـچ شێخێ بەیەك لە دوای یەك (تواتر) نەبووە، تەنیا هی شێخ عبدالقادر نەبێت.[2]

((لە نووسینی سەیف کوڕی مەجدی حافیز وەرمگرت: گوێم لە شـێخی زاهیـد عەلی کوڕی سەلمانی بەغدایی بەناوبانگ بەنانەوا بوو، کە لە تەکیەی خۆی بـوو لـە تەنیشتی رۆژئاوای بەغدا، لـە بـارەی شێخ عبدالقـادرەوە دەیگێڕایـەوە و دەیگـوت: ((شـێخ خـاوەنی کەرامـەتی وا بـوو کـە لـە سـەردەمی خـۆی لـە کـەس نەدەگێڕدرایەوە))[3].

دانەرە کۆنەکانی وەکو: محەممەدی تادفی لە ((قلائـد الجواهـر)) و عبدالله ی یافیعی لە (أسنى المفاخر) و نورالدینی لەخمی لە (بهجـة الأسـرار) هیـتر . گەلـێ

---

١ كتاب الذيل على طبقات الحنابلة لأبن رجب تحت رقم / ١٣٤ .
٢ كتاب الذيل على طبقات الحنابلة لأبن رجب وكتاب: سير النبلاء للذهبي ج ٢٠، ص ٤٤٣.
٣ كتاب الذيل لأبن رجب تحت رقم / ١٣٤.

(الشيخ عبدالقادر الكيلاني) بەدرێژی باسی ئەو کەرامەتانە ناکەم وەکو ئەوەی کە خەلیفە (المستنجد بالله) هەندێ درهەمی بۆ ناردبوو، ئەویش درهەمەکانی گوشی و خوێنیان لێهات و بۆ خەلیفەی ڕەوانکردەوە، یا وەکو ئەوەی کە لە بەغداوە قاپقاپەی گرتە هەندێ دز لە دەرەوەی بەغدا، کە ڕێیان لە کاروانێ گرتبوو، ئەوانیش بەڵێنیان دابوو گەر ڕزگاریان بێ هەندێ لەو سامانەی بدەنە شێخ، ئیتر دزەکان هەڵاتبوون و کاروانەکە ڕزگاری ببوو، ئەمەو هیتریش، کە لەو کتێبانەدا باسکراون، چونکە ئەو کەرامەتانە پاڵپشتێکی تەواو و سەداسەدیان نیە و وانەبێ سەلماندنیان لە پایەی شێخ بەرزبکاتەوە، یان نەسەلماندنیان لە پایەی نزم بکاتەوە، چونکە شێخ ئەوەندەی بەسە کە هەزارەها بێبڕوا و هاوبەش پەیداکەر لەسەر دەستی موسڵمانبوون و بە هەزارەها گوناهبار و بەدکاریش تۆبەیان لەسەر دەستی کردووە. شێخ خۆیشی زۆر شانازیی بەمانە کردووە و زۆر جاران بە دڵخۆشییەوە بۆ گوێگرانی باسکردووە، لەم بارەیەوە دەڵێ: ((خوای گەورە ویستی سوودی خەڵکم بێ، زیاتر لە پێنج هەزار جوولەکە و دیان لەسەر دەستم موسڵمان بوونە و زیاتر لە سەد هەزار لە بەرەڵا و چەتە و ڕێگر و پیاوخراپان لەسەر دەستم تۆبەیان کردووە، ئەمەش خێرو چاکەیەکی زۆرە)).

بەڵام لێرەدا باسی شتێ لە ئاشکراکردن(مکاشفات)ەکانی دەکەم، کە ئەمەش دەچێتە ناو بابەتی فەراسەت و تیژ هۆشی و هەستکردن لە دوورەوە، یا خوێندنەوەی بیرەکان، ئەمەش زانستی نوێ سەلماندوێتی و قورئانی پیرۆزیش سەلماندوێتی، هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ: بەڕاستی لەم ڕوداوەدا زۆر بەڵگە هەن بۆ ئەوانەی کە وشیارن.﴾[1]، واتا: ئەوانەی کە بیر لە شتان دەکەنەوە و بەهۆی سیفەتی شتەکان ڕاستییەکانیان دەزانن.[2] فەرمودەی

---

١ الحجر / ٧٥.

٢ تفسير صفوة البيان لمعاني القرآن، حسنين مخلوف.

پێغەمبەریش ﷺ لایەنگری ئەمەی کردووە، کە دەفەرمووێ: ((**اتَّقُوا فِرَاسَةَ الْمُؤْمِنِ فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللَّهِ**: خۆتان لە تیژ هۆشیی بڕوادار بپارێزن، چونکە ئەو بە نوری خوا دەبینێ.))[١].

پێش ئەوەی رەخنەی ئەوانەمان گوێ لێبێ، کە لە کاروباری ئەم دنیایەدا تەنیا بڕوا بە زانست و ژیری و تاقیکردنەوە دەکەن، ئەم چەند پەرەگرافەی موحازەرەی زانای رووسییان بۆ باس دەکەم کە ناوی (فلایل کازناتشوف)ە، کە لە کۆنگرەی جیهانی بۆ بابەتی (پاراسایکۆلۆجیا) خوێندوویەتەوە، کە لەم دواییە لە پاریس بەسترا و باسی توانا مرۆڤییە لە رادە بەدەرەکان دەکاو رۆژنامەی (الاتحاد)ی ئیماراتی لە ١٩٩٠/١١/٢٩دا بڵاوی کردۆتەوە. زانای ناوبراو بەمجۆرە موحازەرەکەی دەست پێدەکات:

((چاودێریی زانستی پاراسایکۆلۆجیا بکەن پێش ئەوەی جیهان بڕووخێت، زانست سەلماندوویەتی، کە لەشی مرۆڤ هێزو توانایەکی زیندەگیی مەزنی هەیە و لە دووریی سەدان و هەزاران کیلۆمەتر دەتوانێ کار لە بیری خەڵکی بکا، مەترسییەکەی لەوەدایە نەخۆ مافیاو تۆڕە تیرۆریستەکان، یاخود سوپا نیزامیەکان ئەم چەکە زانستیە ترسناکە بەکار بهێنن بە هۆی کارتێکردنی بیریی لە دوورەوە. بۆ نموونە: تێکدانی رشتەی زانیاری، یا بانکی یا هاتوچۆ لە وڵاتێکدا بە تەواوی، لە کاربردنی یەکە سەربازیەکان بە هۆی دژە فەرمان دان بۆ فەرمانەکانی سەرکردایەتی. بەکارتێکردنی بیری لە دوورەوە هەزارەها کەس، ویستیان تێکدەچێ و دەکەونە ژێر کارتێکردنی ئەوانەی، کە بە هۆی بیریانەوە کاریان تێیان کردووە.. بە پێی بورجی ئەستێرەکان کات و شوێنی لە دایکبوون کاریگەرییەکی راستەوخۆی لە سەر ژیانی لەشی و ژیریی مرۆڤەوە هەیە..

هەروەها بۆمان دەرکەوت کە چەند بارێکی بایۆلۆجی لە دەوروبەری هەموو مرۆڤێ هەیە کە دیاردەی کارتێکردن لە دوورەوە لێکدەداتەوە. لەلایەن خۆمانەوە

---

١ رواه الترمذي: جامع الاصول، ج ٢، ص ٢٠٥، رقم ٦٨٤.

سەدان تاقیکردنەوەمان کرد، کە ئەمە دەسەلمێنن. ئەمەش یەکێکە لە وانە: چەند سێلێکی مرۆڤیی یەك سروشتی بایۆلۆجیمان خستە ناو دوو.دەفری شووشەیی سەربەخۆی داخراو، دوایی ڤایرۆسێکی نەخۆشیمان خستە ناو دەفری یەکەمەوە و سێلەکان نەخۆش کەوتن و دەستیان بە مردن کرد، دوای کەمێك سێلەکانی دەفری دووەم نەخۆش کەوتن و مردن لەگەڵ ئەوەی کە هیچ پەیوەندی لە نێوان دەفرەکاندا نەبوو. هۆیەکەی ئەوەیە سروشتی بایۆلۆجیی سێلەکانی هەردوو دەفرەکە یەکێکە، واتا: کێڵگەی موگناتیسییان یەکە، ئەم تاقیکردنەوەیەمان بیست هەزار جار دووبارە کردەوە و ئەنجامەکانی هەر یەکێك بوون. هەروەها بە هۆی دابڕینی کێڵگەی موگناتیسی لە یەکتری توانیمان گەلێ نەخۆشی چارەسەر بکەین. هەروەها چەند تاقیکردنەوەیەکی گەیاندنی هەستیمان لە نێوان بیست شاری ڕوسیا ئەنجام دا، کە ماوەی نێوانیان لە نێوان هەزار تا حەفت هەزار کیلۆمەتر بوو، وێنەیەکی فۆتۆگرافیمان دایە یەکێ لە کەسەکان و داوامان لێکرد، کە ئەم وێنەیە بۆ کەسانی تر لە شاری تر بنێرێ، کە ماوەی نێوانیان هەزارەها کیلۆمەتر بوو ئەنجامەکان لە سەر سوڕهێنەر زۆر زۆرتر بوون..[1] بۆ سەرکەوتنی ئەمە تەنیا پێویستی بەمەشقکردنی ئەو کەسانە هەیە، چونکە هەموو مرۆڤێ توانایەکی بایۆلۆجیی هەستیی زۆر زۆری هەیە، بەڵام بینیمان کە گەیاندن لە دوورەوە لە باروزروفی گەردوونیی دیاریکراو باشتر دەبێ کە گرنگەکەیان هێزی نزمترین رادەی توانای خۆرییە.))[2]

زانست سەلماندویەتی، کە لە هەر مرۆڤێ هێزێکی دەروونی هەیە، کە لە دوو رەگەز پێکدێ، رەگەزێکی خولقاندن، کە لەگەڵ لە دایکبوونیەوە دێت و دەبێ

---

١ ئەو کەسە وێنەکەی لە پێش خۆی دادەنا و لە مێشکی خۆی ئامادەی دەکرد. ئینجا بیری لەکەسەکەی تر دەکردەوە، کە هەزارەها کیلۆمەتر لەو دووربوو، ئیتر کەسەکەی تر هەمان وێنەی دەبینی، کەلە مێشکی خۆی دایناببوو.

٢ گەر بڵێین جیاوازیی نێوان ئەمانەو وەلییەکان چییە، دەڵێم: جیاوازیەکە ئیمان و پەیرەویکردنە، کەشفی وەلییەکان بە سادەیی دەبێ و بێ زۆر لە خۆکردنە، بەڵام کەشفی ئەمانە پێویستیی بەمەشقکردنێکی درێژ هەیە.

تێیدابێ، رەگەزێکی تر کە بەهەوڵ و کۆشش و مەشقکردن نەش و نما دەکا. ئەوەی دیار بێ ئەم دوو رەگەزە لای شێخ عبدالقادر زۆر بەهێز بووە، گەلێ لە دانەرەکان باسی ئەوەیانکردووە، کە تێرامانەکانی شێخ عبدالقادر بە هێزو تیژ بووە و زۆر کاری لە نەفسی بینەر و گوێگرانی کردووە، بە رادەیەك، کە نەیان توانیوە زۆر چاو لە چاوی بنێن بە هۆی شکۆ و سام و هەیبەتی و هێزی تێڕوانیەکانی. شکۆ و سام و هەیبەتی خۆی لە خۆیدا بەڵگەی بە هێزیی کەسێتیی مرۆڤە و بەڵگەی بەهێزیی هێزی دەروونییەتی، پێشتر زانیمان چۆن شێخ عبدالقادر ئەو ساڵە درێژانەی لە ئارامگرتن و هەوڵ و تەقەلا و کۆشش بردەسەر، تاوای لێهات هێزی دەروونیی یەکجار زۆر بێت.

ئێستا هەندێ لەو کەشفانەتان بۆ باس دەکەین کە دانەرەکان لە کتێبەکانیان باسیان کردووە، گومانیشم لەوە نییە ئێستا کەس گومانی لێی هەبێ، یا گازاندەی بەسەر زاری دابێ:

١- حافزی کوڕی رەجەب لە (الذيل على طبقات الحنابلة) دا گوتی: ((شێخ تەقی‌الدینی کوڕی تەیمیە گوتی: شێخ عیزالدینی کوڕی ئیبراهیمی فاروقی بۆی گێڕامەوە، کە گوێی لە شێخ شەهاب الدین عومەری کوڕی محەممەدی سەهرەوەردی بووە، کە گوتوویەتی: نیازم وابوو شتێ لە زانستی کەلام بخوێنم، دوودڵ بووم لەوەی ئایا (الارشاد)ی ئیمامی حەرەمین یان (نهاية الاقدام)ی شەهرستانی یان کتێبێکی تر بخوێنم، لەگەڵ شێخ عبدالقاهری سەهرەوەردیی خاڵی باوکم چوینە لای شێخ عبدالقادر و خاڵم لە تەنیشت شێخ نوێژی دەکرد، شێخ عبدالقادر ئاوڕی لێم دایەوەو پێی گوتم: عومەر، ئەو شتە چیە، کە توێشووی گۆڕە، ئەو شتە چیە کە توێشووی گۆڕە؟ ئیتر لە بیرکردنەوەی زانستی کەلام پەشیمان بوومەوە.. ئیبن تەمیمیە گوتوویەتی: ئەم حەکایەتەم بینیوە هەڵواسراوە بە خەتی شێخ موفق الدینی کوڕی قودامەی مەقدیسی رەحمەتی خوای لێ بێ، هەروەها ابن النجار لە مێژووەکەیدا باسیکردووە))[1].

---

١ ابن رجب، ص ١٣٤.

٢- لە کتێبی (سير أعلام النبلاء) هاتووە: ((بەخەتی حافز سەیف الدین کوڕی المجد خوێندوومەتەوە: گوێم لە محەممەدی کوڕی محەممەدی المراتبی بووە، گوێم لە شێخ ئەبابەکر ئەلعیماد بووە دەیگوت: لە ئوسولی دینم خوێند بوو و گومانێکی لام پەیدا کرد، گوتم: تا دەچمە کۆڕی شێخ عبدالقادر، چونکە دەڵێن قسە لە ختوراتی دڵ دەکا، چوومە لای و ئەو قسەی دەکرد، گوتی: بیروباوەڕمان بیروباوەڕی پێشینەی چاك(السلف الصالح) و یارانی پێغەمبەرەﷺ؛ لە دڵی خۆمدا گوتم: هەر بەرێکەوت ئەمەی گوت، دووبارە قسەی کرد و ئاوڕی لێم دایەوە و ئەمەی دووبارە کردەوە، گوتم ئەمە ئامۆژگاریکەرە و جارو بار ئاوڕ دەداتەوە، بۆ سێیەمین جار ئاوڕی لێم دایەوە و گوتی: ئەی ئەبوبەکر، بیروباوەڕمان بیروباوەڕی پیاوچاکانی پێشین و یارانی پێغەمبەرەﷺ، ئینجا گوتی: هەستە ئەوە باوکت هاتەوە، باوکم ماوەیەك بوو بزربوو، هەستام پێشوازیی بکەم، باوکم یەکسەر گەیشتە جێ))[1].

٣- هەروەها لە سەرچاوەی پێشوو هاتووە: ((جیبائی گوتوویەتی: گوێم لە (حلية الأولياء)ی ئەبی نەعیم بوو، کە باسی عەلی کوڕی ناسری دەکرد و دڵم نەرم بوو و گوتم: ئارەزووم لەوە بوو، کە بپەڕژێمە سەر خواپەرستی، ڕۆیشتم و لە پشت شێخ عبدالقادر نوێژم کرد، هەر کە دانیشتین شێخ سەیری کردم و گوتی: ئەگەر ویستت بۆ خواپەرستی دابڕێی، تا فیقهـ فێر نەبیت و لەگەڵ شێخەکان دانەنیشیت و لێیان فێرە ئەدەب نەبی دامەبڕێ.))

٤- هەر لەسەرچاوەی پێشوو: ((ابو البقای عەکبەری گوتوویەتی: گوێم لە یەحیای کوڕی نەجاحی ئەدیب بوو دەیگوت: لە دڵی خۆمدا گوتم حەز دەکەم بژمێرم، کە شێخ عبدالقادر چەند باسی شیعری تۆبەکار دەکات، چوومە کۆڕەکە و داوێکم لەگەڵ خۆم برد و لە ژێر کراسەکەم دامنا، هەر کاتێ باسی شیعرێکی دەکرد گرێیەکم لە داوەکەی ژێر کراسم دەدا، من لە کۆتاییی کۆڕەکە دانیشتبووم، هەر هێندەم زانی گوتی: من شی دەکەمەوە و تۆش گرێ لێدەدەی)).

---

١ سير اعلام النبلاء ٢٠ / ٤٤٣.

٥- هەر لەو سەرچاوەیەدا هاتووە: ((ئەحمەد کوڕی زەفەر کوڕی هەبیرە گوتی: لە باپیرم پرسیار کرد[1] کە سەردانی شێخ عبدالقادر بکەم هەندێ زێری دامێ بیدەمێ، هەر کە لە مینبەر دابەزی سەلامم لێکرد و شەرمم کرد لەناو ئەو حەشامەتە زێڕەکەی بدەمێ، شێخ گوتی: ئەوەی پێتە بێنە و گوێ مەدە خەڵك و سەلام لە وەزیر بکە))..

لە کتێبی (قلائد الجواهر)[2] بەم شێوەیە هاتووە: شێخ گوتی: ((ئەو زێڕەی پێتە هەڵی گرە و سەلام لە وەزیری باپیرت بکە و پێی بڵێ: عبدالقادر پێویستیی نییە بەوەی ناردووتە، بیگەڕێنەوە بۆ ئەوانەی پێویستیان پێی هەیە)).

٦- لە کتێبی (قلائد الجواهر)[3]ی محەممەد کوڕی یەحیای تادفی هاتووە: ((ابوالفرج کوڕی حەمامی گوتوویەتی: زۆر شتم لە بارەی شێخ عبدالقادرەوە دەبیست و بەڕاستم نەدەزانی، بۆیە حەزم لە بینینی بوو، ڕۆژێ وا ڕێکەوت چومە (باب الازج) بۆ کارێکی خۆم، کە گەڕامەوە بە پێش قوتابخانەکەی شێخدا ڕەتبووم، لەو کاتە بانگدێرەکە قامەتی نوێژی دەکرد، منیش بەو قامەتە ئەوەی لەدڵم بوو بەبیرم هاتەوە و گوتم: نوێژی عەسر دەکەم و سەلام لە شێخ دەکەم، لە بیرم نەمابوو کە دەستنوێژم نییە، نوێژی عەسری بۆ کردین، هەر کە لە نوێژ و پاڕانەوە بوویەوە، هاتە لام و گوتی: ئەی کوڕی خۆم گەر بۆ مەبەستی جێبەجێکردنی پێویستییەکت هاتووی بۆت پێکدێ، بەڵام خافڵەتی بە تەواوی دای گرتووی، بێ دەستنوێژ نوێژت کرد و لەبیرت چوو، ابوالفرج گوتی: سەرم لە حاڵی سوڕماو هۆشی شێواندم.. لەو کاتەوە شوێنی کەوتم و کەوتمە داوی خۆشەویستی و

---

١ باپیرەی عەون الدین یەحیا کوڕی محەمەد کوڕی هەبیرەیە و وەزیری خەلیفە (المقتفی لأمر الله و المستنجد بالله) بووە، پیاوێکی زانای ئەدیبی لە خوا ترسی چاك بوو، لە سەر مەزهەبی حەنبەلی بوو، هاوڕێی شێخ عبدالقادری گەیلانی بوو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ و هاچەرخی بووە، لە ساڵی ٤٤٩ ك لە دایکبووە و لە ساڵی ٥٦٠ ك وەفاتیکردووە.

٢ ص ٤٠.

٣ ص ٣٠.

خزمەتکردنی.))

٧- هەر لە سەرچاوەی پێشوودا[١]: ((شێخ عبدالله محەمەد کوڕی ابی‌الغنائم الحسینی گوتوویەتی: لە ڕۆژێکی مانگی حەرامی خوا لە ساڵی پێنج سەد و پەنجاو نۆی کۆچی، نزیکەی سێ سەد کەس هاتبوونە سەردانی تەکیەکەی شێخ عبدالقادر و لەلای کۆڵەگەکانی هەیوانێ دانیشتبوون، شێخ لە ماڵێ دەرچوو و هاواری کردە خەڵکەکە: خێرا وەرنە لام خێرا وەرنە لام، بەخێرایی هاتنە لای، تا هیچ کەسێ لە هەیوانەکە نەما، یەکسەر بانەکە کەوت و خەڵکەکە ڕزگاریان بوو.))

٨- لە سەرچاوەی پێشوودا[٢]: ((ابوالمظفر شمس الدین یوسف کوڕی قزعەلی کوڕی عبدالله ی تورکی عوفی بەغدایی حەنەفیی کوڕی کچی ئیبن جەوزی گوتوویەتی: خاسبەگ-ناوی پیاوێکی تورکییە- پێی گوتم: شێخ عبدالقادر ڕۆژی یەکشەممان دادەنیشت، شەوی یەکشەممە لەوێ مامەوە بۆ ئەوەی ئامادەی کۆڕەکەی بم، وا ڕێکەوت شەوێ توشی جەنابەت بووم، ئەو شەوە سارد بوو، گوتم: کۆڕەکەی لە کیس خۆم نادەم، هەر کە تەواو بوو خۆم دەشۆم، هاتمە قوتابخانەکە و شێخ لە سەر مینبەر بوو، هەر کە چاوی پێم کەوت گوتی: دێیە کۆڕەکەمان و لەشت پیسە و بیانوو بەسەرما دەگریت)).

لەو کتێبانەی باسکران کۆمەڵێ حەکایەتی تری وەها بە درێژییەوە نووسراوە.

---

١ ص ٣٢.

٢ ص ٧٦.

# بەشی یەکەم

# مردنی و وەسیەتەکانی

مێژوونووسەکان هەموو لە سەر ئەوە کۆکن، کە شێخ عبدالقادر لە ساڵی ٥٦١ ك مردووە، ڕێکەوتی شەوی شەممەی دەیەمینی ڕەبیعی کۆتایی، هەندێ دەڵێن: هەشتەمینی، هەندێ دەڵێن: یازدەمینی ڕەبیعی کۆتایی ساڵی ٥٦١ کۆچیی ڕێکەوتی ساڵی ١١٦٦ زایینی یاخود ١١٦٥ زایینی و تەمەنی نەوەت ساڵ بووە، مامۆستای پسپۆڕ لە بەراورد کردنی ساڵی زایینی و کۆچی بەڕێز: محەممەد رضـوان المراد دەڵێت: لە سەرەتای مانگی ڕەبیعی کۆتاییی ساڵی ٥٦١ ك ڕۆژی پێنج شەممەی ڕێکەوتی ١١٦٦/٢/٣ زایینی بووە، کەواتە وەفاتی شێخ عبدالقادر شەوی شەممەی دەیەمینی ڕەبیعی کۆتاییی ساڵی ٥٦١ کۆچیی ڕێکەوتی ١١٦٦/٢/١٣ زایینی بووە بەتەواوی.

هەروەها گوتویانە شێخ لە ژیانیدا هیچ نەخۆشییەکی قورسی نەگرتووە، جگە لەو نەخۆشیەی کە شەوو ڕۆژێکی خایاندووە و پێی مردووە.[١]

شێخ عبدالعزیزی کوڕی لە بارەی نەخۆشیەکەیەوە لێی پرسی، شێخ پێی گوت: با کەس پرسیاری هیچم لێ نەکات، من لە زانستی خوادا هەڵاوگێڕ دەبم، نەخۆشیەکەم کەس پێی نازانێ و کەس تێی ناگات..

شێخ عبداالجباری کوڕی لێی پرسی: کوێت دێشێ؟ گوتی: هەموو ئەندامەکانی

---

١ عبدالقادر الكيلاني، محمد العيني، ص ٧٦.

لەشم ژان دەکا، جگە لە دڵم کە هیچ ژانی نییە و لەگەڵ خوادایە.

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەیگوت: من لە هیچ مرۆڤێ ناترسێم، من لە مردن ناترسێم و لە فریشتەی مردن ناترسێم.

شێخ هەردوو دەستی بڵند دەکرد و درێژی دەکردەوە و دەیگوت: سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا لە ئێوەش. ئینجا حەق و گیانەڵای مردنی گەیشتێ و ئەمەی دووبارە دەکردەوە: پشتم بەستا بە (لا الـــه الا الله ســـبحانه وتعـــالی) ئەو زیندووەی کە نامرێ و لە مردن ناترسێ، گەورەیی بۆ ئەو خوایەیە، کە بەتوانا بە هێز بووە و بەمردن بەسەر بەندەکانیدا زاڵە، هیچ خوایێ نییە شایانی پەرستن بێ (الله) نەبێ و محەممەدﷺ پێغەمبەری خوایە، لە گیانەڵا نەی دەتوانی وشەی (تعزّز) گۆبکات و هەر دووبارەی دەکردەوە تا گۆی کرد، ئینجا بەردەوام دەیگوت: الله الله، تا دەنگی نەما و زمانی بەبن گەرووییەوە نوسا و ئینجا گیانی پیرۆزی دەرچوو.[1]

ئینجا منداڵەکانی شووشتیان و عبدالوهابی کوڕی و منداڵەکانی تری و قوتابی و دەروێشەکانی نوێژیان لە سەر کرد و بە شەو لە قوتابخانەکەیدا ناشتیان، هەر کە دەنگوباسی وەفاتکردنی لە ڕۆژی دوایی لە بەغدا بڵاوبوویەوە، خەڵکی بەغدا هەموویان لە (باب الازج) کۆبوونەوە و دەنگی گریان و هەنیسکدان بەرز بوویەوە و ویستیان بچنە ناو قوتابخانەکە بۆ دوا ماڵ ئاوایی لە شێخیان، بەڵام دەرگاکانی قوتابخانەکە بە داخراوی مایەوە تا ڕۆژ بەرز بوویەوە و بۆ خەڵکی کرانەوە.[2]

پێش مردنی، عبدالوهابی کوڕی لە بارەی وەسیەتکردنیەوە لێی پرسی، شێخ پێی گوت: ((پێویستە لە خوای مەزن بترسی و گوێڕایەڵی بیت. جگە لە خوا لە کەس مەترسە، جگە لە خوا تکا لە کەس مەکە، هەموو پێویستییەکان هەر بۆ خوای گەورەیە، هەمووی لەو داوا بکە، جگە لە خوا متمانە و بەقات بەکەس نەبێ،

---

١ فتوح الغيب على هامش قلائد الجواهر، ص ١٣١.

٢ عبدالقادر الكيلاني، محمد العيني، ص ٧٧.

ئاگاداری یەکخواپەرستی بە، یەکخواپەرستی، یەکخواپەرستی، کۆی هەموو شتێ یەکخواپەرستییە))[1] . ئینجا گوتی: ((بەسەر سیفەتەکانی خوادا بچنەوە وەك چۆن هاتووە، فەرمان و حوکم دەگۆڕێ، بەڵام زانست ناگۆڕێ، حوکم دەسڕێتەوە، بەڵام زانست ناسڕێتەوە))[2] .

---

١ الفتح الرباني، ص ٣٧٣ / فتوح الغيب، ص ١٣٠.

٢ الفتح الرباني، ص ٣٧٤.

# بەشی دووەم

# خێزان و منداڵ و نەوەکانی

## ژنەکانی:

((شێخی صۆفیگەریی سەردەمی خۆی، شێخ شهاب الدین عومەری سەهرەوەردی، کە یەکێ لە قوتابیەکانی شێخ عبدالقادر بووە دەڵێت: گوێمان لێبووە لە شێخ عبدالقادر دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: ماوەیەك بوو حەزم لە ژن بوو، بەڵام زاتی ژن هێنانم نەدەکرد، نەخۆ کاتم لێڵ بکات. هەر کە ئارامم گرت و کاتی خۆی هات، خوای گەورە چوار ژنی بۆ رێکخستم کە هەموو یان کچە دەوڵەمەند بوون، یان پیشەگەر بوون))[1].

هیچ مێژوونووسێ مێژووی یەکەم ژنهێنانی تۆمار نەکردووە. بەڵام خاوەنی (قلائد الجواهر) دەڵێ: یەکەم کوڕی عبداللّٰەیە، کە لە ٥٠٨ کۆچی لە دایك بووە، بەڵام مامۆستا محەممەد عەینی دەڵێ: یەکەم کوڕی عبدالوهابە[2]، کە لە ساڵی ٥٢٢ کۆچی لەدایك بووە، پێشتر بینیمان کە عبدالوهاب نوێژی لەسەر باوکی کرد کاتی مردنی، ئەگەر عبداللّٰە کوڕە گەورەی بوایە بۆچی ئەو نوێژی لەسەر نەدەکرد ؟!

ئەگەر رای یەکەم راست بێ یا دوووەم ئەوا شێخ عبدالقادر لە دوای تەمەنی

---

١ قلائد الجواهر، ص ٤١.

٢ عبدالقادر الكيلاني، محمد العيني، ص ٧٥.

پەنجاو سێ ساڵی ژنی هێناوە، ئەمەش تەمەنێکی درەنگە بە پێی ئەو سەردەمە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ژیانی گەنجێتیی ئاسایی نەبووە و حاڵی یارمەتیی ژنهێنانی نەداوە، شێخ هەژار و دەربە دەربوو لە بیابانەکانی عیراق و کاولگەکانی بەغدا.

## منداڵەکانی:

ئیبن نەجار لە مێژووەکەیدا دەڵێ: ((گوێم لە عبدالرزاقی کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی بوو دەیوت: باوکم چل و نۆ منداڵی بووە، بیست و حەوت کوڕ وبیست و دوو کچ))، بەڵام هەر تەنیا سێزدە کوڕیان مانەوە، کە ئەمانەن: عبداللە و عبدالوهاب و عبدالرزاق و عبدالعزیز، عبدالجبار و ئیبراهیم و محەممەد و عبدالرحمن و عیسا و موسا و ساڵح و عبدالغنی و یەحیا و تاکە کچێ کە فاتیمە بوو[1].

واتـــا: خوای گەورە بە منداڵ مردن تاقی کردۆتەوە و چواردە کوڕو بیست و یەك کچی مردووە، ئەمە ئارامگرتنی پیاوچاك و بەخشندەکانە، بۆیە جوبائی-یەکێ لە قوتابیەکانی شێخ عبدالقادر بووە گوتوویەتی: شێخ عبدالقادر ڕەزای خوای لێبێ گوتوویەتی: منداڵێکم دەبوو لە سەر دەستی خۆمم دەگرت و دەمگوت: ئەمە مردووە، لەدڵی خۆم دەبردە دەرەوە، بۆیە کە دەمرد کاری تێم نەدەکرد، چونکە هەر لە بوونیەوە لە دڵی خۆم بردبووە دەرەوە))، واتـــا: شێخ هەر کە منداڵێکی دەبوو بە نەفسی خۆی دەگوت: ئەم منداڵە دوارۆژی مردنە، مردن ڕێگای هەموو زیندوێکە و لای من تەنها شتێکی خواستەمەنییە.. جوبائی گوتوویەتی: ((بۆیە هەر کە کوڕ و کچەکانی دەمردن، کۆڕی خۆی تێك نەدەدا و دەچووە سەر کورسی و ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد. مردووشۆر دەیشووشت، کە لە شووشتنی دەبوونەوە دەیان هێنا کۆڕەکەی و شێخ دادەبەزی و نوێژی لەسەر دەکرد))[2].

---

١ فتوح الغيب على هامش قلائد الجواهر، ص ١٣٦.

٢ قلائد الجواهر، ص ٤٢.

## ١- عبداللەی کوڕی شێخ:

گەورەترین مندالەکانی شێخە، لە سالی ٥٠٨ ك لە دایك بووە، گوێی لە باوکی و (ابن بناء) بووە، لە بەغدا لە ١٧ یا لە ١٨ ی سەفەری سالی ٥٨٩ یاخود ٥٨٧ ك مردووە.[١]

## ٢- عبدالوهابی کوڕی شێخ:[٢]

لە مانگی شەعبانی سالی ٥٢٢ ك لە بەغدا لە دایك بووە، فیقهی لای باوکی خوێندووە، گوێی لە باوکی و ئەبی غالیبی بەننا و هیتر گرتووە، بۆ خوێندن چووە ولاتی عەجەم، دوایی گەڕایەوە بە غدا و لە قوتابخانەی باوکی لە جێی ئەو وانەی دەگوتەوە، کە هێشتا لە ژیاندا بوو لە سالی ٥٤٣ ك، لە دوای باوکی ئامۆژگاری خەلکیی دەکردو فتوای دەداو کۆمەلێك لای ئەو دەرچوون لەوانە: شەریفی حوسەینیی بەغدایی و ئەحمەدی کوڕی عبدالواسع و... هیتر.. زانایەکی بەڕێز و قسە پوختە بوو لە کێشەناتەبایەکان، زمان پاراو بوو لە ئامۆژگاریکردن.. پیاوێکی جوانی ڕێکو پێك بوو، لە گفتوگۆدا گالتە ئامێز و تێگەیشتوو بوو، خاوەنی پیاوەتی و بەخشندەیی بوو، ئیمام (الناصر لدین الله) لە سالی ٥٨٣ ك کردبوویە لێپرسراوی سکالای خەلکی، لە فتوادا قەلەمەکەی تیژ بوو، لە شەوی (٢٥) ی شەوالی سالی ٥٩٣ کۆچی لە بەغدا وەفاتی کردووە و لە گۆڕستانی (الحنابلة) نێژراوە))[٣].

---

١ سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤. لە مندالەکانی عبدالله: عبدالرحمانە، ئیبن نوقتە لە (تکملة الاکمال) باسیکردووە: ٤٩٢/٢، گوتوویەتی: عبدالرحمن کوڕی عبدالله کوڕی عبدالقادری گەیلانی، لە نەسر کوڕی نەسری عوکبەری و سەعیدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی بەننا دەگێڕنەوە، کە لە بیست و شەشی موحەڕەمی سالی شەش سەدو چوار دە مردووە.

٢ سەیری ژیانی بکە لە (المختصر المحتاج الیه) ٥٧/٣، مێژووی ئیبن ئەلنەجار ٣٤٧/١، (ذیل الروضتین) ص ١٢، (مشیخة النعال) ص ١٣٢، (ذیل طبقات الحنابلة) ٣٨٨/١، (شذرات الذهب) ٣١٤/٤.

٣ قلائد الجواهر، ص ٤٢٠.

ئیبن رەجەب لە (طبقــات)ەکەی‌دا دەڵێ: ئەو گوێی لە ابن الحسین و ابن الزاغونی و ئەبی غالیبی کوڕی بەنناء و هیتر گرتووە، زانایەکی زاهیدی ئامۆژگاریکەر بووە، قەننوجیی خاوەنی کتێبی (التــاج المکلـــل) گوتوویەتی: عبدالوهاب لای ابن البنـــاء و قەزاز و ئەرمەوی و ابی‌الوقت و زانای تر خوێندوویەتی و فیقهی لای باوکی خوێندووە.[1]

## ٣-عبدالرزاق کوڕی شێخ :[2]

ئێوارەی شەوی دووشەممەی هەژدەی ذي‌القعدەی ساڵی ٥٢٨ ك لە دایکبووە، شێخێکی پێشڕەوی قورئان لەبەر بووە، لای باوکی فیقهی خوێندووە و گوێی لەوو لە ابی‌الحسن کوڕی سرماو زانایانی تر گرتووە، حەدیسی گێڕاوەتەوە و نووسیویێتیەوە و وانەی گوتۆتەوە و فتوای داوە و رووبەڕووی زانایان بووەتەوە و چەند زانایێ لای ئەو خوێندنی تەواو کردووە، وەکو: ئیسحاق کوڕی ئەحمەد کوڕی غانم و عەلی کوڕی عەلی-دواندەری (خطیب) زووباو هیتریش.

حافظ ابن النجار لە مێژووەکەیدا دەڵێ: گوێی لە باوکی و لە ابی‌الحسن محەممەد کوڕی سائیغ و قازی ئەبیل فەزڵ محەممەد و سەعیدی کوڕی بەنناء و ابی‌الفضل محەممەد کوڕی ناسری حافظ و ابی المظفر محمد الهاشمي و أبي الخطاب بن البطر و ابی‌عبدالله ی کوڕی تەلحە خوێندووە، مرۆڤێکی بە توانا بوو لە ئەزبەر کردن(حفظ) و تێگەیشتوو خاوەن بەقا بوو، راستگۆ بوو و شارەزای حەدیس بوو، زانا و شەرعزان بوو لەسەر مەزهەبی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، خۆپارێز بوو، لەماڵی خۆی گۆشەگیر بوو. تەنیا لە رۆژانی هەینی دەردەچوو، رێزی قوتابیانی دەگرت و

---

١ التاج المكلل لأبي الطيب القنوجي، ص ٢١٢.

٢ ( التقييد) ٢/١٠٩، التكملة ٢/١١٦ ( ١٩٨٠)، مشيخة النعال، ص ١٤٣، ذيل الروضتـــين، ص ٥٨، سير اعلام النبلاء، ٢١/٤٢٦، ذيل طبقات الحنابلة ٢/٤٠.

بەخشندە بوو، ئارامگر بوو لەسەر هەژاریەکەی، نەفس بەرز و نەفس پاك بوو ... دبیثی و حافظ ئیبن نەجاری خاوەنی (التأریخ) و نەجیب عبدالطیف و تقی البلدانی حەدیسیان لێ گێڕاوەتەوە.

ئەبوبەکری کوڕی نوقتە گوتوویەتی: ((عبدالرزاقی شێخمان حافزی قورئان بوو و جێمتمانە و دەستپاکی بوو، لە شەوی شەممەی شەشەمی شەوالی سالّی ٦٠٣ کۆچی وەفاتیکردووە))[1].

ئیبن رەجەب لە (طبقات)ەکەیدا گوتوویەتی: لە مەزهەبدا زانیاریی هەبوو، بەڵام زانیاریی لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ هێندە زۆر بوو زانیاریەکەی فیقهی داپۆشیبوو.

قنوجی خاوەنی کتێبی (التاج المکلل)[2] گوتوویەتی: ((عبدالرزاق کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی حەدیس گێڕەوەی حافزی قورئان لە سالّی ٥٢٨ ك لە دایکبووە و لە سالّی ٦٠٣ ك وەفاتیکردووە. گوێی لە: باوکی و ئیبن سرما و حافظ کوڕی ناسر و کوڕی بەنناء و ابی‌الوقت و ئەوەی لە چینی ئەوانە بوو گرتووە.. حافظ الضیاء گوتوویەتی: لە بەغدا وێنەی ئەوم نەدیوە لە بواری لێکۆڵینەوە و وریاییی، ئەبوشامە ستایشی کردووە، زەهەبی باسیکردووە و گوتوویەتی: دەبیس و ئیبن نەجار و ضیاء المقدسی و هیتر فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە، لە سالّی (٦٠٣ ك.-١٢٠٧ ز.) وەفاتیکردووە و لە (باب حرب) نێژراوە. ))

## ٤- عبدالجباری کوڕی شێخ :

مێژووی لە دایکبوونی باس نەکراوە، .. فیقهی لای باوکی خوێندووە و گوێی لەو و لە ئەبی مەنسور و قەزاز و هیتر گرتووە، ڕێبازی صۆفیگەریی گرتووە. خەتی زۆر سەیر و خۆشبووە، بەگەنجێتی لە (١٩) ی ذی‌الحجەی سالّی ٥٧٥ ك

---

[1] تکملة الاکمال: ٢/٤٩٢.

[2] ص ٢٢٠.

وەفاتیکردووە و لە تەکیەی باوکی لە (الحلبـــة) نێژراوە))[1]. ئیبراهیمی دروبی لە کتێبەکەی (الباز الاشهب)دا گوتوویەتی: عبدالجبار لە (الحلبة) نەنێژراوە، بەڵکو لە مزگەفتی گەیلانی نێژراوە و گۆڕەکەی دیارەو سەردانیی دەکرێت.

## ٥- عبدالعزیزی کوڕی شێخ :

((بە باوکی ئەبوبەکر بانگ دەکرا، لە (٢٧) ی شەوالی ساڵی ٥٣٢ ك لە دایکبووە، لای باوکی فیقهی خوێندووە و گوێی لەو و ئیبن مەنسور عبدالرحمن کوڕی محەممەدی قەزاز و هیتر گرتووە، فەرموودەی گێراوەتەوە و ئامۆژگاریی کردووە و وانەی گوتۆتەوە. لە زانایێ زیاتر لای ئەو خوێندنیان تەواو کردووە، مرۆڤێکی جوانی بێ فیز بووە، چووەتە (الحیـــال) نزیك ئاکرێ لە موسڵ، دوای ئەوەی لە جەنگی عەسقەلان لە فەلەستین بەشداریی کرد لە ساڵی ٥٨٠ ك. خۆی و نەوەکانی لە گوندی (حەیال) و لە بەغدا نیشتەجێبوون تا ئێستا. لە ١٨ ی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٦٠٢ ك یاخود ٦٠٤ ك وەفاتیکردووە و لە (حەیال) نێژراوە))[2].

## ٦-عیسای کوڕی شێخ :

مێژووی لە دایکبوونی باس نەکراوە ((لای باوکی فیقهی خوێندووە و گوێی لەو و لە ابی‌الحسن کوڕی سرما و هیتر گرتووە، وانەی گوتۆتەوە و فەرموودەی گێڕاوەتەوە و ئامۆژگاریی کردووە و فتوای داوە و زۆر دانراوی هەیە لەوانە کتێبی (جواهر الأسرار ولطائف الأنوار) لە زانستی صۆفیگەری، چووەتە میسرو لەوێ حەدیسی گێڕاوەتەوە و ئامۆژگاریی کردووەو زیاتر لە زانایێ لای ئەو خوێندنیان تەواو کردووە، لەوانە: ابوتراب رەبیعە کوڕی حەسەنی حەزرەمی سەنعانی، موسافیر کوڕی یەعموری میسری، حامید کوڕی ئەحمەدی ئەرتاجی و محەممەد کوڕی محەممەد شەرعزانی فەرمودەناس و جگە لەوانەش.

---

١ قلائد الجواهر، ص ٤٣.

٢ قلائد الجواهر، ص ٤٣.

حافظ ابن النجار له مێژووه‌كه‌یدا گوتوویه‌تی: له دوای مردنی باوكی لـه بـه‌غدا ده‌رچوو و چووه شام لـه دیمه‌شق گوێـی لـه عـه‌لی كـوڕی مـه‌هدی هیـلالی گـرت لـه ساڵی ٥٦٢ ك، لـه بـاوكی فـه‌رمووده‌ی گێڕاوه‌تـه‌وه، ئینجـا چۆتـه میسـر و لـه‌وێ ماوه‌تـه‌وه تـا مردنی، لـه سـه‌ر مینبـه‌ر ئامۆژگـاریی خـه‌ڵكیی ده‌كـرد و گوێیـان لێـی ده‌گرت، لـه‌وێ فـه‌رمووده‌ی لـه بـاوكی گێڕاوه‌تـه‌وه، ئه‌حمـه‌دی كـوڕی مه‌یسـه‌ره‌ی حه‌نبه‌لی فه‌رمووده‌ی لـێ گێڕاوه‌ته‌وه، ابن النجار گوتوویه‌تی: له سه‌ر كێلی گـۆڕی عیسای كوڕی شێخ عبدالقادری گه‌یلانی له (قه‌رافه)ی میسـر خوێندوومه‌تـه‌وه: لـه دوازده‌ی ره‌مه‌زانی ساڵی ٥٧٣ ك مردووه، یه‌كی له شیعره‌كانی:

| | |
|---|---|
| ســـــه‌لامی من به‌ره بۆ خاكی یاران | بلـێ پێیان غه‌ریب به ئاره‌زووه |
| گه‌ر پرسییان حاڵی چۆنه دوای ئه‌وان | بڵێن به ئاگری دووری سووتاوه |
| بێ هــاوده‌مه تـا بـــڕوا له نزیكیـــان | ڕێگه‌ی گه‌ڕانه‌وه‌شی لـێ گیراوه |
| غه‌ریبێكه خه‌م ده‌خوا له گشت شاران | كێ له به‌ڵا هاوڕێیه بۆ غه‌ریبان.[1] |

## ٧- موسای كوڕی شێخ :

لـه كۆتـاییی ره‌بیعی یه‌كـه‌می سـاڵی ٥٣٩ لـه دایـك بـووه، فیقــهی لای بـاوكی خوێندووه و لای ئه‌و و ئیبن به‌ننا و هیتر گوێی گرتووه، باوكی ناردوویه‌تیـه دیمه‌شق و لــه‌وێ نیشـــته‌جێ بـووه و فـه‌رمووده‌ی گێڕاوه‌تـه‌وه و خـه‌ڵكی سـوودیان لێــی وه‌رگرتووه، ئینجا به‌ره‌و میسر چـووه، هێنـده‌ی پێ نـه‌چووه گه‌ڕاوه‌تـه‌وه دیمه‌شق و له‌وێ پیر بووه، شێخ عومه‌ری كوڕی حاجیب لـه (معجم)ه كـه‌یدا گوتوویـه‌تی: لـه سه‌ر مه‌زهه‌بی حه‌نبه‌لی بووه، شێخ و پاڵپشت بووه، له خێزانێكی فـه‌رمووده گێڕه‌وه و زاهید و خۆپارێز بووه. شێخێكی جوان و هه‌ڵس و كه‌وت ڕێك بووه، له كۆتاییی ته‌مه‌نی ناگزوور بووه و نه‌خۆشی ته‌نگی پێ هه‌ڵچنیوه تا له دیمه‌شق وه‌فـاتیكردووه و لـه قوتابخانـه‌ی (المجاهده) نوێژی له‌سـه‌ر كـراوه و لـه ته‌پۆڵكـه‌ی چیـای قاسـیوون

---

١ قلائد الجواهر، ص ٤٢.

نێژراوە-رەحمەتی خوای لێ بێ)) موسا دوا منداڵی شێخ عبدالقادر بووە کە مردووە و لە گەڕەکی (العقیبە) لە دیمەشق لە سەرەتاکانی جیمادی دوایی ساڵی ٦١٨ کۆچی مردووە.[١]

## ٨- محمدی کوڕی شێخ :

لای باوکی فیقهی خوێندووە و گوێی لەو و لە ئیبن بەنناء و ابی‌الوقت و هیتر گرتووە، لە بەغدا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە پازدەی ذی‌القعدەی ٦٠٠ ك لە بەغدا وەفاتیکردووە و لە گۆڕستانی (الحلبة) نێژراوە(رەحمەتی خوای لێبێ)،[٢] باسی مێژووی لە دایك بوونی نەکراوە.

## ٩- ئیبراهیمی کوڕی شێخ :

فقهی لای باوکی خوێندووە و گوێی لەو و لە سەعیدی کوڕی بەنناء و هیتر گرتووە، چووەتە (واسط) و لە ٥٩٢ ك لەوێ وەفاتیکردووە.[٣]

## ١٠- یەحیای کوڕی شێخ :

بچوکترین منداڵی شێخە و لە ٥٥٠ ك لە دایکبووە، واتا یازدە ساڵ پێش وەفاتی باوکی. باوکی لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا بوو، دەگێڕنەوە جارێ شێخ عبدالقادر نەخۆش دەکەوێ و منداڵەکان لێی دەترسێن بمرێ، پێیانی گوت: مەترسن، ئێستا نامرم، هێشتا کوڕێك لە پشتم ماوە و دێتە دنیا، ناوی یەحیایە، دایکی یەحیا کەنیزەیەکی حەبەشی بوو.. لای باوکی فیقهی خوێند و گوێی لەو و لە محەممەد کوڕی عبدالباقی و هیتر گرتووە، حەدیسی گێڕاوەتەوە و خەڵکی سودیان لێی

---

١ قلائد الجواهر، ص ٤٤.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ص ٤٤.

وەر گرتووە، هاتە میسر و لەوێ مایەوە تا پیر بوو، لەگەڵ عبدالقادری کوڕی کە لە میسر بوو بوو گەڕایەوە بەغدا. لە شەعبانی ساڵی ٦٠٠ کۆچی لە بەغدا مرد و بانگی خەڵکیان کرد بۆ نوێژ کردن لەسەری و خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوە و لە قوتابخانەکەی باوکی نوێژی لەسەر کراو لە تەکیەی باوکی لە (الحلبة) لەلای شێخ عبدالوهابی برای نێژرا.[1]

## نەوەکانی شێخ عبدالقادر:

لە نەوەکانی تەنیا باسی دوانیان دەکەم: شێخ نەسر کوڕی عبدالرزاق و سیف الدین یەحیا، کە چووە شاری حەما. ئەوەی زانیاریی زیاتری دەوێ باسەیری کتێبی (قلائد الجواهر) ل ٤٤ و دوای ئەو بکات.

## شێخ نصر کوڕی عبدالرزاق کوڕی شێخ عبدالقادر:

کەڵەزانا ئەبوبەکر کوڕی نوقتەی حەنبەلی لە (تکملة الاکمال)دا گوتوویەتی: ((ئەبوسالح نەسر کوڕی عبدالرزاق کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی، گوێی لە شوهدەی کچی ئەحمەد و ابی الحسین کوڕی یوسف گرتووە. زانایەکی بەڕێز و گوێگرتنەکانی راست بووە)).[2]

حافظ کوڕی رەجەب لە (طبقات الحنابلة) دا گوتوویەتی: شێخی پێشڕەو ئەبوسالحی شەرعزان، فەرموودەناس، زاهید، ئامۆژگاریکەر، قازی قازییان، شێخی سەردەم، کۆڵەگەی ئایین، قورئانی لای باوکی خوێندو حەدیسی لەو و لە عبدالوهابی مامی گوێ لێبوو، أبوالعلائی هەمەدانی و ئەبوموسای مەدیەنی و ئەبوهاشمی روشانی ئیجازەیان داوەتێ. شێخ نەسر خاوەنی زمانێکی رەوان و شێوازێکی بێ وێنەبوو، فتوای داوە و حەدیسی گێڕاوەتەوە و بوەتە لێپرسراوی

---

١ قلائد الجواهر، ل ٤٤ بە دەستکارییەوە.
٢ تکملة الاکمال ٢: ٤٩٢.

قوتابخانەکەی باپیری (شێخ عبدالقادر)، لە سەر مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە بەغدا بووە تە قازی، یەکەم کەس بووە بە قازیی قازییەکان ناوی دەرکردووە، لە رۆژی چوارشەممەی هەشتەمی ذیالقعدەی ساڵی ٦٢٢ کۆچی بووەتە قازی، خەلیفە (الظاهر بأمر الله) دایمەزراندووە، بازی بەندی لەبەر کردووە و لە هەر سێ مزگەفتی بەغدا فەرمانی بە قازیبوونی خوێندراوەتەوە، دووبارە سەیری هەموو وەقفە گشتیەکان و وەقفی قوتابخانەکانی شافیعی و حەنەفی و مزگەفتی سوڵتانی کردۆتەوە، فەرمانی دامەزراندن و لابردن لە هەموو قوتابخانەکانی بەغدا بە (نظامیة)شەوە بەدەست ئەو بووە، ناوبانگی چاکیی لە ناو خەڵکی پەیدا کردووە، لە کۆڕەی حەدیسی خوێندۆتەوە و خەڵکی نووسیویانە، رۆژی هەینی، کە بۆ مزگەفت دەرچوو بە پێیان دەهات و پلە و پایەکەی کاری لە ژیان و ئەو بێفیزییەی نەکردووە کە لە پێش قازییاتیەکەی پێی بەناوبانگ بوو، مرۆڤێکی خاوەن بەقاو بەرێز و ورد لە لێکۆڵینەوە بوو، لە کێشە ناتەبایەکان قسەی نەرم بوو، شێوازی شیرین بوو، سروشتی ناسك بوو، ژیربوو، دلێر بوو، لە هیچ شتێ نەدەترسا. ئینجا (المستظهر بالله بن الظاهر بأمر الله) لە ٢٣ ی ذیالقعدەی ساڵی ٦٢٣ ك لە قازییاتی لای داو ئەو لادانەی پێخۆشبوو و گوتی:

سوپاسی خودای گەورەم کرد هەر کە
فەرمانی رزگار بوونم درا لە قازییاتی

دوایی (المستظهر بالله) تەکیەکەی پێ سپارد کە لە دێری رۆم بنیاتی نابوو و کردیە شێخی ئەوێ، زۆر رێزی دەگرت و بەگەورەی دەزانی و ماڵێکی زۆری بۆ ناوی (إرشاد المبتدئین).. شێخ نەسر لە شەوی شەممەی رێکەوتی چواردەی رەبیعی کۆتاییی ساڵی ٥٦٤ ك لە دایکبووە و لە بەغدا بەیانی شەوی یەکشەممەی شازدەی شەوالی ساڵی ٦٣٣ ك مردووە و لە سەکۆی ئیمام ئەحمەد کوڕی حەنبەل نێژراوە، ئەمەش یەکێکە لەو شیعرانەی کە بە سەر خۆیدا گوتووە:

من لـه گۆڕا تاك و ڕەهن کراوم     موفلیس، وامدار، سەردانی لـێ سەنراوم
وابار کۆڵەم خستە لای بەخشندەیێ     ئـازاد بوون لای سوو کە ئازاد کراوم[1]

## سیف الدین یحیی :

ئەبوزەکەریای کوڕی ظهیرالدین ئەحمەد کوڕی شێخ ئەبی نەسر محەممەد کوڕی شێخ نەسر قـازیی قازییـەکان   کـوڕی شـێخ تـاج الدیـن عبدالـرزاق کـوڕی شـێخ محێدین عبدالقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خوایان لـی بێ)، لـە بەغدا لـە دایـك بـووە، پیـاوێکی سـاڵحی خواپەرستی بـەجێ بـوو، لـە ساڵی ٦٨٤ ك چووەتە حەج و لـە ڕێگەی حەجیدا بە شاری (حەما)ی سوریادا ڕەتبووە و پێی سەرسام بووە بە تایبـەتی بە ئاوو باخچەکانی، لە کاتی گەڕانەوەی لە حەج لە ساڵی ٦٨٥ ك هەر بـە ڕێگـەی (حەما)دا هاتۆتـەوە و خـۆی و خانـەوادە و دەسـت و پێوەندەکـەی لـەوێ نیشتەجێ بـوون، ئەمـەش لـە کـاتی موزەفـەری سێیەمی پاشـای حەما، نەوەی صـلاح الدینـی ئـەیوبی، کـە حوکمەکـەی لـە ٦٨٣ ك تـا ٦٩٨ کۆچـی بـەردەوام بـوو، شـاری (حەما)ی کۆن و قەڵایەکەی لە ڕۆژئاوای ڕوباری (عاصی) بوو، هەر کە سەیفودین یەحیا داوای زەوی لە پاشـای (حـەما) کـرد، کە خـانووی لـە سـەر بکـەن، هـەندێ زەوی لـە ڕۆژهـەڵاتی ڕوبـاری (عـاصی) دایـێ، کـە هیـچ خـانووی لـێ نـەبوو، پێـی گـوت: ئەمە ئامادەیە (الحــاضر)، ئیـتر ئـەو گەڕەکـەی لـەوێ دروستکرا پێـی گوتـرا گەڕەکی (الحـاضر)، سیف الدیـن یـەحیا لـە ٧٣٤ ك لـە شـاری حەما مـرد،[2] واتـا: دوای مردنی پاشای حەما (ابی‌الفداء)- کە لە ٧١٠ ك تــا ٧٣١ ك حوکمـی کـرد بەسێ ساڵ. خاوەنی کتێبی (قلائد الجواهــر) دەڵێ: سیف الدیـن یـەحیا لـە پشـت دەرگای (ناعورە) بە ئاراستەی تەکیەی قادری[1] نێژراوە. بەڵام ئەوەی من دەیزانم لـە

---

١ قلائد الجواهر، ص ٤٥.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨.

(ناعوره) به ئاراستەی تەكیەی قادری[1] نێژراوە. بەڵام ئەوەی من دەیزانم لە بەرزاییەكەی ژێر كۆشكی (الطيارة الحمراء) و تەكیەی قادری نێژراوە، كە دەكەوێتە رۆژهەڵاتی روباری عاصی.

سیف الدین یەحیا چەند خانویەكی بۆ خۆی و دەست و پێوەندەكەی دروستكرد لەگەڵ تەكیەیەك بە ناوی تەكیەی قادری لە رۆژهەڵاتی روباری عاصی بەرامبەر قەڵاو مزگەفتی نورالدین زەنگی (الجامع النوري) كە دەكەونە رۆژئاوای روبارەكە، ئینجا ئەم خانوانە فراوان بوون و بەدرێژایی ١ - ٢ كیلۆمەتر لە كەناری رۆژهەڵاتی روبارەكە درێژ بوونەوە و بەپانی نیو كیلۆمەتریان هەندێ جار زیاتر، ئەو گەڕەكە گەورەبوو و پێی دەگوترا گەڕەكی گەیلانی یان ئالی گەیلانی، هەر لەو شوێنە پردێ دروستكرا، كە هەردوو رۆخی روبارەكەی بەیەك دەبەستەوە و پێی دەگوترا پردی عبدالقادر، بەڵام خەڵكی گشتی پێیان دەگوت پردی ماڵی شێخ.

لە ساڵی ١١١٣ ك شێخ یاسین، كە یەكێكە لە نەوەكانی سیف الدین یەحیا لە شاری حەما تەكیەی قادری و كۆشكی (الطيارة الحمراء)ی نوێكردەوە كە دەكەوێتە سەرووی گومبەت و ژێرزەمینەكان كە گەڕەكی گەیلانی پێك دێنن، ئەو كۆشكەی بە هەموو جۆرە نەخش و زەخرەفەو كۆڵەگەی رازاوەو حەوزی مەڕمەڕی جوان رازاندەوە، تا بووە توحفەیەكی هونەریی بیناسازیی ئیسلامی كە لە جوانی و رەسەنایەتیدا لە كۆشكی (العظم) باڵاترە كە ئێستا مۆزەخانەیە لە شاری حەما. خۆم گەشتیارەكانم دەبینی كە لە ژێر زەمینی ئەو گەڕەكە و گومبەتەكانی دەگەڕان و سەریان لە ژێرزەمین و گومبەتەكان سوڕمابوو چۆن هەموو بەیەكەوە بەستراون، هەروەها سەریان لە بناغەی كۆڵەگەكانیش سوڕمابوو، كە بەیەكەوە

---

[1] لەو شوێنەی كە خانەوادەی گەیلانی پێی دەڵێن ( جنينة الاموات) كە دەكەوێتە تەنیشت تەكیەی شێخ حوسێن.

بوون.[1]

بەڵام بەداخەوە لە شوباتی ١٩٨٢ گەڕەکەکە و تەکیەکە رووخێنراو ئوتێلی (أفاميا الشام)ی لێ دروستکرا.[2]

١ لە ساڵی ١٩٢٣ میری سووریا وێنەی گەڕەکەکەو تەکیەکەی لەسەر پولێکی پۆستەیی چاپکرد بەنرخی پێنج قروش، لە ١٩٢٥ وەزارەتی دارایی سوریا ئەم وێنەیەی لەسەر پارەیەکی کاغەزی ( ٢٥) قروشی چاپکرد.

٢ مامۆستا ( كامل شحادة) ی چاودێری شوێنەواری پێشووی پارێزگای حەما کتێبێکی چاپکراوی لە بارەی کۆشکی (الطيارة الحمراء ) هەیە.

# بەشی سێیەم

## بڵاوبونەوەی خانەوادەی گەیلانی

رەگی ئەم خانەوادەیە لە بەغدا لە شێخ عبدالقادرەوە شین بووە و دوایی زۆربەی جیهانی ئیسلامی گرتەوە، بە دەگمەن نەبێ و ئەمەش لە ژیانی شێخ عبدالقادرەوە دەستی پێکردووە، پێشتر بینیمان چۆن موسای کوڕی ناردە میسر و شام بۆ خوێندن و لە دیمەشق مرد و لە تەپۆڵکەی جیای (قاسیوون) نێژرا، هەروەها، عیسای کوڕی دوای مردنی باوکی چووە شام و لەویۆە چووە میسر و لەوێ وەفاتی کرد، عبدالعەزیزی کوڕی غەزای عەسقەلانی کردو دوایی لە حیال نیشتەجی بوو و هەر لەوێ وەفاتیکرد، یەحیای کوڕی لە میسر نیشتەجێ بوو و دوایی گەڕایەوە بەغدا.

ئینجا نەوەکانی شێخ عبدالقادر لە هەموولایەك بڵاوبونەوە، سیف الدین یەحیا، کە نەوەی عبدالرزاقی کوڕی شێخ عبدالقادرە لە شاری (حەما) نیشتەجێبوو، لە نەوەی سیف الدین خانەوادەی گەیلانی، کە ئێستا لە (حەما)ن نزیکەی هەزار کەس دەبن، شێخ علاءالدین نەوەی سیف الدین یەحیا چووە میسر و لەوێ نیشتەجێ بوو و لە رۆژی سێشەممەی ٢٤ جیمادی کۆتایی ساڵی ٧٩٣ ك لە قاهیرە مردووە[١]. هەروەها نەوەی سیف‌الدین یەحیا لە وڵاتی شام بڵاوبوونەوە و هەندێکیان لە دیمەشق نیشتەجێ بوون و هەندێکی تریان لە پردی (شغور) و حەلەب و گوندەکانی دیمەشق وەکو (گرد حەنین، هامة، ضمیر و هیتر)، هەندێکیان لە

---

١ قلائد الجواهر، ص ٤٨.

شاری نابلسی فەلەستین نیشتەجێ بوون و بنەماڵەی (زید الکیـــلانی) لەوێ پەیدا بوو، جا لەوێوە هەندێکیان بۆ (عەممان) و جێی تر چوون.[1]

وابزانم بنەماڵەی گەیلانی ئەمڕۆ لە زۆربەی بنەماڵەکانی تر لە جیهاندا بڵاوبۆتەوە و لە هەموو وڵاتە ئیسلامیەکان ناوبانگیان هەیە، لە رۆژهەڵات لە چینەوە تا مەغریب لە رۆژئاوا. لە هیند زانایەکی لێیە بە ناوی (فضل الله الکیـــلاني) کە راڤەکەری کتێبی (الأدب المفرد)ە لە حەدیسی بوخاری، هەروەها (مناظرا حسن الکیلاني) سەرۆکی بەشی ئاینیی پێشوو لە زانکۆی عوسمانی لە حەیدەرئاباد دکن، هەروەها خاوەنی کتێبی (تدویـــن الحدیـــث)ە، ئەحمەد گەیلانی سەرۆکی یەکێ لەگروپە موجاهیدەکانی ئەفغانستانە، شێخ عەلی گەیلانی سەرۆکی لیژنەی پەرلەمانی بەرەی ئیسلامیی یەکگرتوو لە ویلایەتی جامۆ و کەشمیر.

لە نەدوەی رۆڵی راگەیاندنی ئیسلامی لە پشتگیریکردنی جیهادی ئەفغانی، کە لە ئیسلام ئاباد بەسترا، دکتۆر ئیعجازی گەیلانی یەکێ بوو لە بەشداربووەکانی (مجلة الاصلاح عـدد / ١٤٨). مامۆستا ئەسعەدی گەیلانی ئەمڕۆ میری هەرێمی (بنجاب) و ئەندامی پەرلەمانی کۆمەڵی ئیسلامیە لە پاکستان و لە هەشتا کتێب زیاتر دانراوی هەیە (الموسوعة المیسرة للأدیان و المذاهب ص ١٧٦).

لەرۆژنامەی (الاتحاد)ی ئیماراتی لە رۆژی ١٩٨٩/٨/٣ دیاریان کرد بوو، کە عبدالقادری گەیلانی سەرۆکی لیژنەی جێبەجێکردنی بەرەی رزگاریی ئەریتیریە. سەرەڕای ئەوانەی کە لە بەغدا و حەماو دیمەشق و عەممان و میسرو سوودان و شوێنی تر هەن.

هەندێ لە لقەکانی بنەماڵەی گەیلانی ناویان گۆڕاوە و بەناوی تر دەناسرێن، وەکو ئەو شوێنەی کە لێی دەژین، یان نیسبەت بەو باپیرەی کە لە نیشتمانی رەسەنی

---

١ ئێستا شوباتی سالی ١٩٩١ وەزیری ئەوقافی ئوردن دکتۆر ئیبراهیم زەیدی گەیلانییە، چەند سالێك لەمەوبەر وەزیری تەندروستی لە ئوردن دکتۆر فوئادی گەیلانی بوو.

کۆچی کردووەوە بەو شوێنەوە ناسراوون، یـان بـەپێی ڕووداوێکـی دیـاریکراو، کـە کاریگەریی لەسەر کاروانی ژیانی ئەو لقە بنەماڵەیە هەبووە. بنەماڵەی (ظبیـــان و بحرة) لە دیمەشق لە بنەڕەتدا گەیلانین، بنەماڵەی زەیـد لـە نـابلس گەیلانییـە، تا شێخ یونسی سامەڕایی لـە کتێبەکـەی (عبدالقـادر الکیلانـي) باسـی نـاوێکی زۆر لـەو بنەماڵەو هۆزانە دەکا کە لە نـەوەی شێخ عبدالقـادری گـەیلانین و ئەمـەش نیسبەت دەداتـە کتێبـی (تأريخ العـراق بين احتلالـين) و کتێبـی (عشـائر العـراق)، کـە لـە دانراوی (عباس العزاوي)ن، وەکو: هۆزی بوجەمعە لەنەوەی شێخ عیسای کوڕی شێخ عبدالقادرە، هۆزی (حەداحیدە) لـە نـەوەی عبدالرزاقـە، هـۆزی (حـەیالیین) و (عەبایچی) لە نـەوەی عبدالعزیـزن، ابوالحسـن البکـر، ابوالحمـد البکـر، البوغنیمـە، البـوجاسـم، البوغـانم، مطالکـــة، عەشارات، ئاغایەکانی موسڵ، ئـالی ئالوسـی لـە تکریت، ئالی قازی لە تکریـت، ئـالی شێخ عـەبدان لـە لیـوای دیالـە... هتد. ئەوانـە هەموویان لەنەوەی شێخ عبدالقادری گەیلانین.

ئەم بڵاوبوونەوە زۆرەی بنەماڵـەی گـەیلانی و مانـەوەی نـاوی گـەیلانی زیـاتر لـە (٨٥٠) ساڵ، تاکو ئێستا و شانازی کردنـی زۆرکـەس، ئـەو نـاوە لـە خۆیـان بنێـن، هەمووی بەڵگە و نیشانەی ئەوەیە کە شێخ عبدالقـادری گـەیلانی(ڕەحمـەتی خـوای لێبێ) پیاوێکی چاك و دڵسۆز و ڕاسـتگۆ و خۆشەویستی خـوا بـوە، خـوای گـەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆشەویست وادەکا هەموو کەسی خۆشیان بـوێ، گومـانی تێـدا نییە کە شێخ ڕەحمەتی خوای لێبێ لە خوا دەپاڕایەوە و دەیگوت:

﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ: ئەی پەروەردگارم فێرم بکە تا شوکری ئەو نیعمەتەت بکەم کە بە من و بـاوك و دایکمـت داوە و کاری چاك بکەم کە پێی قایل بێت ومنداڵەکانی منیش چـاك بکـە، بەڕاستی من بۆ لای تۆ گەڕاومەتەوەو بەراستی لە خۆ بەدەستەوە دەرانم.﴾[1]

---

١ الاحقاف / ١٥.

# بەشی چوارەم

# قوتابیەکانی شێخ عبدالقادر

مامۆستا محەممەدی عەینی لەکتێبەکەی (عبدالقادر الکیـــلانی) باسیکردووە، کە هەموو ساڵێ سێ هەزار قوتابی و مورید لە قوتابخانەو تەکیەکەی شێخدا دەرچوون، لـە ماوەی سیو ساڵ وانـە گوتنـەوەدا دەبێ نزیکی سـەد هـەزار قوتـابی و موریـد دەرچووبن.

ئـەم قوتـابی و موریدانـە لـە سەرانسـەری جیـهانی ئیسـلامی بڵاوبوونـەوە وەکـو بانگبەر(دعاة) و رابەر و چاکخواز، مێژوو ناوی زۆربەیانی نەپاراستووە، چونکە لە ژماردن نایەن، بـەڵام نـاوی هـەندێکیانی پاراستووە وەکو: ابیالفتح نەسر کـوڕی مونا، کە دوای مردنی شێخ عبدالقادر بـووە شـێخی حەنبەلییـەکان، ئەحمـەد کـوڕی ئەبی بەکر کوڕی موبارەك ابیالسعوود الحریمی، ئەلحەسەن کـوڕی موسـلیم ئـەوەی کە تەکیەکەی لە شـاری قادسییە بـوو، مـەحموود کـوڕی عوسمـان کـوڕی مـەکاریم النعال ئەوەی کە سەر پەرشتیاریی تەکیەی شـێخی دەکـرد لەبـەغدا، عومـەر کـوڕی مەسعودی بەزاز ئەوەی کە گەلێك لە (ممـــالیك)ەکـانی خەلیفـەی لـە سـەر دەسـتی تۆبەیان کرد، عبداللە ی الجبائی لە گوندی (الجبة) لە لوبنان، دیان بوو، بەدیلی برایە دیمەشق و موسڵمانبوو، زین الدیـن عـەلی کـوڕی ئیـبراهیم کـوڕی نـەجای یـەکێ لـە یارانی شێخ لە بەندی رزگاری کرد و بۆ شێخی ناردە بەغدا لە ساڵی ٥٤٠ کۆچـی بۆ خوێندن و فیقە فێربوون، لەگەڵ شێخ مایەوە، تا مردنی شێخ، ئینجا بووە هـاوڕێی موفق کوڕی قودامەی خاوەنی (المغني)، ئینجا چووە

(ئەسفەهان) و لەوێ وانەی گوتەوە و فتوای‌دا، تا ساڵی ٦٠٥ ك وەفاتیکرد، حامید کوڕی مەحمودی حەرانی ئەوەی کە پەیوەندیی بە نورالدین مەحمود زەنگی کرد و کردیە قازی و لێپرسراوی سکاڵای خەڵکی و لەشاری حەران وانەی گوتەوە، زین الدین کوڕی ئیبراهیم کوڕی نەجای ئەنساریی دیمەشقی، لە قوتابخانەی شێخ لە بەغدا وانەی گوتەوە، ئینجا چووە دیمەشق و میسرو پەیوەندیی بە صلاح الدینی ئەییوبی کردو بووە راوێژکاری، تا ناوی لێنا بوو: عەمری کوڕی عاس-رەزای خوای لێ بێ-.

باوکی موفق الدین کوڕی قودامە، موفقی کوڕی نارده بەغدا بۆ خوێندن لە قوتابخانەی شێخ عبدالقادر، خۆی کوڕی پوری حافظ عبدالغنی کوڕی عبدالواحدی مەقدیسی چوون، ئیبن قودامە دەڵێ: ((من و حافظ عبدالغنی جلی صۆفیگەریمان لەیەك کات لە بەرکرد لە سەر دەستی شێخ عبدالقادر و فیقهمان لای خوێند و گوێمان لێی گرت و سوودمان لە هاوڕێیەتیی بینی.[1] شێخ ئێمەی لە قوتابخانەکەی خۆی نیشتەجێ کرد و گرنگی پێمان دەدا، جاری وا هەبوو یەحیای کوڕی دەنارد و چرای بۆمان دادەگیرساند، هەروەها جاری وا هەبوو لە ماڵی خۆیەوە خواردنی بۆ دەناردین، نوێژە فەرزەکانی لەگەڵمان دەکرد و دەبووە ئیمام، بەیانیان لە کتێبی (الخرقي)ی بۆ دەخوێندینەوە لە ناو کتێبەکە، مانگێك و نۆ رۆژ لای ماینەوە ئینجا وەفاتیکرد.[2]

موفق الدین کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی قودامە لە هەرێمی قودس بوو لە فەلەستین، لە شەعبانی ساڵی ٥٤١ کۆچی لە دایکبووە و لە ساڵی ٥٦١ ك لەگەڵ کوڕی پووری (عبدالغنی) چووەتە بەغدا و گوێیان لە شێخ عبدالقادر و لە هبةاللّٰەی دەقاق و ابن البطی و ئەبی‌زەرعە کردووە و لە فیقهی حەنبەلی دوای ئەوەی کتێبی (المغني في شرح الخرقي)ی داناوە لە فیقهی حەنبەلی دوای ئەوەی گوتەی

---

١ قلائد الجواهر، ص ٦.

٢ سير اعلام النبلاء للذهبي، ج ٢٠، ص ٤٣٩.

موجتـەهیدەکانی مەزهەبـەکانی تـری هێناوەتـەوە و بەڵگـەی هەریەکـەیانی دیـاریکردووە، ئـەم کتێبـە گـەورەترین و فراوانـترین و بەسـوودترین کتێبـی فیقـهی بەراوردە و لە نۆ بەرگدایە.

هـەروەها لـە قوتابیـەکانی شـێخ ئەحمـەد کـوڕی موبـارەکی مەرقـەعاتی و محەمـەد کوڕی فەتحی هیڕەوی بوون کە هەردوو کیان سەر پەرشتیی قوتابخانەکەیان دەکرد،[1] ئەبوفەتحی هیڕەوی سەرەڕای ئەمە سـەر پەرشتیی خزمـەتکردنی شێخیشـی دەکـرد و دەیگـوت: ((چل ساڵ خزمەتی بەڕێز شـێخ عبدالقـادرم کـرد و لـەو ماوەیـەدا نوێـژی بـەیانیی بەدەسـتنوێژی عیشـای دەکـرد، ئەگـەر دەسـتنوێژی نەمابوایـە یەکسـەر دەستنوێژی هـەڵ دەگرتـەوەو دوو ركعات نوێـژی سـوننەتی دەکـرد، کـە نوێـژی عیشای دەکرد دەچووە خەڵوەتگاکـەی خۆیـەوە و کەسی لەگـەڵ نـەدەچوو و لێـی نەدەهاتە دەرەوە، تا کاتی بەیانی دان)).[2]

لە قوتابیەکانی شێخ شوعەیب ئەبومەدیەنە، کە لـە (تەلمەسـان) نێژراوە و شـێخی مەغریبـە، ئەبوعـەمر عوسمـان کـوڕی مـەرزوق کـوڕی حـەمید کـوڕی سـەلامەی قورەیش، کە لە میسر دابەزیوە وشێخی ئەوی بـووە، شـێخ عبدول قـادر لـە حـەجدا لەگەڵ هەردوو کیان کۆبۆتەوە و ئەو شێخانە لە دێرزەمانەوە مانگـە بـە ژمارەکانیـان لە حەج بە سەر دەبرد، هەردو کیان فیقـهیان لای شێخ عبدالقـادر خوێنـد و گوێیـان لەوگرت.

عبدالرزاقـی کـوڕی (رەحمـەتی خـوای لێبێ) دەڵێـت: ((لـەو ساڵەی کـەباوکم چووە حەج و من لەگەڵی بووم، هەردوو شێخەکان ئیـبن مـەرزوق و ئەبومەدیـەن لـە گەڵی کۆبوونـەوە و پۆشاکی بەرەکـەتیان-ئەمـە ئاماژەیـە بـۆ بەیعـەتکردن- لـەوەوە لەبەرکرد و بەڵێنی پابەندبونیان داو -گوێیان لە بەشێك لە ریوایەتەکانی گرت و لـە بەردەستی دانیشتن و شـێخ سـەعد کـوڕی شـێخ عوسمـانی کـوڕی مـەرزوقی نـاوبراو

---

[1] هكذا ظهر جيل صلاح الدين، د. ماجد عرسان الكيلاني، ص ١٦٣.
[2] قلائد الجواهر، ص ٧٦.

دەیگوت: باوکم (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەیگوت: عبدالقادری شێخمان ئاواو ئاوای فەرموو، شێخ عبدالقادری گەورەمان بینی وای دەکرد، گوێم لە مامۆستامان ئەبومحەممەد عبدالقادر بوو وای دەگوت، ئیمامی پێشرەومان شێخ عبدالقادر ئاوای دەکرد)).[1]

خاوەنی (قلائد الجواهر)[2] باسی لیستێکی درێژی قوتابیەکانی شێخ عبدالقادر دەکات، لەوانە: ئیمامی زانا قازی ابویعلی محەممەد کوڕی محەممەدی فەڕاء، شێخ ئەبوعەمر عوسمان کە بەشافیعی سەردەمی خۆی بە ناوبانگ بوو، شێخی زانا ڕەسلان کوڕی عبداللە کوڕی شەعبان، قازی عبدالملك کوڕی عیسا کوڕی هەرباس، برایەکەی عوسمان و کوڕەکەی عبدالرحمن و عبدالکریمی سەمعانی فەرموودەناسی خوراسان و یوسف کوڕی هبةالله دیمەشقی و گەلێکی تریش. ئەمەو سەرەڕای هەموو مندالەکانی، کەلای ئەویان خوێندووەو گوێیان لە ژیانی شێخ و هەندێکیان دوای وەفاتکردنی.

---

١ قلائد الجواهر، ص ٥.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٥ ٦.

# بەشی پێنجەم

## قوتابخانەکەی شێخ عبدالقادر دوای مردنی

دەوڵەمەندەکان قوتابخانەی ئەبی سەعیدی مەخرەمییان کڕی، کە مامۆستای شێخ عبدالقادر بوو، قوتابخانەکە لە گەڕەکی (باب الازج) بووە، دوایی ناوی لێنرا گەڕەکی (بـــاب الشـــیخ) بە نیسبەتی شێخ عبدالقـادری گەیلانییـەوە، دووبـارە قوتابخانەکە بە پارەی دەوڵەمـەندەکان و کـاری هـەژارەکان بنیـات نرایـەوە و فـراون کرا و درایە دەست شێخ عبدالقادر لـە سـاڵی ٥٢٨ ك. شێخیش دابەشیکردە سەر قوتابخانەیەك بۆ خوێندنی قوتابیان و تەکیەیەك بۆ پەروەردەی موریدان، دوای ئەوەی شێخ لـە ٥٦١ ك وەفـاتیکرد منداڵـەکانی وازیـان لـە قوتابخانەکـە نەهێنا و بـەردەوام وانەیان تێدا دەگوتەوە:

عبدالجباری کوڕی تا مردنی لە ٥٧٥ ك وانـەی تێـدا دەگوتـەوە، هـەروەها شێخ ئیبراهیمی کوڕی تـا سـاڵی مردنـی لـە ٥٩٠ ك، شێخ عبدالوهـاب تـا سـاڵی مردنـی ٥٩٣ ك، شێخ عبدالرزاق تـا سـاڵی مردنـی ٦٠٣ ك وانـەیان تێـدا دەگوتـەوە. ئینجـا نـەوەکانی وانـەیان تێـدا دەگوتـەوە، لەوانـــە: شـــێخ عبدالســـلام کـــوڕی شـــێخ عبدالوهـاب، شێخ نەسر قـازی قازیـەکان کـوڕی شـێخ عبدالـرزاق و جگـە لـەو دوانەش. مزگـەفتێکیان بـۆ نوێـژ دروستکرد، کـە بـە قوتابخانەکـەوە لکـا بـوو و بـە مزگەفتی حەفت گومبەت ناسراو بوو.

هەر کە هۆلاکۆ و تەتـەر لـە سـاڵی ٦٥٦ ك بەناو بـەغدا وەربـوون گـەلێکیان لـە بنەماڵـەی گـەیلانی کوشـت و قوتابخانـە و مزگەفتەکـەیان تێکـدا، دوای نـــەمانی

مەترسیی تەتەرەکان دووبارە بنیات نرانەوە، لە سالّی ٩١٤ ك هەر کە شا ئیسماعیلی صەفەوی بەغدای گرت قوتابخانە و مزگەفتەکەی رماند، کە سولەیمان قانونیە سولّتانی عوسمانی لە رۆژی دووشەممەی (٢٤) ی جیمادی یەکەمی سالّی ٩٤١ ك بەغدای وەرگرتەوە فەرمانی دا دووبارە بنیات بنرێتەوە و تەکیەکەیش لە تەنیشت مزگەفتێ بۆ هەژاران دروست بکرێ، سینان پاشا دەستی بە بنیاتنانی مزگەفتەکە کرد، بەلاّم پێش تەواو کردنی مرد، جا عەلی پاشای والیی بەغدا لە سالاّنی ٩٩٠ ك تەواویکرد.

ئەوی شایانی گوتنە هەرکە (ابن بطوطة) لە ٧٢٧ ك سەردانی بەغدای کرد، لەو کاتە سەعید خانی نەوەی هۆلاکۆ فەرمانڕەواییی بەغدای دەکرد، ناوی هەندێ گۆڕ و زیارەتگای هێناوە لە کتێبەکەی، بەلاّم ناوی گۆڕی شێخ عبدالقادری نەهێناوە، ئەمەش بەلّگەی ئەوەیە کە قوتابخانە و تەکیەکە هێشتا کەلاوە بوونە.[1]

لە سالّی ١٠٣٣ ك هەرکە سەفەویەکان بەسەرکردایەتیی شاعەباسی یەکەم دووبارە بەغدایان گرتەوە قوتابخانەو مزگەفتەکە تووشی ڕمان بوونەوە لە ١٦٢٣ زایینی، کە سولّتانی عوسمانی مرادی چوارەم لە سالّی ١٠٤٨ ك / ١٦٣٨ زایینی سەفەویەکانی دەرکرد، دووبارە ساختمانەکەی نوێکردەوە لە ژێر سەر پەرشتێتیی موفتی گەورە (يحيى)، هەروەها مزگەفتی ئەبوحەنیفەشی دووبارە تازەکردەوە.

لە سالّی ١١٣٩ ك ئەحمەد پاشای والی بەغدا هەیوانەکەی مزگەفتی گەیلانی نوێکردەوە، لە سالّی ١٢٨٢ ك سەید عەلی گەیلانی نەقیبی پیاوماقوولاّن هەیوانە گەورەکەی تەنیشت حەرەمی خستە سەر، لە ١٢٩٧ ك سەید سەلمانی گەیلانیی نەقیبی پیاو ماقوولاّن منارەکەی دەرگای رۆژئاوای مزگەفتەکەی نوێکردەوە، لە سالّی ١٣١٧ ك سەید عبدالرحمن گەیلانی نەقیبی پیاوماقلاّن کاتژمێرێکی دروستکرد بۆ کاتەکانی نوێژ، کە لە بەرزیدا سەری لە هەور دەدا، هەروەها حەوزێك بۆ دەستنوێژ و هەیوانێك و قاتی سەرەوەی ژوورەکانی قاتی یەکەمی

١ عبدالقار الكيلاني، محمد العيني، النسخة الفرنسية، ص ٩٠.

دروستکرد،[1] ئەحمەدی سێیەم (١٧٠٣زایینی) کە سولتانی عوسمانی بیست و سێیەمین بوو فەرمانی دا، کە دوو قوتابخانەی تر دروست بکرێن و بخرێنە سەر ساختمانە کۆنەکە بۆ ئەوەی قوتابیان تیایاندا بخوێنن و موریدەکان لە ناوی بنوون و بە خۆرایی نان بخۆن. (کتێبی محەممەد عەینی، ل ٩٢).

لەو کاتەی سولتانی عوسمانی سولەیمانی قانونی لە ٩٤١ ك هاتە بەغدا، شێخ زین الدینی گەیلانی، کە نەوەی شێخ عبدالعزیزی کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی بوو کردە نەقیبی پیاوماقولانی بەغدا، ئەمەش وەرگێڕانی فەرمانی دامەزراندنەکەیە:

((جێی شانازیی سەیدە بەڕێزەکان شێخ زین الدینی گەیلانی، دوای سڵاوێکی زۆر، ئێمە نەقیبایەتیی پیاوماقوڵانی بەغدای پارێزراومان بە ئێوە سپارد و دەسەڵاتمان دانێ کە لایەنگیری بەڵگەنامەی سەیدە نەسەب راستەکان بکەن. هیواداریـن لەم بارەیەوە درێغی نەکەن بۆ ئەم خزمەتانە، دەبا نیشانەمان کارکردن بێت. لە بیستی رەمەزانی ساڵی ٩٤١ کۆچی لە بەغدای پارێزراو نووسرا)) سولتانی غەزاکەر سلێمان خانی قانونی.[2]

لەو کاتەوە نەقیبایەتیی پیاوماقوڵانی بەغدا لە نەوەی شێخ عبدالعزیزی کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانییە تا ئێستا، جگە لە ماوەیەکی کورت کە یەکێ لە نەوەکانی شێخ عبدالرزاقی کوڕی شێخ عبدالقادر بووە نەقیبی بەغدا.

ئەوانەی لە شاری حەمان: شێخ ئیبراهیمی کوڕی شێخ شرف الدین کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ عەلی هاشمی گەیلانی، شێخ عبدالرزاقی برای شێخ ئیبراهیمی ناوبراو لە هەمان کاتدا نەقیبی پیاو ماقوڵانی شاری حەما بوو.[3] ئەم شێخ ئیبراهیمە لە شاری حەما چەند مزگەفتێکی دروستکردووە، لەوانە دوو مزگەفتن کە

١ عبدالقادر الكيلاني، الشيخ يونس السامرائي، ص ٤٢ و دوای ئەوە بە دەستکارییەوە.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩.

٣ الموجز في تأريخ القطب الغوث للاستاذ فخري الكيلاني، ص ١٦.

بە ناوی خۆیەوەن. یەکێکیان مزگەفتی شێخ ئیبراهیم لە گەڕەکی گەیلانیە لە (الحاضر)، ئەویتر مزگەفتی شێخ ئیبراهیم، کە دەکەوێتە سەرەتای سەرووی بازاڕی درێژ لە حەماو قوتابخانەیەکی زانستە شەرعییەکانی تێدایە.

ئێستا دوو نەقیبی پیاوماقوڵان لە بەغدا هەن، یەکێکیان سەید یوسف کوڕی سەید عبداللە ی گەیلانی و سەید ئەحمەد مەحمود حسام الدینی گەیلانی.[1] بەڵام دوا نەقیبی پیاوماقوڵان لە حەما شێخ محەمەد مورتضیی کوڕی شێخ ساڵحی گەیلانی بوو، کە لە ساڵی ١٩٦٩ ز. مردووە، ئینجا نەقیباتیی پیاوماقوڵان لە سوریا هەڵوەشێنرایەوە، لەگەڵ ئەوەی گەیلانیەکانی حەما لە نەوەی شێخ عبدالرزاقی کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی بوون-رەحمەتی خوایان لێ بیت-.

---

١ عبدل القادر الكيلاني، الشيخ يونس السامرائي، ص ٤١.

# بەشی شەشەم

## گوتەی زانایان لەبارەی شێخ عبدالقادر

شێخ عبدالقادری گەیلانی هەموو سیفەتێکی چاك و تەقواو خۆپارێزیی لە خۆی کۆکردبوویەوە، بۆیە هەموو زانا کۆن و نوێیەکان ستایشی دەکەن و ڕێزی دەگرن، چونکە صۆفیگەریی خستبووە ژێر فیقهو لە هەموو لادان و شەتەحات و کۆلەڕێییەك رزگاری کردبوو، تەنیا زانایەکی کۆن نەبێ کە ابن الجوزیە لەم کۆمەکییە دەرچوو، رەخنەی لە شێخ عبدالقادر دەگرت، دەڵێن کتێبێکی داناوە و لەزۆر ڕووەوە رەخنە لە شێخ دەگرێ بەبیانووی ئەوەی گوایە لە ژیانی پیاوچاکانی پێشین لاداوە و وەکو حەسەنی بەسری نییە.[1] لەگەڵ ئەوەی کە ابن الجوزی لە هاوچەرخەکانی شێخ عبدالقادر بووە، لە ساڵی ٥٠٧ك. یا ٥١١ك. لە دایك بووە و لە شەوی هەینی (٢٣)ی رەمەزانی ساڵی ٥٩٧ك. مردووە. بەڵام هەروەك دەڵێن هاوچەرخی پەردەیە. ابن الجوزی لای وەزیر عون الدین یەحیای کوڕی هەبیرە فێری خوێندن بووە، کە وەزیری (القائم بأمر الله و المستنجد بالله) بوو، وەزیر ئیبن هەبیرە هاوڕێی شێخ عبدالقادر بووە و ڕێزی گرتووە و دیاریی بۆ ناردووە، جا چۆن قوتابی ڕێزی مامۆستاکەی ناگرێ و بەگەورەی نازانێ ؟!

گەلێ لە نووسەرە کۆنەکان رەخنەیان لە ابن الجوزی گرتووە، چونکە بە نووسینەکانیدا نەدەهاتەوە بۆیە دانراوەکانی هەڵەی زۆریان تێدەکەوت، هەروەها

[1] الذیل علی طبقات الحنابلة، لأبن رجب تحت رقم / ١٣٤.

ڕەخنەیان لێدەگرت چونکە ستایشی پیاوە گەورەکانی دەکرد و خۆی لەسەر هەژارەکان هەڵدەکێشا و دەعوای زۆر بوو. ئیبن قودامەی مەقدیسی لە بارەیەوە دەڵێت: ئێمە لە نووسینەکانی سوننەتی قایل نەبووین و ڕێبازەکەیشمان پێ چاك نەبوو.[1]

موفق الدینی کوڕی قودامەی مەقدیسی خاوەنی (المغـــــني) لەبارەی شێخ عبدالقادرەوە دەیگوت: ((کە لە سالی ٥٦١ك. هاتینە بەغدا سەرۆکایەتیی لە زانست و کردەوە و حاڵ و فتوا وەرگرتبوو، لەبەر ئەوەی شێخ هەموو زانستەکانی دەزانی و سینگی فراوان و چاوتێرو زۆر بەئارام بوو لەگەڵ قوتابییەکانی، بۆیە قوتابیەکان لەو زیاتر بۆ لای کەسیتر نەدەچوون. خوای گەورە زۆر سیفەتی جوان و حاڵی پیرۆزی لەودا کۆکردبوویەوە و لە دوای ئەو کەسم وەکو ئەو نەدیت. کەسم نەدی هەندی ئەو کەرامەتی لێ بگێڕنەوە و کەسم نەدی هەندی ئەو لەبەر ئایینەکەی خەڵکی ڕێزی بگرێ)).[2]

شێخ عزالدینی کوڕی عبدالسلامی شێخی شافیعی دەڵێت: کەرامەتی هیچ شێخێ لە گێڕانەوەی دەماو دەم (تواتر) بەقەد کەرامەتەکانی شێخ عبدالقادر تەواتوری تێدا نەبووە.[3]

محب الدین عبدالله ی کوڕی نەجار لە مێژووەکەیدا دەڵێ: ((عبدالقادر کوڕی ئەبی سالحی جەنگی دۆست خەڵکی گەیلانە، یەکێکە لە کەڵەئیمامان، خاوەنی کەرامەتی دیارە، یەکێك بوو لەوەلییە موجتەهیدەکان و لەو شێخانەی کە لە کاروباری ئایین بۆی دەگەڕانەوە، یەکێك بوو لە ئیمامە موسڵمانە زاناو کاراکان)).[4]

---

١ ذيل الطبقات لأبن رجب، ترجمة ابن الجوزي.

٢ قلائد الجواهر، ص ٦، ٧ .

٣ الذيل على طبقات الحنابلة لأبن رجب تحت رقم/١٣٤، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢٠، ص٤٤٣.

٤ لە كتێبی ( تكملة اكمال الاكمال في الانساب و الاسماء)، وەرگیراوە بە ژمارە /٣٧٧.

ئەبو سەعد عبدالكريمی سەمعانی گوتويەتی: عبدالقادر ئەبومحەممەد خەڵکی گەيلان و ئيمام و شێخی حەنبەلييەکان بوو لە سەر دەمی خۆی، شەرعزان و پياوچاك و ديندار و خێرکەرو زيکر زۆر و هەميشە بيری دەکردەوە و فرمێسك خێرابوو.. خەڵکی بە تەواوی بڕوايان پێی هەبوو، سوودیان لە قسە و ئامۆژگاری وەردەگرت و ئەهلی سوننەت بە دەرکەوتنی ئەو سەرکەوتن.

شێخی ئيسلام شهاب الدين ئەحمەد کوڕی حەجەری عەسقەلانی گوتوويەتی: ((شێخ عبدالقادر بە ياساکانی شەريعەتەوە پابەند بوو، داوای لە خەڵکی دەکرد بۆ پابەند بون پێی و لەوانە هەڵدەهات کە دژی شەريعەت بوون، خەڵکی خەريکی کارکردن بەشەريعەت دەکرد، لەگەڵ پابەند بوونی خۆی لە خواپەرستی و موجاهدە، ئەمەشی تێکەڵی هەندێ شت کرد بوو، کە مرۆڤ لە خواپەرستی دووربکاتەوە وەکو ژن و منداڵ، هەرکەسێ ئەمە ڕێگەی بێ لە هيتر کاملترە، چونکە ئەمەسيفەتی خاوەنی شەريعەتە (محمد)ﷺ))[1].

ئيبن رەجەب لە (طبقات)ەکەيدا دەڵێ: عبدالقادر کوڕی ئەبی سالحی گەيلانيی بەغدايی زاهيد، شێخی سەردەم و پێشڕەوی خواناسان و سولتانی شێخەکان و گەورەی ئەهلی ڕێباز، زيندوکەرەوەی ئايين بۆ خەڵکی دەرکەوت و پێی قايلبوون، ئەهلی سوننەت بە دەرکەوتنی سەرکەوتن و بيدعەچی و ئارەزووپەرستان شەرمەزاربوون، حاڵ و گوتەو کەرامەت و پێشبينيەکانی ناوبانگيان دەرکرد و لە هەموو لايەوە فتوای بۆ دەهات، خەليفە و وەزير و پاشا و خەڵکی تر سامیان لێی دەکرد.

ئيمام حافظ ابوعبدالله محەممەدی کوڕی يوسفی ئيشبيلی لە کتێبی (المشيخة البغدادية)دا دەڵێت: عبدالقادری گەيلانی شەرعزانی حەنبەلی و شافيعی و شێخی هەردوو لايان لە بەغدا، هەموو زانا و هەژار و خەڵکی گشتی پێی قايل بوون، يەکێکە لە کۆڵەگەکانی ئيسلام، خەڵکی تايبەت و گشتی سوودیان لێی بينيوە،

---

١ قلائد الجواهر، ص ٢٣.

نزاکانی گیرا بوو، خێرا فرمێسك بوو، هەمیشە لە یادکردن دابوو، زۆر بیری دەکردەوە، دڵی نەرم بوو، ڕووخۆش بوو، دەست و نەفس بەخشندەبوو، زانیاریی زۆربوو، ئاکاری چاك بوو، ڕەچەڵەك پاکبوو، لە خواپەرستی و ئیجتیهاد دەستێکی باڵای هەبوو.[1]

حافظ عمادالدین بن کثـــیر لە مێژووەکەیدا دەڵێ: شێخی زیندووکەرەوەی سوننەت و ئایین عبدالقادر کوڕی ئەبی ساڵحی گەیلانی، هاتە بەغدا و گوێی لە حەدیس گرت و خۆی پێوە خەریك کرد، تا تێیدا سەرکەوتو بوو. دەستێکی باڵای لە حەدیس و فیقهو ئامۆژگاری و زانستەکانی حەقیقەت هەبوو، ڕێبازێکی چاکی هەبوو، بێدەنگ بوو بێجگە لە فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە، بە ئاشکرا و لە پێش چاوی خەڵکی و لە سەرمینبەر و کۆڕ و کۆبوونەوەکان فەرمانی بەخەلیفە و وەزیر و دەسەڵاتدار و قازی و خەڵکی تایبەت و گشتییەکان دەکرد، کە فەرمان بە چاکە بکەن و نەهی لە خراپە بکەن، لەسەر خوا گوێی لە سەرزەنشتی کەس نەبوو، زوهدێکی زۆری هەبوو، کۆمەڵێ حاڵی لە سروشت بە دەری هەبوو، خاوەنی پێشبینی بوو، بەگشتی یەکێ بوو لە شێخە مەزنەکان، خوا نهێنی پیرۆز کات و گۆڕی پڕ نور بکات.[2]

شێخ حەسەنی قضیب البان کە شێخی موسڵ و یەکێك بوو لە هاوچەرخەکانی شێخ عبدالقادری گەیلانی، گوتوویەتی: ((شێخ عبدالقادر ڕەحمەتی خوای لە سەر بێ سەرۆکی کاروانی خۆشەویستانی خوا بوو، پێشڕەوی ڕێبوارانی ڕێی خوا بوو، ئیمامی ڕاستگۆیان بوو، بەڵگەی خواناسان بوو، لەو کاتەدا پێشەوای نزیکەکانی خوا بوو)).[3]

ئیمامی زانا ابوالعباس ئەحمەد کە بە ئیبن فضـــل الله بەناوبانگ بوو لە کتێبی

---

١ قلائد الجواهر، ص ٧.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٦.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢.

(مسـالك الأبصـار)دا گوتوویـەتی: ((شێخ عبدالقادری کوڕی ئـەبی سـاڵحی گەیلانیی حەنبەلی، ئاڵای وەلییەکان، زیندووکـەرەوەی ئایین، گـەورەی گروپێك، کە بەرۆژ لە خواپەرستی سارد نەدەبوونەوە و بەیانیان دوای لێبووردنیـان لـە خوا دەکرد.. کۆڕەکەی پڕ گریان بوو و یاران لەوێ جوولانەوەیان تێدەکـەوت، تۆ کـە شاخ دەبینی وا دەزانی بێ جووڵەیە، کەچی وەکو هەور لە ڕۆیشتندایە.. بە تـەواوی پشتی بە خوا بەستبوو)).[1]

ئیمامی فرەزان شێخ عفیف الدین ئەبومحەممەد عبدالله ی کوڕی سەعدی یـافیعی یەمەنی ئینجا مەکی شـافیعی لـە مێژووەوکـەیدا دەڵـێ: ((گـەورەپیاوی وەلییـە بەڕێزەکان، شێخی ئیسلام و موسڵمانان، روکنی شـەریعەت و ئـاڵای تەریقـەت.. شێخی شێخەکان، شێخی وەلییە خواناسە بەرزەکان ئەبومحەممـەد عبدالقـادر کـوڕی ئەبی ساڵحی گەیلانی خوا نهێنیی پیرۆز کا و گۆڕی پڕ نـوور بکـا، خۆی بـە خشڵی زانستەکانی شەریعەت ئارایشت داو بە تاجی هونەرەکانی ئایینی خۆی رازانـدەوە و بـووە خـاوەنی چاکـترین رەوشـت و مـەزنترین ئاکـار.. بە پێی دەقـەکانی قورئـان و فـەرمووده بـووە دوانـدەری خـەڵکی، داوای موسـڵمانانی بـۆ خواکـرد و بـە پەلـە گوێڕایەڵییان کرد ... گەو هەری یەکخواپەرستیی لـە گێژەنـی دەریـای زانستەکان نیشـاندا، نەفسـەکانی لـە نەخۆشـییەکانی رزگـار کـرد و چارەسـەریی خـەیاڵ و ختوراتـی دڵـی کـرد.. چـەندەها تاوانبـاری بـۆ خـوا گـەڕاندەوە.. گـەلێ لـە شەرعزانەکان بوونە قوتابی ئەو.))[2]

شێخ محیی‌الدینی نەوەی لە کتێبی (بستان العارفین)دا گوتوویـەتی: ((ئـەوەندەی زانا بە قادارەکان کەرامەتی وەلییەکانیان گێڕاوەتەوە هێشتا لە زۆریـدا نەگەیشتۆتە رادەی کەرامەتەکانی شـێخ عبدالقـادری گـەیلانی، شـێخی زانایـانی شـافیعی و زانایـانی حەنبـەلی بـووە لـە بـەغدا، لـە کـاتی خۆی سـەرکردایەتیی زانسـت بۆ ئـەو

1 قلائد الجواهر، ص ١٣٥.

2 سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٦.

ماوەتەوە، گەلێ لە زانایان لە سەر دەستی ئەو دەرچوون، زۆربەی شێخەکانی عێراق سەر بەو بوون، گەلێ کەسی پایەبەرز، کە لە ژماردن نایەن قوتابی ئەو بوون، هەموو شێخ و زانایەکان کۆك بوون لەسەر ڕێزگرتن و شکۆمەندیی ئەو و گەڕانەوە بۆ گوتەکانی و گوێڕایەڵیی بڕیارەکانی، موریدان لە هەموو کون و کەلەبەرێکی دوورەوە بۆی هاتن، سیفەتەکانی جوان و ئاکاری پیرۆزو بەویژدان و ئەدەب کامل بوو، زۆر بێ فیز و هەمیشە ڕووخۆش و فرەزانست و هۆش بوو، زۆر پابەندی شەرع و فەرمانەکانی بوو، ڕێزی زانست پەروەران و دیندار وسوننەت پەروەرانی دەگرت، قینی لە بیدعەچی و ئارەزوو پەرستان بوو، ڕێبوارانی خوای خۆش دەویست، هەمیشە لە کۆشش و چاودێریکردنی مردن دابوو، لە زانستەکانی خواناسیدا بۆ چوونی بڵاو بەرزی هەیە، گەر قەدەغەکانی خوا بشکێنرابایە زۆر تووڕە دەبوو، دەست و نەفسی بەخشندە بوو، بەگشتی لە سەردەمی خۆی هاوتای نەبوو، ڕەزای خوای لێ بێت))[1].

شێخ ابوالعباس ئەحمەدی کوڕی ابی‌الحسن عەلی روفاعی (٥٠٠ ك - ٥٧٨ ك)- لە نەوەی ئیمام موسای کازم-ە و لە هاوچەرخەکانی شێخ عبدالقادر، گوتوویەتی: ((کێ دەتوانێ وەسفی کارە چاکەکانی شێخ عبدالقادر بکا ؟ کێ دەگاتە پلە و پایەی ئەو ؟ ئەو پیاوە دەریای شەریعەت لەلای ڕاستێتی و دەریای صۆفیگەری لەلای چەپێتی، لە هەریەکێکیانی بوێ هەڵیدەهێنجێ، لە سەردەمی ئێستامان دووەمی نییە))[2].

خاوەنی کتێبی (قلائد الجواهر) باسی گەلێ گوتەی تری زانا و پیاوچاکانی سەردەمی شێخ و دوای سەردەمی شێخی کردووە، کە هەموویان ستایشی شێخ عبدالقادری گەیلانییان کردووە و هەندێکیش پێشتر لەم کتێبەدا باسکراوە.

ئێستا دێینە سەر گوتەی شێخ تقی‌الدین ئەحمەد کوڕی تەیمییە، کە ستایشی شێخ عبدالقادر دەکا و هەر کە ناوێ دێ دەڵێ: خوا گیانی پیرۆزکات، یا خوا لێی

---

١ قلائد الجواهر، ص ١٣٧ بە دەستکارییەوە.

٢ طبقات الاولياء لأبن الملقن، ص ١٠٠ / قلائد الجواهر، ص ٦٦.

رازی بێ، سەیر کە لە کتێبی (القدر)دا دەڵێت: شێخ عبدالقادر، خوا گیانی پیرۆز کا، دەڵێت: گەلێ لە پیاوەکان هەر کە گەیشتنە قەزاو قەدەر بێدەنگبوون.. بەڵام من بەرگریم لە قەدەرەکانی خوا بەخوا و بۆ خوا کرد.. بەندە فەرمانی پێکراوە، کە لە ڕێگای خوا هەوڵ و کۆشش بکا و ئەو گوناهانەی بۆی دانراوە بەو خواپەرستیانەی بۆی دانراوە لابەرێ، بەندە دژی ئەو دانراوە قەدەغەکراوەیە بەو دانراوەی (المقدور) کە خوا فەرمانی پێی کردووە.[1]

بەڵام ئیمامی صۆفیە بەناوبانگەکانی وەکو جونید و پەیڕەوانی، شێخ عبدالقادر و ئەوانی وەکو ئەو، ئەوانە لە هەموو خەڵکێ زێتر پابەندی فەرمان و نەهین ... گوتەکانی شێخ عبدالقادر هەمووی لە چوارچێوەی پەیڕەوی کردنی فەرمان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەو ئارامگرتن لەسەر قەدەرکراوە دێن و دەچن.[2]

شێخ عبدالقادر گوتوویەتی: ((نیشانەی نەمانی ویستت لە کاری خوا ئەوەیە، کە تۆ بێ مرازبی، هیچ مەبەستێکت نەبێت، چونکە تۆ لەگەڵ ویستی خوا هیچی ترت ناوێ، ئەندام حەساوە و دڵ دڵنیای، سینگ فراوان و ڕوو نورانی، گوتم: ئەمە مەقامێکی تری شێخ عبدالقادرە، ئەمەیە کە ئیمامەکانی ئایین دەیلێن))[3].

((شێخ عبدالقادر دەریخستووە کە لە هەموو مەقامێ پابەند بوون بەفەرمان و نەهی پێویستە))[4].

دانەرە نوێیەکانیش گوتەی خۆش و ڕێکیان لە بارەی عبدالقادری گەیلانییەوە هەیە، شەکیب ئەرسەلان دەڵێت: ((شێخ عبدالقادری گەیلانی صۆفییەکی گەورە بوو، ڕێبازەکەی گەیشتە ئیسپانیا، دوای کەوتنی (غەرناتە) ناوەند(مرکز)ەکەی گواسترایەوە فاس، بەهۆی صۆفیگەرییەوە بیدعە لە ناو (بەربەر) لەناوچوو، بە

---

١ كتاب القدر ٨ / ٣٠٦.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ٨ / ٣٦٩.

٣ كتاب السلوك من الفتاوى لأبن تيمية: ٥٠٧:١٠ .

٤ سەرچاوەی پێشوو : ١٠ / ٥٢٢

سوننەت و کۆمەڵ پابەند بوون، هەروەها زنجییەکانی ڕۆژئاوای ئیفریقیا بەهۆی ڕێبازەکەوە ڕێگای ڕاستیان گرت))[1].

دکتۆر ئەحمەد شەلەبی خاوەنی کۆزانیار(موسوعة)ی مێژووی ئیسلامی دەڵێت: ((گەیلانی بە لێبووردن و خۆشەویستیی دراوسێ و چاوپۆشین لە دەوڵەمەندی و چێژەکانی ژیان ناسراو بوو، لە لێبووردنەکانی هەر کە باسی جولەکە و دیانیان لەلا بکردایە، ئاخی ئەوەی هەڵدەکێشا کە لە ڕێگەی نور لایان داوە، لە بارەی خۆشەویستیی دراوسێی هەر خواردن و سامانێکی هەبوایە بەشی دراوسێکەی لێدەدا، هەرچەندە پاشاو دەسەڵاتداران دیاری و پارەیان بۆ دەنارد، بەڵام لەبەر ئەوەی حەزی لە دەوڵەمەندی نەبوو دەیبەخشییەوە و بە هەژاری دەژیا، زۆربەی پەیڕەوانی شێخ چاویان لە ئاکاری مامۆستاکەیان کرد، ئەمەش یەکێك بوو لە هۆیەکانی بڵاوبوونەوەی ڕێبازی قادریی و زۆربوونی پەیڕەوانی))[2].

شێخ عبداللە ی کوڕی محەممەدی خەلیفی پێش نوێژ و دواندەری مزگەفتی حەرام (خوا گیانی پیرۆزکات) باسی شێخ عبدالقادر دەکا لە کتێبی (دواء القلوب والأبدان من وساوس الشیطان)[3]دا دەڵێت: ((شێخ عبدالقادری گەیلانی خوا گیانی پیرۆز بکات و گۆڕی روناك بکات لە کتێبی (الغنیة)دا دەڵێ: ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕیتەوە لە شەوی قەدر خوای گەورە فەرمان بە جوبرائیل دەکات لەگەڵ-دانیشتوانی (سدرة المنتهی) کە حەفتا هەزار فریشتەن دابەزنە سەر زەوی لەگەڵ خۆی چەند ئاڵایەکی نوور، کە دابەزینە سەر زەوی، جوبرائیل ئاڵای خۆی دەچەسپێنێ و فریشتەکانیش ئاڵای خۆیان لە چوار جێگا هەڵدەکەن: لە لای کەعبەو گۆڕی پێغەمبەرﷺ و مزگەفتی بیت المقدس و توری سینا. ئینجا جوبرائیل دەفەرمووێ: لێك بڵاوبن، ئەوانیش لێك بڵاو دەبنەوە، هەموو خانوێك و ژوورێك

---

١ حاضر العلم الاسلامي، ص ٣٩٦ بەدەستکارییەوە.

٢ موسوعة التاريخ الاسلامي، ج ٦، ص ٢١١.

٣ ص ١٩٢.

و مالێك و كەشتییەك كە بڕواداری تێدا بی فریشتە هەنگاوی بۆ دەنێن تەنیا ماڵێ نەبێ، كە سەگ و بەراز و لەش پیسی لە حەرام و وێنەی پەیكەری تێدابێت، جا ئەو فریشتانە تەسبیحات دەكەن و خوا بە پیرۆز دەگرن و تەهلیلە لێدەدەن و داوای لێبووردن بۆ ئوممەتی محەممەدﷺ دەكەن، تاكاتی بەیانی، ئینجا بەرەو ئاسمان هەڵدەكشێن))[1].

ابوالحسنی الندوی لە بارەی شێخ عبدالقادرەوە دەڵێت: ((لەسەدەی شەشەمی كۆچی، ماوەیەكی زۆر كەوتبووە نێوان پێغەمبەرایەتی و شوێنەوار و بەرەكەتەكانی و دنیا فراوان بوو بوو و هۆكارەكانی رابواردن و خافڵەتی زۆر ببوون، پیاوێكی خاوەن كەسێتییەكی بەهێز و ئیمانێكی بەهێز و زانستێكی بەهێزو بانگەوازكارێكی بەهێز و كاریگەرێكی بەهێز لە بەغدای دڵی جیهانی ئیسلامی هەستایەوە، ئەویش شێخ عبدالقادر بوو، دوای ئیمان و ئیسلامی راستەقینە و بەندایەتی بێگەردی نوێكردەوە، لەگەڵ دووروویی جەنگاو دەرگای تۆبە و بەیعەتی لەسەر گازی پشت كردەوە، موسڵمانەكان لێیەوە دەچوونە ژوورەوە، بەڵێن و پەیمانیان لەگەڵ خوا نوێ دەكردەوە، خەڵكێكی هێندە زۆر لەو دەرگایە چوونە ژوورەوە، خوا نەبێ كەس ژمارەیان نازانێ، شێخ بەبەردەوامی پەروەردەی دەكردن و لێی دەپرسینەوە و سەرپەرشتیی دەكردن، تا وایان لێهات دوای بەیعەت و تۆبەو نوێكردنەوەی ئیمان هەستیان بە لێپرسینەوە دەكرد ...))[2].

شێخ سەعید حەوا لە بارەی شێخەوە دەڵێ: ((ئوممەت هەمووی شێخی گەیلانییان قەبووڵ كرد، هەتا ئیبن تەیمیەش لە بارەی شێخەوە دەڵێ: ((كەرامەتەكانی بەیەك لە دوای یەك (تواتر) بە ئێمە گەیشتووە.. خوێندنەوەی كتێبی ئەو زاناو شەرعزانانەی كە قسەیان لە بارەی چوون بەرەو خوا كردووە بە شێوەیەكی سەیر هیمەتی موسڵمان بەرەو خوا دەجوولێنێ))[3].

---

١ الغنیة، ص ١٩٢.

٢ رجال الفكر والدعوه فی الاسلام، ص ٢٨٢.

٣ تربیتنا الروحیة، الشیَخ سعید حوی، ص ١٧٩.

# بەشی حەفتەم

## ئەو دانەرانەی کەلە کتێبەکانیاندا باسی شێخیان کردوە

گەلێ لە نووسەرانی کۆن و نوێ، عەرەب و ناعەرەب، موسڵمان و نا موسڵمان لە سەر شێخ عبدالقادر یان نووسیوە، هەندێکیان کتێبێکی تەواوی لە سەر نووسیوە، هەندێکیان کورتە ژیانیان نووسیەوە لە ژیان نامەکانیان، هەندێکیان کە باسی بابەتێکیان کردووە ناوی شێخیان هێناوە و گوتەکانیان بە نموونە هێناوەتەوە. لێرە بەدواوە بە پێی شارەزاییی خۆم ناوی ئەو نووسەرانە و کتێبەکانیان دێنم کە باسی شێخ عبدالقادری گەیلانییان کردووە:

١- کتێبی (أسنى المفاخر في مناقب الشيخ عبدالقادر)[١] نووسینی ئیمام عبداللّەی کوڕی ئەسعەدی یافیعی کە لە ٧٦٨ ك مردووە.

٢- کتێبی (بهجة الأسرار ومعدن الأنوار في مناقب السادات الأخيار من المشايخ الأبرار)[٢] نووسینی شێخ نورالدین ابیالحسن علی کوڕی یوسفی اللخمی شافیعی، کە لە ٧١٣ ك مردووە، نیوەی کتێبەکە باسی شێخ عبدالقادر دەکات.

٣- (درر الجواهر في مناقب الشيخ عبدالقادر)[٣] لە نووسینی سراج الدین ابی حفص عومەری کوڕی عەلی کوڕی احمدی المصری بەناوبانگ بە (ابن الملقن) کە لە

---

١ كشف الظنون، ص ٩٠.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٦.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٤٧.

٧٢٣ ك لـه دايكبووه و لـه ٨٠٤ ك مـردووه و خۆى خـاوەنى كتێبى (طبقـات الاولياء)ه.

٤- (رشف المنهلين في تخميس أبيات الشيخ عبدالقـادر)[١] نووسينى تقي‌الدين ئەبى‌بەكر كوڕى حوججه.

٥- (الروض الزاهر في مناقب الشيخ عبدالقادر)[٢] لـه نووسينى شێخ ابى‌العباس ئەحمەد كوڕى محەممەد القسطلانى، خاوەنى (المواهب اللدنيـة) كه لـه سالّى ٩٢٣ ك مردووه.

٦- (روضة الناظر في ترجمة الشيخ عبدالقادر) له نووسينى ابوطـاهر مجدالدين محەممەد كوڕى يەعقووبى فەيرووز ئابادى، خاوەنى (القاموس) كه لـه سالّى ٨١٧ ك مردووه.

٧- (الشراب النيلي في ولايـة الجيلـي)[٣] نووسينى محەممەد كـوڕى ئيبراهيمى حەلەبى له ٩٧١ ك مردووه.

٨- العز كوڕى عبدالسلام كوڕى ئەحمەدى القيلوى البغدادى كه لـه ٦٥٩ ك مـردووه، قەسـيدەيەكى شـێخ عبدالقـادرى گـەيلانى كردۆتـه پێنـج خشـتەكى كەسەرەتاكەى ئەم بەيتەيە:

ما في المناهل مستعذب      إلاّ ولي فيه الألذ الأطيب[٤]

٩- (قلائد الجواهر في مناقب الشيخ عبدالقادر)[٥] نووسينى شـێخ محەممەد كـوڕى

---

١ سەرچاوەى پێشوو، ل ٩٠٤.

٢ سەرچاوەى پێشوو، ل ٩١٩.

٣ كشف الظنون، ص ١٠٣٠.

٤ سەرچاوەى پێشوو، ل ١٣٣٩.

٥ سەرچاوەى پێشوو، ل ١٣٥٣.

یەحیای التادفی حەنبەلی حەلەبی، کە لە ٩٦٣ ك مردووە.

١٠- (مناقب الشيخ عبدالقادر الكيلاني)[١] لە نووسینی قطب‌الدین موسا کوڕی محەممەد الیونینی الحنبلی کە لە ٧٢٦ ك مردووە.

١١- (تفريج الخاطر في مناقب الشيخ عبدالقادر)[٢] لە نووسینی ئەربیلی.

١٢- (مناقب الشيخ عبدالقادر الكيلاني) دەستنووسە لە کتێبخانەی ظاهریە لە دیمەشق بە ژمارەی ٣٤٣٩.

١٣- (كتاب الطبقات الكبرى) لە نوسینی عبدالوهاب کوڕی عەلی ئەنصاری شەعرانی. ژین نامەی شێخ عبدالقادر لە ب ١، ل ١٢٦.

١٤- (كتاب الذيل على طبقات الحنابلة) لە نووسینی زین الدین ابی‌الفرج عبدالرحمن کوڕی شەهاب الدین ئەحمەدی بەغدادی ئینجا دیمەشقیی ناسراو بە-ئیبن رەجەب- ٧٣٦ ك ٧٩٥ ك: ژین نامەی شێخ عبدالقادر لە ب ٣ بەژمارەی ١٣٤. ئەوەی جێی سەرنجە لەو کتێبە کە شێخ عبدالقادر نوێژی لە سەر شێخە گەورەکان و پیاوچاکانی بەغدا دەکرد، ئەوانەی کە لە سالی ٥٤١ ك تا ٥٦١ ك مردوون و ئەوانەی کە لەم کتێبەدا باسیان کراوە. شێخ نوێژی لەسەر عبداللە ی کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدی موقریئی نەحویی ئەدیبی زاهید کرد، لە رۆژی دووشەممەی دوازدەی رەبیعی کۆتاییی سالی ٥٤١ کۆچی، هەروەها نوێژی لەسەر جونەیدی کوڕی یەعقوبی کوڕی حەسەنی فەقیهی زاهید ابی‌القاسم کرد، لە شازدەی جیمادی کۆتاییی سالی ٥٤٦ کۆچی، هەروەها لە سەر محەممەدی کوڕی ناسری کوڕی محەممەدی سەلامیی ئەدیبی زمانزانی حافظ ابی‌الفضل لە (١٨)ی شەعبانی سالی ٥٥٠ کۆچی کرد؛ عەلی ابی‌الوقت عبدالأول کوڕی ابی‌عبداللە

١ سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٤٣.
٢ موسوعة التأريخ الاسلامي، د. أحمد الشلبي: ٦ / ٢١٢.

عیسا کوڕی شوعەیبی السجزی لـە ٦ ی ذی‌القعدەی ٥٥٣ کۆچی، عەلی ئەحمەد کوڕی مەعالی کوڕی بەرەکەی الحربی، ئەوەی لەسەیر کردنیدا هەڵکەوت، رۆژی یەکشەممەی ١٨ ی جیمادی یەکـەمی ٥٥٤ کۆچی، عەلی عبدالله ی کوڕی سەعد کوڕی حوسێن الوزان العطار ابی‌المعمر رۆژی دووشەممەی ١٨ ی رەجەبی ساڵی ٥٦٠ کۆچی. ئەمەش بەڵگەی بەرزیی پلە وپایەیەتی و نیشانەی ئەوەیە کە لە پێشەوەی شێخەکانی بەغدا بووە لەو سەردەمەدا.

١٥- (کتاب سیر أعلام النبلاء) لـە نووسینی ئیمام شمس الدین محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عوسمان الذهبی، کە لە ساڵی ٧٤٨ کۆچی مردووە و لە بەرگی ٢٠ ل ٤٣٩ و دوای ئەوە باسی شێخ عبدالقادری کردووە، هەروەها لە کتێبەکەی (العبر في خبر من عبر) بەرگی ٤، ل ١٧٥ باسی شێخی کردووە.

١٦- (تکملة الإکمال) لە نووسینی حافظ ابی‌بکر محەممەد عبدالغنی البغدادی حەنبەلی ناسراو بە (ابن نقطة) کە لە ٦٢٩ کۆچی مردووە، ساغکردنەوە(تحقیق)ی دکتۆر عبدالقیوم عبد رب النبی ٢/٤٩٠ ٤٩٢ لە بابی (الختلي والجیلي) و ٥٤٦/٢ لە بابی (دوروست و دۆست).

١٧- کتێبی (تکملة إکمال الإکمال في الأنساب والأسماء والألقاب) لە نووسینی شێخ ئیمام جمال الدین ابی‌حامد محەممەد ناسراو بە (ابن الصابوني)، کە لە ٦٨٠ کۆچی مردووە، ساغکردنەوەی بەڕێز مستەفا جەواد. دانەر لەو کتێبەدا باسی شێخ عبدالقادری نەکردووە، بەڵام هەر کە باسی ابی‌العلاء ئەحمەد کوڕی ابەالیسر التنوخی کردووە، گوتوویەتی: هەندێ لە شێخەکانی بەغدا مۆڵەتیان پێداوە لەوانەش شێخ عبدالقادر کوڕی ابی صالحی الجیلی، ئا لێرە ساغکەرەوەی کتێبەکە بە دوورو درێژی باسی شێخ عبدالقادری کردووە.

١٨- کتێبی (فوات الوافیات)ی محەممەد کوڕی شاکری الکتبی کە لە ٧٦٨ کۆچی مردووە، بەرگی / ٢، ل ٣٧٣.

١٩- كتێبی (التاج المكلل من جواهر مآثر الطراز الآخـــر والأول) لـه نووسینی بەڕێز أبي‌الطیب الحسینی البخاری القنوجی، ل ١٦٦.

٢٠- كتێبی (نتيجة التحقيق)ی محەمەد الدیلـی، لـه سالی ١٣٠٩ك. لـه (فـاس) چـاپکراوە، مامۆسـتا محمـد العینـی لـه كتێبەكـەی (عبدالقـادر الگیلانـي) دانـه فەرەنسییەکە، ل ٢٤٧ باسی کردووە.

٢١- كتێبی (أنور النـاظر)ی ابی‌بكر عبدالله کوڕی نەسر البكری البغدادی، عەینی له کتێبەکەی له ل: ٢٤٧ باسیکردووە.

٢٢-كتێبی (خلاصة المفاخر في مناقب الشيخ عبدالقـــادر) لـه نووسینی ئیمام عفیف الدین عبدالله ی کوڕی ئەسعەدی یافیعی، کە لە ٧٦٨ ك مـردووە. عـەینی لـه ل: ٢٤٧ باسیکردووە.

٢٣- كتێبی (نزهة الخاطر في ترجمة سيدي الشريف عبدالقادر) له نووسینی مەلا عەلیی کوڕی سوڵتان محەمەدی القاری، کە لە ١٠١٦ ك مردووە، لە سالی ١٣٠٧ ك لـه ئەستەنبۆڵ چاپکراوە، دەستنووسێکیش لەو لە کتێبخانەی سەلیم ئاغا هەیە بە ژمارە (٧٥)، عەینی له ل: ٢٤٧ باسیکردووە.

٢٤- كتێبی (الدر الفاخر) نووسینی بەڕێز عبدالقـادر کوڕی شێخ العیدروسی الیمنی، عەینی له ل ٢٤٧ باسیکردووە.

٢٥- كتێبی (زبدة الأسرار في منـــاقب غــوث الأبــرار) نووسینی عبدالحق الدهلوی كه له ١٠٥١ کۆچی مردووە. عەینی له ل:٢٤٧ باسیکردووە.

٢٦- كتێبی (زبدة الأعصار في أخبار قطب الأخيـــار) بە زمـانی فارسییەو هـی هەمان دانەری پێشوە، عەینی له ل: ٢٤٧ باسیکردووە.

٢٧- كتێبی (نزهة الناظر) نووسینی عەلی محەمەد عبداللطیفی بەغدایی، عەینی لـه ل: ٢٤٧ باسیکردووه

٢٨- كتێبی (الشرف الباهر)ی ئیمامی قطب‌الدین موسا، کە لە ٧٢٦ کۆچی مردووە و عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٢٩- کتێبی (الجاني والداني)ی سەید جەعفەری بەرزنجی، لە بۆمبای چاپکراوە، عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٠- کتێبی (روض البساتين في أخبار مولانا عبدالقادر محيي الدين) نووسینی محەممەد الامین لە تونس. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣١- کتێبی (الهار المفاخر)ی محەممەد غوث‌الدینی شافیعی لە (میدراس) لە هیند. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٢- کتێبی (سلطان الأذكار في مناقب غوث الأبرار) نووسینی: مەولانا شاە محەممەد لە هەمەدان. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٣- کتێبی (نسر الجواهر) نووسینی: قاضی الاسلام محەممەد صبغەالله لە (مدراس) لە هیند. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٤- کتێبی (زين المجالس) شیعری: قازی محەممەدی مەرکەحی بە زمانی ئوردی. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٥-کتێبی (مرقاة المراتب) نووسینی: سولەیمان حەسبی بە زمانی تورکی، لە ١٣٠٠ ك لە ئەستەنبۆڵ چاپکراوە. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٦-کتێبی (تنشيط الخاطر) نووسینی: ضیاءالدین تورك زادە بەزمانی تورکی، لە ١٣٠٢ ك لە ئەستەنبۆڵ چاپکراوە. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٧- کتێبی (إكى غوث الأنام) نووسینی: ئەحمەد حیلمیی شاهباندەزادە بە زمانی تورکی، لە ١٢٣١ ك لە ئەستەبۆڵ چاپکراوە. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٨ - كتێبی (الفتح المبین) نووسینی: ابی‌مظفر سەید ظـــهیرالدین القـادری، لـه ١٣٠٦ك. لە قاهیرە چاپکراوە. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٣٩- کتێبی (تفریج الخاطر في مناقب عبدالقـلدر) نووسینی: عبدالقـادر کەمال الدین بەزمانی تورکی، لە ١٣٠٥ ك مردووە. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٤٠- کتێبی (مناقب عبدالقادر) دەستنووسێکە لە کتێبخانەی (نور)ی عوسمـانی، بە ژمارە: ٢٦٠٨. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٤١- کتێبی (القادریـة) دەستنووسێکە لـە کتێبخانـەی بیـازید بـەژمارە: ٣٣٧٨. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٤٢- کتێبی (زمرد کلام عبدالقادر) نووسینی: لالی زاری تاهیر محەمەد بە زمـانی تورکی. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٤٣ - کتێبـی (نفحـــات الجـــامي) بـەزمانی تورکـی، لـە کتێبخانـەی (نــور)ی عوسمانی، بە ژمارە: ٢٣١٠. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٤٤ - کتێبی (نهر المحاسن الغالیـــة)ی یـافیعی لـە کتێبخانـەی ئایـا صۆفیـا لـە ژێـر ژمارە: ٢١٣٣. عەینی لە ل: ٢٤٨ باسیکردووە.

٤٥ - کتێبی (شرح الغوثیــة) بە زمـانی فارسـی، دەستنووسێکە لـە کتێبخانـەی زانکۆی ئەستەنبۆڵ لەژێر ژمارەی: ١٨٦٥. عەینی لە ل: ٢٤٩ باسیکردووە.

٤٦ - کتێبی (تحفة القادریـــــة) بـەزمانی فارسی، نووسینی: محەمـەدی ابی‌علـی المعالی، لە کتێبخانەی زانکـۆی ئەستەنبۆڵ لـە ژێـر ژمـارەی: ١٨٦٥. عـەینی لـە ل: ٢٤٩ باسیکردووە.

٤٧ - کتێبی (روض الریاحین في حکایـــات الصـــالحین)ی یـافیعی، بـۆ زمـانی تورکی وەرگێڕدراوە و لە کتێبخانەی ئایا سۆفیا بە ژمارە:١٨٢٧ دانراوە. عەینی لە

ل: ٢٤٩ باسیکردووه.

٤٨ - کتێبی (كوكب المباني وموكب المعاني في شرح صلاة عبدالقادر الكيلاني) له کتێبخانەی سلێمانی له ژێر ژمارەی: ١٨٥٣ دانراوه. عەینی له ل: ٢٤٩ باسیکردووه.

٤٩ - کتێبی (الدرر السنية في المواعظ الجيلانية) نووسینی محەممەد سیف الدینی گەیلانی، له ١٣٠٢ کۆچی له ئەستەنبۆڵ چاپکراوه. عەینی له ل: ٢٤٩ باسیکردووه.

٥٠ - کتێبی (المناقب الغوثية) نووسینی: محەممەد سدیقی شابیی سەعدی، بەزمانی فارسییه. عەینی له ل: ٢٤٩ باسپکردووه.

٥١ - کتێبی (تذكرة أولياء بغداد) دەستنووسێکه له کتێبخانەی زانکۆی ئەستەنبۆڵ له ژێر ژمارەی: ١٣١. عەینی له ل: ٢٤٩ باسیکردووه.

٥٢ - کتێبی (رسالة السلوك القادري) له کتێبخانەی حەسەن پاشا ئەیوب له ئەستەنبۆل به ژماره: ٦٧٧ دانراوه. عەینی له ل: ٢٤٩ باسیکردووه.

٥٣ - کتێبی (السيف الرباني)ی شێخ سەید محەممەدی مەکیی کوڕی سەید مستەفا کوڕی محەممەد عەزوزی موفتی تونس. له ١٣١٠ کۆچی لەچاپ دراوه، جاری دووەم له ساڵی ١٣١٣ ك بۆمبای چاپکراوەتەوه به فەرمانی سەید عبدالرحمن سەرۆکی تەریقەت له بەغدا، ئەم کتێبەی رەخنەیه له کتێبی (رسالة الحق الظاهر في الشيخ عبدالقادر)ی عەلی کوڕی محەممەدی کارامانی. لەم کتێبەدا گەلێ بوختان به شێخ عبدالقادر کراوه، له کۆتایی کتێبی (السيف الرباني) که ئەم بوختانانەی رەد کردۆتەوه، نووسینی چل و چوار کەڵەزانای تونسی و جەزائیر و حیجازی ئەو کاتەی تێدا بلاوکراوەتەوه و بەرگرییان له شێخ عبدالقادر کردووه. عەینی له ل: ٢٤٩ باسیکردووه.

٥٤ - كتێبی (توفيق الملك القادر في سلوك طريق الغوث عبدالقـادر) نووسینی: حەریری زادە کمال الدین. عەینی لە ل: ٢٥٠ باسیکردووە.

٥٥ - کتێبی (نفحات الرياض العلية في بيان الطريقة القادرية) نووسینی: محەممەد رەفعەت بەزمانی تورکی یە، لە کتێبخانەی (ملت) لە ئەستەنبۆڵ ژمارە: ٨٨٨ پێدراوە، لەو کتێبەدا باسی تەکیەکانی قادری دەکات لە بەغداو حەماو حەلەب و دیمەشق و کوردستان و یەمەن و خوراسان و هەمەدان و ئەحمەد ئاباد و لاهور و قودس و بۆرسە و ئیزینك و ئەدرینۆبل و سالۆنیك و کریت و بۆسنە و میسر و ئەستەنبۆڵ و وینیجە و شوێنی تر. عەینی لە ل: ٢٥٠ باسیکردووە.

٥٦ - Toumar - Turouk نووسینی: صدیق ویجانی بەزمانی تورکییە، لە ١٣٣٨ ك لە ئەستەنبۆڵ بڵاوکراوەتەوە. عەینی لە ل: ٢٥٠ باسیکردووە.

٥٧ Les Comfreries musulmanes du Hedjaz لە نوسینی A.Le Chatelier Ernest Leroux بەزمانی فەرەنسییە. عەینی لە ل: ٢٥٠ باسیکردووە.

٥٨ - Marabouts et khouan, par Rinn بەزمانی فەرەنسییە. عەینی لە ل: ٢٥٠ باسیکردووە.

٥٩ - The dervishese, Par. I. P. Brown بەزمانی ئینگلیزییە. عەینی لە ل: ٢٥٠ باسیکردووە.

٦٠ Confreies religieuses musulmanes. par Dupont et Copolani لە ١٩٧٩ لە جەزائیر بەزمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە. عەینی لە ل: ٢٥٠ باسیکردووە.

٦١ Abd-al-Qadir Al Gilani بەزمانی ئەڵمانی لە نووسینی Von w. Braune بڵاوکراوەتەوە. عەینی لە ل: ٢٥٠ باسیکردووە.

٦٢ Les saints musulmans enterres a Bagdad (وەلییە

موسڵمانەکان کە لە بەغدا نێژراون) نووسینی: L. Massignon ی ڕۆژهەڵاتناس بەزمانی فەرەنسی نووسیوێتی و پێشکەشی کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسان کراوە لە کۆبنهاگن لە ١٩٠٨/٨/١٥، ئینجا گۆڤاری مێژووی ئاینەکان بڵاوی کردۆتەوە. عەینی لە ل ٢٥٠ باسیکردووە.

٦٣ کتێبی (الفیوضات الربانیة في المآثر والأوراد القادریة) کۆکردنەوەو ڕێکخستنی حاجی ئیسماعیل کوڕی محەممەد سەعیدی قادریی گەیلانیی بەغدایی، لە ١٣٤٠ ك لە چاپخانەی مستەفا البابی حەلەبی و مندالەکانی لە میسر چاپکراوە.

٦٤ کتێبی (الموجز في التأریخ القطب الغوث والباز الأشهب) نووسینی: مامۆستا فەخری نەورسی گەیلانی، باسی کورتەیەکی ژیانی شێخ عبدالقادری تێداکردووە، دوایی ناوی نەوەکانی هێناوە کە لە شاری (حەما) نیشتەجێن لەو ڕۆژەی کە سەید سیف الدین موحیی لەوێ نیشتەجێ بووە تا مێژووی چاپی کتێبەکە لە ساڵی ١٩٥٦ ز.

٦٥ کتێبی (عبدالقادر الکیلاني) نووسینی: مامۆستا محەممەد عەلی عەینی، مامۆستای پێشووی زانکۆی ئەستەنبۆڵ، کتێبەکە بە زمانی تورکییە و ئینجا وەرگێردراوەتە سەر زمانی فەرەنسي، لە ١٩٥٦ چاپکراوە

٦٦ کتێبی (هکذا ظهر جیل صلاح الدین وهکذا عادت القدس) نووسینی: دکتۆر ماجید عورسانی گەیلانی، لە ١٩٨٥ چاپکراوە، نووسەر بە درێژی لە سەر غەزالی و شێخ عبدالقادری گەیلانی نووسیوە، لە کتێبەکەی دەری خستووە کە ڕاوێژکارانی نورالدین زەنگی و سەلاحەدینی ئەییوبی و پیاوەکانیان کە قودسیان لە دەست خاچییەکان ڕزگار کرد هەموویان دەرچووی هەردوو قوتابخانەی غەزالی و گەیلانی بوون ڕەحمەتی خوایان لێ بێ.

٦٧ کتێبی (نشأة القادریة) نووسینی دکتۆر ماجید عورسانی گەیلانی، پلەی ماجیستێری پێ وەرگرت لە زانکۆی ئەمریکی لە بێروت.

٦٨ کتێبی (الشیخ عبدالقادر الکیلانی) نووسینی: شێخ یونس شێخ ئیبراهیمی سامەڕایی. چاپی سێیەم.

٦٩ کتێبی (الباز الأشهب) نووسینی: ئیبراهیمی دروبی.

٧٠ کتێبی (الطراز المذهب)ی کەڵە زانا: مەحمود ئالوسی.

٧١ کتێبی (رجال الفکر والدعوة في الاسلام) نووسینی: مامۆستا ابیالحسن عەلی الحسنی الندوی، چاپی شەشەم، ساڵی ١٩٨٢ ز.

هەروەها گەلێ لە خاوەنی ژیان نامەکان کورتەیەکی ژیانی شێخ عبدالقادریان نووسیوە لە کتێبەکانیان، وەکو ابن کثیر لە (البدایة والنهایة)، ابن أثیر لە (الکامل)، سەمعانی لە کتێبی (الأنساب)، شێخ حوسێن کوڕی محەممەدی دیاربەکریی لە کتێبی (تأریخ الخمیس في احوال أنفس نفیس)، زەرکەلی لە کتێبی (الاعـــلام)... و هیتر. هەروەها ناوی لە کۆ زانیاری لاروسی فەرەنسی و کۆزانیاری عەرەبیی ئاسان هاتووە، سەرەڕای ئەوەی ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی مەرجلیۆس نامەیەکی لە ژیان نامەی شێخ نووسیوە.

هەروەها ئیبن تەیمیە لە کتێبەکانیدا لە بابەتی: قەدەر، سلوك، صۆفیگەری باسی شێخ عبدالقادری کردووە، هەر کە لەم بابەتانە دواوە، سەرەڕای ئەمانەش زانیم کە مامۆستا موفەق شوکری کە لە بنکەی بانگەوازیی و رابەریتی کاردەکا لە (دبي) ئێستا نامەیەکی دکتۆرا لە بارەی شێخ عبدالقادری گەیلانییەوە ئامادە دەکا بۆ وەرگرتنی پلەی دکتۆرا لە زانکۆی زەیتونە لە تونس، شێخ عبدالوهابی مەشهدانیش، کە ئێستا کاری ئامۆژگاریکارە لە ئەوقاف لە (رأس الخیمة)، کتێبێك لە بارەی شێخ عبدالقادری گەیلانییەوە ئامادە دەکات-رەحمەتی خوای لێ بێت-.

# بەشی هەشتەم

# کتێبەکانی شێخ عبدالقادر

# پەخشان و شیعر

شێخ عبدالقادر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) گەلێ کتێبی داناوە و کۆمەڵێ شیعری نووسیوە، ئێستا ئەوانە باس دەکەم کە پێیانم زانیوە:

١ (الغنیـــــة) بۆ خوازیـارانی ڕێگـەی خـودا، لـە ئاکـارو صۆفیگـەری و خوورەوشتی ئیسلامی، دوو بەرگە، لە ١٢٨٨ کۆچی لە(بۆلاق) چاپکراوە.

٢ (الفتح الرباني و الفيض الرحماني)، ئەمە کۆمەڵـە کۆڕێکە لـە ئامۆژگـاری و ڕێنوێنی کردن.

٣ (حزب بشائر الخيرات في الصلاة على صاحب الآيات البينـات)، لـە دوای ئەوە (ورد الجلالة للجيلاني) دێت، لە ١٣٠٤ کۆچی لە ئەسکەندەرییە چاپکراوە.

٤- (فتـــوح الغيـــب) بریتیە لـە ٧٨ گوتـار لـە بیرە بـاوەڕی و صۆفیگـەری و رابەرێتیکردن.

٥- (جــلاء الخـــاطر مـــن کـــلام الشـــيخ عبدالقـــادر)، ئەوەی لـە کـۆڕە ئامۆژگاریەکانی گوتوویـەتی تێیـدا کۆکراوەتـەوە، سـەرەتاکەی ڕۆژی هـەینی نۆی ڕەجەب و کۆتاییەکەی بیست و چواری ڕەمەزانی ساڵی ٥٤٦ ك (کشف الظنـون،

ص ٥٩٢).

٦ (حزب الرجاء والانتهاء للشيخ عبدالقادر الكيلاني) كە لە ساڵی ٥٦١ ك مردووە. (كشف الظنون، ص ٦٦٢).

٧- (الرسالة الغوثية للشيَخ عبدالقادر الجيلي) (كشف الظنون، ص ٨٧٩). دانەیەکی لە کتێبخانەی ئەوقافی بەغدا هەیە. (کتاب السامرائی، ص ١٦).

٨- (المعراج لطيف المعاني للشيَخ عبدالقادر الكيلاني) كشف الظنون، ص ١٧٣٨.

٩- (يواقيت الحكم للشيَخ عبدالقادر الكيلاني). كشف الظنون، ص ٢٠٥٣.

١٠- (المواهب الرحمانية للشيَخ عبدالقادر) خاوەنی کتێبی (روضات الجنات) باسیکردووە. کتێبی محەممەدی عەینی، ل ٢٤٥.

١١- (وصايا الشيخ عبدالقادر) لە کتێبخانەی فیض اللّەی شێخ مراد لە ژێر ژمارەی: ٢٥١. کتێبی محەممەدی عەینی، ل ٢٤٥.

١٢- (بهجة الاسرار)، کۆمەڵە ئامۆژگاریەکی شێخ عبدالقادرە، کەشێخ نورالدین ابوالحسن عەلی کوڕی یوسفی اللقمی مامۆستای زانکۆی ئەزهەر کە لە قاهیرە لە ساڵی ٦٤٢ك. لە دایکبووە واتا: دوای مردنی شێخ عبدالقادر بە ٨٣ ساڵ و لە ساڵی ٧١٨ك. مردووە کۆی کردۆتەوە. کتێبی محەممەد عەینی، ل ٢٤٦.

١٣- (سر الأسرار في التصوف)، دانەیەکی لە کتێبخانەی زانکۆی ئەستەنبۆڵ، هۆڵی رەزا پاشادا هەیە بە ژمارە: ٣٦١٦ (کتێبی محەممەدی عەینی، ل ٢٤٦)، دەسنوسێکی لە کتێبخانەی قادری لە بەغدا هەیە و لە پاکستان بەزمانی عەرەبی و ئۆردی چاپکراوە، کتێبی سامەرایی، ل ١٦.

١٤- (رسائل الشيخ عبدالقادر)، پازده نامەیە بەزمانی فارسییەو لە كتێبخانەی زانكۆی ئەستەنبۆڵ لە هۆلی رەزا پاشا بە ژمارە: ٣١٠ هەیە. كتێبی محەممەدی عەینی، ل ٢٤٦.

١٥- (دیوان الشیخ عبدالقادر)، بە زمانی فارسییە، دەستنووسە لە كتێبخانەی زانكۆی ئەستەنبۆڵ بە ژمارە: ١٨٦٥ دانراوە، كتێبی محەممەدی عەینی ل ٢٤٦.

١٦- چەند نامەیەكی فارسی، كە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و شێخ عبدالقادر بۆ هەندێ لە موریدەكانی نووسیوە لە عێراقی عەجەم، حسام الدینی المطاقی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و رأفت سلیمان پاشای والی بورسە لە ساڵی ١٢٧٦ ك وەریانی گێراوەتە سەر زمانی توركی، ئەم نامانە بریتین لە هەندێ ئامۆژگاری لەگەڵ (٢٧٥) ئایەتی قورئانی پیرۆز. (كتێبی محەممەدی عەینی، ل ٢٤٦).

١٧- كتێبی (الفیوضات الربانیة) ناوی ئەم كتێبەم لە لیستی ئەو دانەرانە هێنا كە لە سەر شێخ عبدالقادریان نووسیوە، لێرەش ناوی دێنمەوە چونكە گەلێ لەویردەكانی شێخی تێدایە وەكو: ویردی رۆژەكانی حەفتە، ویردی بەیانیان، ویردی نیوەرۆ، ویردی عەسر، ویردی رۆژئاوا، ویردی عیشا، نزای پارێزگاری، نزای سەركەوتن، لەگەڵ هەندێ پاڕانەوەو سەڵەوات و چەند قەسیدەیەكی شیعری، كە لەمەودوا چاومان بە چەند نموونەیەكی دەكەوێ.

١٨- (تنبیه الغبي الى رؤیة النبيﷺ) دەسنووسێكە لەكتێبخانەی فاتیكان لە رۆما. (كتێبی شێخ عبدالقادری گەیلانی، یونس سامەڕایی، ل١٥).

١٩- (الرد على الرافضة) دەسنووسێكە لە لە كتێبخانەی قادرییە لە بەغدا. كتێبی شێخ عبدالقادری گەیلانی، یونس سامەڕایی، ل ١٦).

٢٠- (حزب[1] عبدالقادر الكيـــلاني) دەستنووسێکە لـە کتێبخانەی ئەوقاف لـە بەغدا.

٢١- (مسك الختام) راڤەی قورئانی پیرۆزە و دەستنووسێکە لـە دوو بەرگدایـە و لە کتێبخانەی شێخ رەشیدی کیرامی لە تەرابلسی شام، مێژووی نووسینەوەی سـاڵی ٦٢٢ کۆچییە و دانەیەکی تری ناتەواوی لە (الدائرة الهنديـــة) هەیـە. (کتێبی شێخ عبدالقادر، سامەڕایی، ل ١٥).

لەوانەیە هەندێ کتێبی تری شێخ عبدالقادر هـەبێ و بـە دەستمان نەگەیشتبێ بـە هۆی هێرشی تەتەرەکان بۆ سەر بەغدا لە ٦٥٦ ك، واتـا: دوای مردنـی شێخ بەسـەد سـاڵ کـەمتر، ئەو تەتەرانـە هـەر کتێبێکیـان بـە دەسـت بکەوتبایـە دەیـان خسـتە نـاو دیجلـەوە و کتێبخانـەکانی بـەغدایان نەهێشـت، جـا هـەر کتێبێ دانـەی لـە دەرەوەی بەغدا هەبوایە ئەوا مایـەوە و بەدەستمان گەیشـت. بـەڵام ئەوەی تـەنیا دانەیـەکی لـە بەغدا هەبوو ئـەوا لـەناو چـوو، لەوانەیـە شێخیش هـەندێ لـەو کتێبانـەی دانـەی لـە دەرەوەی بەغدا نەبووبێ و لەگەڵ ئەو هەموو کتێبەی بەغدا لەناو چووبن.

بەهـەر حـاڵ تـەنیا پێنـج کتێـب لەوانـەی باسـکران ئێسـتا لـەبـەر دەسـتن و لـە کتێبخانەدا هەن، ئەوانەش بریتین لە: (الغنية، الفتح الرباني، فتوح الغيب، الفيوضات الربانية، حزب بشائر الخيرات). ئێستاش بە خێرایی سەیرێکیان دەکەین:

١-کتێبی (الغنية لطالبي طريق الحق في الاخلاق والتصوف والآداب الاسلامية):

(دار الالباب) لە دیمەشق چاپیکردووە و لە یەك بـەرگ دایـە و دوو بەشـە: بەشـی یەکەم ١٩٢ لاپەڕەیە، بەشـی دووەم ٢٠٠ لاپەرەیـە، شێخ لـە بەشـی یەکـەمدا باسـی ئەمانەی کـردووە: چۆنیـەتی چوونـە نـاو ئاینی ئیسـلام، دوایـی کورتـەیێ لـە نوێـژ و رۆژوو و زەکات و حەج، ئینجا بە درێـژی باسـی رەوشـتە ئیسـلامیەکانی کـردووە، چونکە گیان و کاکڵەی ئیسلامە، هەروەها بەڵگەی ئەوەیە کە ئیمان چووەتە نـاخی

[1] مەبەست لە (حزب) نزاو پاڕانەیە وەرگێڕ -.

دڵەوە، باسی ڕەوشتی سەلامکردن و ماوە وەرگرتن و خواردن و خواردنەوەی کردووە، هەروەها باسی (دە) سیفەتە فیطریەکانی کردووە لەگەڵ نەریتی جل و بەرگ و نووستن و گەشتکردن و چوونە ماڵان، ئینجا باسی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك ناولێنانی منداڵی کردووە، باسی ئەوەی کردووە لە کاتی تووڕەبووندا چی بکرێ، ئینجا ڕەوشتی پاڕانەوە و چوونە بازاڕ و گەڕانەوە لە گەشت چی دەگوترێ ... ئینجا باسی ڕەوشتەکانی ژن مارەکردن و فەرمانکردن بە چاکە و نەهیکردن لە خراپەی کردووە، دوای ئەمە باسی ئیمان و بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و نیشانەکانی بیدعە چیەکان و گروپە گومڕاکانی کردووە. ئینجا باسی گەورەیی خۆ پەناگرتن بە خوا لە شەیتان و گەورەیی (بسم الله الرحمن الرحیم)ی کردووە بە ڕاڤەکردنەوە، ئینجا هاتۆتە سەر مەرجەکانی تۆبە و ڕێگای تەقواو باسکردنی سیفەتەکانی بەهەشت و دۆزەخ، لە کۆتایی باسی گەورەییەکانی مانگی ڕەجەب و شەعبانی کردووە.

بەشی دووەمی بە گەورەییەکانی مانگی ڕەمەزان و شەوی قەدری دەست پێکردووە، ئینجا جەژنی ڕەمەزان، دەرۆژەکەی ذی‌الحجە و ڕۆژی عارفە و ڕۆژی کوشتی سەربڕین و ڕۆژی عاشورا، ئینجا باسی گەورەییەکانی ڕۆژی هەینی و ڕۆژەکانی حەفتەو ڕۆژانی (بیض) و شەونوێژ و ویردەکانی نوێژ و کورتکردنەوە و کۆکردنەوەی نوێژ و نوێژی مردوو و خێری سەردانی نەخۆشی کردووە، ئینجا هانی سوننەتکردنی زۆری داوە دوای نوێژە ئەرکەکان و باسی هەندێ پاڕانەوەی ڕێبوار پاراستن و جێبەجێکردنی پێویستیەکانی و لاچوونی زۆر و ستەم و خەم و قەرزدانەوەی کردووە، هانی وەسیەتکردنی داوە، ئینجا هاتۆتە سەر ڕەوشتی موریدان و موجاهیدان و لێپرسینەوە و پشت بە ستن بە خوا و ئاکاری چاك ... لەم کتێبەدا شێخ زۆر پەنای بردۆتە سەر فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ، لە بەشی یەکەم: ٣٨٦ فەرموودەی هێناوەتەوە، لە بەشی دووەم: ٤٩٣ فەرموودەی هێناوەتەوە، تکا وایە خوای گەورە یەکێکی بۆ ئامادە بکا، کە فەرموودەکانی دەربێنێ و ڕێکی بخات

هەروەك بۆ کتێبی (إحیاء علوم الدین)ی ئامادە کرد.[1] زمانی کتێبەکە پتەوو بەتین و رەسەنە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە شێخ دایناوە و بە قسە نەیگوتووە.

٢- کتێبی (الفتح الربانی و الفیض الرحمانی):

ئەو دانەیەی لەم کتێبە لە پێشمە لە بڵاوکراوەی (دار الکتـــاب العـــربی)یە لە بیروت، چاپی ١٩٨٠ز.، تاکە بەرگێکە و ٣٧٥ پەڕەیە، ئەمە دانراو نییە بەڵکو چەند وانەیەکی ئامۆژگاری و ڕێنماییە، کە شێخ لە کۆڕەکانی گوتوویەتیەوە و قوتابیەکەی عفیف الدین کوڕی موبارەك لەوی گوێی لێبووە و نووسیوێتیەوە و بریتییە لە (٦٢) کۆڕ، کۆڕی یەکەم لە (٣)ی شەوالی ساڵی ٥٤٥ کۆچییە، کۆڕی کۆتایی لە ڕۆژی هەینی کۆتایی ڕەجەبی ساڵی ٥٤٦ی کۆچییە. واتا: بریتییە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی کەمتر لە ساڵێکی، ئەوەی ئێمە زانیومانە شێخ زیاتر لە چل ساڵ خەریکی ئامۆژگاریکردن و وانە گوتنەوە و ڕێنماییکردن بوو، جا ئەگەر هەموو ئەو کۆڕانە بنووسرابانەوە، ئەوا بەلای کەمی چل بەرگی وامان لە بەر دەست دەبوو، ئایا هەر هێندەی لێ وەرگیراوە و نووسراوەتەوە، یا خۆد لە مەزیاتری لێ نووسراوەتەوە بەڵام بەدەستمان نەگەیشتووە و ونبووە؟

زمانی کتێبەکە ئاسان و ڕوونە و بە شێوەی قسە لەگەڵ کردنە بۆ ئەوەی خەڵکی گشتی تێی بگەن، زۆر جاران ئەم لێکچوونانە بەکار دێنێ: ((ئەی خەڵکینە ئێوە بە دوای دنیادا ڕادەکەن تا بتان داتێ، بەڵام دنیا بەدوای وەلییەکانی خوادا ڕادەکا تابیانداتێ و لە بەردەستیان بە سەرکزی ڕادەوەستێ، بە شمشێری یەکخواپەرستی لە نەفسی خۆت بدە و کڵاوی سەرکەوتن لە سەر بنێ، ڕمی کۆشش و جیهاد و سوپەری تەقوا و شیری دڵنیایی هەڵگرە، جارێ تانەی لێ بدە و جارێ لێی بدە، هەر

---

[1] بەم دواییە زانیم، کە مامۆستا فەرەج تۆفیق ئەلوەلید پرۆفیسۆری یاریدەر لە کۆلیژی شەریعەی سەر بەزانکۆی بەغدا کتێبی (الغنیـــة)ی ساغ کردۆتەوە و ژمارەی بۆ ئایەتەکانی داناوەو فەرموودەکانی بردۆتەوە سەر سەرچاوەکان و ژیانی کەلەپیاوەکانی نووسیوە و فەرموودە غەریبەکانی راڤە کردووە، خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە.

بەجۆرە بە لەگەڵی تا سەری بۆت شۆڕ دەکا))[1]، ((خۆتیان نیشان مەدە تا بەزرێی لە خواترسان خۆت زرێ پۆش نەکەی و کڵاوی ئیمان لەسەری دڵت دانەنێی و شمشێری یەکخواپەرستی لە دەست نەگریت و تیری وەڵامدانەوەی دوعا لە هەگبەت دا نەبێ و سواری ئەسپی سەرکەوتن نەبیت))[2].. کتێبەکە هەمووی لە بارەی ئامۆژگاری و رێنمایی کردن و چاکسازیی نەفس و پاکسازیی ئاکارو زوهد لە دنیا و بەرە و رۆژی دوایی چوون و داواکردنی رەزامەندیی خوا بە جێبەجێکردنی فەرمان و لادان لە خراپە و هاندان لەسەر ئارامگرتن و دژایەتیکردنەی نەفس و ئارەزوو و شەیتان، هەروەها زۆر جەخت لەسەر قورئان و فەرموودە دەکا، کە ببنە دادەوەری هەموو کردەوەکان، هەموو حەقیقەتێ شەریعەت شایەتیی بۆ نەدا زەندیقییە، صۆفیگەری بە دڵپاکی و پاکسازیی ئاکار دەبێ، نەك بە خوری پۆشین و رەنگ زەرد هەڵگەران، شێخ دەڵێ: زانست فێربە ئینجا گۆشەگیربە. شێخ لەم کتێبەدا مەترسیی لە کارەساتێکی ترسناك هەیە کە بەسەر بەغدا و میللەتی موسڵماندا دێ، دەڵێت: ((خەبەرێکم بۆ هات، کە کارەساتێ ئەم شارە دەگرێتەوە، ئینجا داوای لە خەڵکی شارەکە کرد لەسەر خۆیانی لابدەن، ئینجا گوتی: بە گیانی خۆم لەم شارەدا هەندێ هەن شایەنی کوشتن و لە سێدارەدانن، بەڵام بۆ چاوێ رێزی هەزار چاودەگیرێ، ئایا بەهۆی ئەوانەوە لەناومان دەبەی، بەگوناهی ئەوان ئازارمان دەدەی، ئێمە چیمان کردووە))[3]. ئەو کارەساتە دوای مردنی شێخ بە (٩٥) ساڵ هاتە سەر بەغدا و لە ساڵی ٦٥٦ ك. هۆلاکۆ و تەتار بەناو بەغدا وەربوون، خۆ ئەو مەترسییە لە ژیانی شێخدا هیچ نیشانەیەکی نەبوو.

شێخ لەو کتێبەدا هەندێ وشەی گشتیی خەڵکی بەکار دێنێ و لەوانەیە فارسی یا تورکی بن، وەکو (الرزکارية، الجامكية، الروزنة، الزوكاري). ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە لەو سەردەمەدا هەندێ وشەی عەجەمی چوو بوونە ناو زمانی عەرەبی، یا

١ الفتح الرباني، ص ٢٨٢.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٤.

٣ سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٢٦.

پێش ئەو کاتە دەستی پێکرد بوو.

٣- کتێبی (فتوح الغیب): ئەم کتێبە لە پەراوێزی کتێبی (قلائد الجواهر)ی شێخ محەممەدی تادفی چاپکراوە، ئەوەی دیارە شێخ عبدالقادر کاتی خۆی ئەم کتێبەی بۆ عبدالرزاقی کوڕی گوتووەتەوە و ئەویش نووسیوێتیەوە، سەرەتای کتێبەکە بەم شێوەیە هاتووە: ((شێخ عبدالرزاقی کوڕی دانەر گوتوویەتی: باوکم ئەبومحەمەد محی‌الدینی گەیلانیی حەسەنیی حوسەینی گوتوویەتی ...))، لە سەرەتاو کۆتایی و لە دیار و نادیار و بە پێی ژمارەی خولقێنراوەکانی و مەرەکەبی وشەکانی و کێشی عەرشەکەی سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانییان ... ئەو کتێبە لە (٧٨) گوتار پێکهاتووە لە: پەیڕەویکردن و ئارامگرتن و سوپاسکردن و ترس و ئومێد و پشت بەستن بە خواو رەزامەندیی خواو خۆپارێزی و ورە بەرنەدان و هەڵس و کەوت و زوهد و تاقیکردنەوە و موجاهدە و صۆفیگەری و یەکخواپەرستی و سیفەتی رابەرو ئێرەیی... هتد.

٤- کتێبی (الفیوضات الربانیة في المآثر و الأوراد القادریة):

ئەم کتێبە گەلێ ویردی رۆژەکانی حەفتە و ویردی پێنج نوێژەکە و نزای پارێزگاری و نزای سەرکەوتن و گەلێ دوعای تری تێدایە، هەروەها گەلێ سەلاواتی لەسەر پێغەمبەر و وەسیەتی بۆ عبدالرزاقی کوڕی و گەلێ قەسیدە و شیعر و پێنج خشتەکیی تێدایە.

ئەمە یەکێکە لە ویردەکانی، کە بەناوی (ویردی ناخۆشی بچوکە): ((خوایە ئەم گرێ کۆڵەیە بکەیەوە، ئەم ناخۆشییە لابەرە، خۆشیم بێنە پێش، لە قەدەری خراپ بمپارێزە، داوای چاکم پێ ببەخشە، لەبەد لادانی تۆ بەسمی، خوایە تۆ بەڵگەمی و دابینکاری پێویستیمی تۆ هۆکاری نەمانی تەڵەو داومی، سەرمایەی بێ فرت و فێڵمی، نازرەوای فرمێسکەکانمی، گەنجینەی بێ توانایيمی، خوایە دڵۆپێ لە دەریای بەخشندەییت دەوڵەمەندم دەکا، گەردیلەیێ لە تەوژمی لێبووردنت بەسمە، رۆزیم بدەرێ، تەندروستم بکە، لێم ببوورە، لێم خۆشبە، پێویستیم جێبەجێ بکە، تەنگوچەڵەمەکەم لابەرە، پەژارەم برەوێنەوە، بەرەحمەتی خۆت خەم و ئەندۆهم

بسرەوە، ئەی ئەو خوایەی کە لە هەموو بوونەوەرێ دڵسۆزتری و سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانییان))، هەندێ ویردی دریژی تر لەم کتێبە هەیە، کە ناکرێ لێرەدا باسیان بکرێ.

٥- کتێبی (بشائر الخيرات في الصلاة على صاحب الآيات البينات):

ئەوە نامیلکەیەکی بچووکە و (٣٢) پەڕی گچکەیە، بریتیە لە هەندێ سەڵاوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ بە شێوەیەکی تایبەتی، بۆ نموونە: بەناوی خوای دڵسۆزی دلۆڤان، سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانییان، خوایە سەڵات و سەلام بۆ پێغەمبەری موژدەدەری ئیمانداران بنێری، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾. خوایە سەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەری موژدەدەری یادکەرەکان لێ بدە هەروەك خوای مەزن فەرموویەتی ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ﴾، ﴿ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾... خوایە سەڵات و سەلام بۆ پێغەمبەری موژدەدەری کارکەرەکان بنێرە، هەروەك پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ﴾. خوایە سەڵات سەلام بۆ محەمەدیﷺ موژدەدەری تۆبەکارەکان بنێرە، هەروەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا﴾، هەروەها بۆ پەشیمانەکان و پاکەکان و دڵسۆزەکان و نوێژکەرەکان و بێفیزەکان و ئارامگرەکان و ترساوەکان و تەقوادارەکان و دڵنیایەکان وقین گرەکان و چاکەکەرەکان و خێرکەرەکان وسوپاسکارەکان و داواکارەکان و چاکەکان و موژدەدەرەکان و سەرکەوتووەکان و زاهیدەکان و هەڵبژاردەکان و ئەوانەی داوای لێبوردن لەخوا دەکەن و نزیکەکان. دوای ئەم سەڵاتە دوعای (بسم الله) دێ ئینجا ویردی مەزنیی خواو دوعای شکۆمەندیی خوا.

کتێبێکی تری شێخ عبدالقادر هەیە، کە لە پەراوێزی کتێبی (الغنية) لە هەندێ لە چاپەکانی چاپکراوە، ئەویش (سر الأسرار)ە و لەسەر صۆفیگەرییەو بەڵام بەبەردەستم نەکەوت.

# شیعرەکانی شێخ

شێخ عبدالقادری گەیلانی (رەحمەتی خوای لێبێ) بەزمانی عەرەبی و فارسی شیعری جوانی هەیە، مامۆستا محەممەدی عەینی لە کتێبەکەی (عبدالقادر الكيـــلاني) نووسیوێتی، کە شێخ دیوانێکی شیعری فارسیی هەیە و دانەیێ لە دەستنووسەکەی لە کتێبخانەی زانکۆی ئەستەنبۆڵ بە ژمارە / ١٨٦٥ هەیە. هەموو شیعرەکانی صۆفیانەن و لەبابەتی صۆفیگەری و خۆشەویستیی خوایی و پێغەمبەری خوانﷺ و تێیدا شانازی بە رێبازەکەی دەکات و هەوڵی بە دەستهێنانی رەزامەندیی خوا دەدات. بەڵام بەزمانی عەرەبی زۆربەی شیعرەکانی لە کتێبەکەی (الفيوضـــات الربانية)دایە و هەندێکیش لە کتێبی (قلائد الجواهر) و (عبدالقادر الكيلاني)ی یونس سامەڕایی دایە. هەروەها مامۆستا محەممەدی عەلی عەینی لە کتێبەکەیدا (عبدالقـــادرالكيلاني) دانە فەرەنسیەکە باسی هەندێ قەسیدەی کردووە و هەندێکی لە عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە فەڕەنسی و هەندێکی تریشی لە دیوانە فارسییەکەوە وەرگێڕاوە کە لە ساڵی ١٨٨٢ز. لە چاپخانەی ئیقبال لە شاری (کوان پور)ی هیند چاپکراوە. گەلێ لە شاعیرەکان هەندێ لە قەسیدەکانی شێخیان کردۆتە پێنج خشتەکی، وەکو شێخ عبدالغنی نابلیسی و ئیبن حوجحە رەحمەتی خوایان لێ بێ.

ئێستاش چەند پارچەیەك لە قەسیدەكانی شێخ تۆمار دەكەم، لەوانەش چەند گوڵچنێ لە قەسیدەی (ناوە پیرۆزەكانی خوا):[1]

شرعت بتوحيد الإله مبسملاً
سأختم بالذكر الحميد مجمّلا
وأشهد أن الله لا رب غيره
تنزّه عن حصْر العقول تكملا
وأرسل فينا أحمد، الحق قيّدا
نبياً به قام الوجود وقد خلا
فعلّمنا من كل خير مؤيد
وأظهر فينا الحلم والعلم والولا
فيا طالباً عزاً وكنزاً ورفعة
من الله فادعوه بأسمائه العلا
بحقك يا رحمن بالرحمة التي
أحاطت فكن لي يا رحيم مجمّلا
ويا ملْك يا قدوس قدسْ سريرتي
وسلم وجودي يا سلام من البلا
ويا باريء النعماء زدْ فيض نعمة
أفضت علينا يا مصور أولا
رجوتك يا غفار فاقبل لتوبتي
بقهرك يا قهار شيطاني اخذلا

---

[1] الفيوضات الربانية، ص ٣٧.

بحقك يا وهاب علماً وحكمة
وللرزق يا رزاق كن لي مسهلا
ويا قادراً، ذا البطش أهلك عدونا
ومقتدر قدّرْ لحسادنا البلا
عطوف رؤوف بالعباد ومسعف
لمن قد دعا، يا مالك الملك معقلا
ويا نور أنت النور في كل ما بدا
ويا هادِ كن للنور في القلب مشعلا
بأسمائك الحسنى دعوتك سيدي
وآياتك العظمى ابتهلت توسلا
إلهي فارحم والديّ وإخوتي
ومَنْ هذه الأسماءَ يدعو مرتلا
وصلّ على جدي الحبيب محمد
بأحلى سلام في الوجود وأكملا
مع الآل والأصحاب جمعاً مؤيداً
وبعدُ، فحمد الله ختماً وأولا

* * *

چەند گوڵچنێ لە قەسیدەی (الغوثية):[1]

خُذْ بلطفك يا إلهي من له زاد قليلْ
مفلسٌ، بالصدق يأتي عند بابك يا جليلْ

ذنبه ذنب عظيم، فاغفر الذنب العظيم
إنه شخص غريب، مذنب، عبد ذليلْ

منه عصيان ونسيان وسهو بعد سهو
منك إحسان وفضل بعد إعطاءٍ جزيلْ

قال يا رب ذنوبي مثل رمل لا تعد
فاعف عني كل ذنب، فاصفح الصفح الجميلْ

كيف حالي يا إلهي ليس لي خير العمل
سوء أعمالي كثير، زادُ طاعاتي قليلْ

أنت شافٍ، أنت كافٍ في مهمات الأمور
أنت حسبي، أنت ربي، أنت لي نعم الوكيلْ

عافني من كل داء، واقض عني حاجتي
إن لي قلباً سقيماً، أنت من يشفي العليلْ

هب لنا ملكاً كبيراً، نجنا مما نخاف
ربنا إذا أنت قاضٍ، والمنادي جبرئيلْ

رب هب لي كنز فضلٍ، أنت وهاب كريم
أعطني ما في الضمير، دلني، خير الدليلْ

---

١ الفيوضات الربانية، ص ١٥٩.

هەندێ لـە شیعرەکانی شێخ عبدالقـادر شـەتەحاتیان تێدایـە، کـەچی ئەمـە لـە پەخشانەکانی دیار نییە، ناشزانم ئایا ئەو جۆرە شیعرانە هی ئەون یان نا ؟ ئەگـەر هـی ئەوبن ئەوا دەبێ والێکبدرێنەوە کـە لەگـەڵ شـەریعەت بگونجێـن، چونکـە شـێخ زۆر جاران و بەبـەردەوامی جـەختی لەسـەر شـەریعەت کـردووە و کردوویەتیـە دادوەر و تەرازووی هەموو شتێ لەم گەردوونەدا.

خوای گەورە رەحمی پێ بکاو لە ئێمەو لەو و لـە موسـڵمانان خۆشبێ و سوپاس بۆ خوای جیهانییان.

# کۆتایی

بەم جۆرە کۆتایی بە ژیانی ئەم پیاوە مەزنە دێنین، کە لە ساڵی ٤٧١ ك لە گەیلان چاوی بە ژیان هەڵێناو لەوێ گەورە بوو و گەنجێکی لێ دەرچوو، کە زەوی دەکێلاو کشتوکاڵی ئاو دێر دەکرد، بەڵام هیمەتەکەی زۆر لەوە مەزنتر بوو و بەهیوای ئەوە بوو، کە هۆشەکان و بیرو درکەکان ئاو بدات، بۆیە لە ٤٨٨ ك بە تەنیایی بەرەو بەغدا هەنگاوی نا، بەگەنجی، جگە لەو چل دینارەی کە دایکی پێیدابوو هیچیتری لە سامانی ئەو دنیایەدا نەبوو، لەگەڵ ئەو خوو ڕەوشتە بەرزە و ئاکار و پەروەردە چاکەی کە لە دایکیەوە وەری گرتبوو، هەر کە دزەکان هێرشیان هێنایە سەری دانی بەوەدا نا کە چل دیناری پێیە نەخۆ بەدرۆزن لای خوا بنووسرێ.
ئەم دان پێدانانە بووە هۆی تۆبەکردنی هەموو دزەکان، لە شاری بەغداش یەکسەر بەرامبەری تاوان و بەدکاری و قرچۆکی و خەرجکردن لە پێناوی غەیری ڕێگەی خوابوویەوە، هەروەها کەوتە بەرامبەر کۆمەڵگایەکی لاڕێ و نائیسلامی و لە راستە شەقامی شەرعی خوا لایان دابوو، بەتەواوی تەرازووەکە لەنگ بوو بوو و بەرەو دنیاپەرستی داشکابوویەوە و واز لە رۆژی دوایی هێنرابوو، بەڵام ئەو چی بکا نە سامانی هەیەو نە پلەوپایە، تەنیا خاوەنی گیانێکی بێگەردو نەفسێکی باڵابوو، بەهیوای ئەوە بوو ئەو نەفسە بگاتە لوتکە یاخود لە گۆڕ بنرێ، برسێتی گەستی، هەژاری دایرزاند و وای لێکرد، کە بە پێخواسی بە سەر دڕکاندا بڕوات و لە گژوگیا و رووەکی رووبارەکان بخوات. ئەمە چ جۆرە پیاوێکە ؟ زۆر جار لەدڵی خۆی دەیویست هەڵبێ، بەڵام خۆیگرت و ئارامیگرت و ویستی بگاتە مەبەستی، سەرەتا مەبەستی لە هاتنە بەغدا خوێندن و فێربوون بوو، ئێستا دەیەوێ چاکەخوازی و رابەرێتی بکاو گومڕایان بباتەوە سەر ڕێگەی راست، بەڵام جیاوازییەکی زۆر

هەیە لە نێوان هیواو ئاواتی و ئەو واقیعە تاڵەی کە تێیدایە، زۆرانبازییەکی توندوتیژ لەدەروونیدا بەرپا ببوو، بۆیە پەنای بردە بەر بیابان و کاولگەکان، جاری وا هەبوو دڵی هێندە دەگوشرا دەستی بەهاوار دەکرد وەك بڵێی جۆرە شێتییەکی گرتبێ و پێیان دەگوت: عبدالقادری شێت.. پێغەمبەرﷺ کردبووە پێشرەوی خۆی.

زۆر جاران لە دایکیەوە هەندێ خەرجیی بۆ دەهات و لە کاولگەی ئەیوانی کیسرا دەیبەخشیە سەر هەژاران. ئەمە چ جۆرە پیاوێکە ؟! سەرەڕای برسێتی و تەنگو چەڵەمەو بێ بەشی لەسەر خوێندنەکەی بەردەوام بوو. بینی کە فیقە بەتەنیا تینوێتیی ناشکێنێ و ئاواتی چاکسازییەکەی ناهێنێتەدی. دڵەکان ژەنگاوی ببوون و دەبوایە شتێك پاکیان بکاتەوە و لەسەفاریان بدا. ئیمان لە دەروونەکاندا بێ سەروشوێن بوو دەبوایە شتێ دایگیرسێنێتەوە، بۆیە بەرەو صۆفیگەری چوو، بەرەو راستیی ئایین و کاکڵەکەی، دوای ئەوەی لە فیقهدا بلیمەتی نیشان دا بەهەمان شێوە لە صۆفیگەریش وەکو بلیمەتی ئەو دنیایەی پەی کردو هەستی بەوە کرد کە صۆفیگەری دەبێ لەبەر هەندێ هەڵەشەیی و سەرکێشی رێشمە بکرێ و رابەرێکی هەبێ بۆ ئەوەی لەرێگای راست لانەدا، لەبەر ئەمە صۆفیگەریی خستە ژێر باڵی شەریعەتەوە و گوتی: هەر حەقیقەتێ شەریعەت پاڵپشتیی نەکا زەندیقیە، لەم بارەیەوە گوتی: فێری فیقە بە ئینجا ببە صۆفی.

خەم و ئەندۆە دەستیان بەرەوینەوە کرد، بەرە بەرە تاریکی لە ئاسۆ نەما و لە ساڵی ٥٢١ ی کۆچیەوە دنیا باوەشی بۆ کردەوە و لەو کاتەوە دەستی بەوانە گوتنەوە کرد، بەڵام بەهیچ شتێ قایل نابێ تانەگاتە دوا ئامانجی خۆی.

بەهەنگاوی چەسپاو و ویستی پۆڵایین و تەماحی بێ سنوور بەرەو ئاواتەکە چوو، کە چاکسازیی کۆمەڵگای ئیسلامی و لە بارکردنی تەرازووە لەنگەکەیەتی.

شێخ هێزو توانایەکەی لە بڕوای بەخواو پشت بەستنی بەو وەردەگرت، هێشتا ساڵی ٥٢٨ ك. نەهاتبوو، کە خەڵك گوێیان لە ناوبانگی بوو و لە دەوری کۆبوونەوە. مزگەفتی (باب الازج)یان بۆ نوێ کردەوە و فراوانیان کرد و ئیتر بەناوی ئەوەوە دەناسرا، بەرێگەی رەزامەندیی خواو چاکسازیی کۆمەڵگادا

ڕۆیشت و لەم ڕووەوە هیچ درێخیی نەکردو کۆڵی نەداو پشتی بەکەس نەبەستا.

قوتابخانەکەی کردە قوتابخانەیەك بۆ دەرچوونی قوتابیان و تەکیەیەك بۆ پەروەردەی موریدان، بنەماکانی ڕێبازی قادریی چەسپاند بە کۆشش و پشت بەستن بەخوا و سوپاسکردن و ئارامگرتن و ئاکاری چاك و ڕەزا و ڕاستگۆیی بۆ چاکسازیی کۆمەڵگای ئیسلامی، ئەمانە هەمووی لەژێر چەتری قورئان و فەرموودە بوون، پەیڕەویکردنێکی بێ بیدعە بوون، چەند ساڵێکی کەمی پێ چوو لەهەموو گۆشەیەکی دنیا ناوی دەرکرد و خەڵك بۆ فێربوونی زانست و گەیشتن بە ڕێگای سلوك و پاککردنەوەی نەفس و فێربوونی ئاکاری چاك پەنایان بۆی دەبرد، بەراستی قوتابخانەو تەکیەکەی شوێنی مەشقکردن بوون بۆ دەرچوونی کەلەپیاوی لێهاتوو و چاکەخواز و موجاهیدی ڕێگەی خوا، لە هەموو کون و کەلەبەرێکەوە قوتابی و ڕێبوار(مرید) دەهاتن، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە میسر و شام شوێنی تر.

ئەوانە بە خۆڕایی دەنووستن و دەیان خوارد و پەروەردە دەکران، ئینجا دوای دەرچوونیان دەگەڕانەوە وڵاتەکانی خۆیان و هەندێکیان بوونە ڕاوێژکاری نورالدین زەنکی و صلاح الدینی ئەیوبی، هەندێکیشیان بوونە سەرکردەی ئەو نەوەی کە لە ساڵی ٥٨٣ ك. لە ژێر ئاڵای صلاح الدینی ئەیوبی قودسیان لەدەست خاچپییەکان ڕزگارکرد، هیتریان بوونە مامۆستا و ڕابەر و ڕێبازەکەی شێخیان لە پەروەردەکردنی دەروون و پاککردنەوەی لە جیهانی ئیسلامیدا بڵاوکردەوە لەوانەش هیندو چین شوێنە دوورەکانی ئەفریقیا، خەڵکی بێ ژمارە لەسەر دەستیان موسڵمانبوون، لەوانەش تەتەر و زنجییەکان و هیتر. بێگومان ئەمە هەمووی لەلاپەڕەی ژیاندا دەنووسرێ.

شێخ ڕەحمەتی خوای لێبێ هەر کە دنیا بەرەو پیریەوە هات نەیتوانی کاری تێ بکات و دەیگوت: ئەی دنیا لەسەرەتا لە وەلییەکانم یاخی بە تا خۆشتیان نەوێ، لە کۆتاییشدا خزمەتیان بکە، تا پێتەوە خەریك نەبن. شێخ لە سەرەتادا زۆر ئازاری لە دەست دنیا چەشت و ئارامیگرت، هەر کە بە پیریشیەوە هات وای لێکرد خزمەتی خۆی و قوتابی و دەروێشەکانی بکات. گوێی بە هیچ گەورەو وەزیرێ نەدەدا، خەلیفە و نزمتر لێی دەترسان، گوتەی هەق و دادی دەگوت و لە خوا نەبێ لەکەس

نەدەترسا. چرای ڕێنماییکردنی بەرز کردبوویەوە و گومڕاو سەرلێشێواوەکانی دەهێنایەوە سەر ڕێگای ڕاست، تا لە شەوی دەیەمینی رەبیعی کۆتاییی ساڵی ٥٦١ کۆچی لەتەمەنی نەوەت ساڵیدا گیانی سپارد.

لەدوای ئەم لێکۆڵینەوە دوور و درێژە، ئایا مافی خۆیم داوەتێ، من هەست بەوەدەکەم هیچ مافێکم نەداوەتێ، ئەمەم چۆن پێ دەکرێ، بەڵام بە هیوای ئەوەم دەرگایەکم کردبێتەوە و خەڵکیی لەمن بەتواناتر بچنە ناویەوە و پەی بە تواناکانی ئەم پیاوە مەزنە ببەن و کەڵەپیاوانی تریشمان پێ بناسێنن تا پەیڕەوییان بکەین و خوای گەورە بەزەیی پێمان دابێتەوە و سەرمان بخات.

شێخ عبدالقادری گەیلانی ئەوەندە شەرەف و شانازییەی بەسە، کە هەزارەها کەس خۆیان بە گەیلانی ناساندووە، هەموویان لەیەك پشت هاتوون کە عبدالقادری گەیلانییە و لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بوونەتەوە، ئەوەندە شانازییە بەسە، کە بە هەزارەها موسڵمانەکان لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی لەسەر پێڕەوی ئەو دەڕۆن لە پەروەردەکردن و پاککردنەوەی دەروون، هەموو ناوی ئەو دێنن و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن و داوای لێبووردنی بۆ دەکەن لە خواوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە خوا عبدالقادری خۆش دەوێ و لێی قایلە، چونکە ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆشویست خەڵکی خۆشیان دەوێ، ئەمەش ڕاستیی ئەم گوتەیەی شێخ دەسەلمێنێ کە لە پێش وەفاتیدا فەرمووبووی:

ڕۆژی پێشینان بزر بوو و ڕۆژی مە
هەمیشە لە ئاسمانەو ئاوا نابێ

ئەوەندە شانازیەی بەسە کە لاوێکی تەنیا و هەژار و نەزان و لە گەیلانەوە بێت و لە کاولگەکانی بەغدا و دەوروبەری بژی و دوایی ببێتە شێخی وەلییەکانی سەردەمی خۆی و ڕووگەی دیدگەی زاناو کەڵە پیاوانی، دەبێ ئەمە چ کەڵەپیاوێك بێت ؟!

خوای گەورە بەرەحمەتی فراوانی داپۆشێ و لەوو لە ئێمە و لە هەموو موسڵمانەکان خۆش ببێت و لە ژێر ئاڵای مەزنمان محمدﷺ لەگەڵ ئەوو زاناکارا

دڵسۆزەکانمان کۆ بکاتـەوە، دوا داوامـان سـوپاس و سـتایش بـۆ پـەروەردگاری خاوەنی جیهانییانە.

بە فەزڵ و یارمەتیی خوا تەواو بوو، سوپاس و ستایش بۆ خوا.

**د. عبدالرزاقی گەیلانی**

**دوبەی**

**لە رۆژی هەینی**

**یەکی شەعبانی ساڵی ١٤١١ ك.**

**١٥ /١٩٩١/٢ ز.**

# سەرچاوەكانی كتێبەكە


١. الغنية، للشيخ عبدالقادر الكيلاني.

٢. الفتح الرباني، للشيخ عبدالقادر الكيلاني.

٣. فتوح الغيب، للشيخ عبدالقادر الكيلاني.

٤. الفيوضات الربانية، لاسماعيل بن محمد القادري.

٥. معجم البلدان، لياقت الحموي.

٦. التعريفات، لعلي بن محمد الجرجاني.

٧. بستان العرفين، للنووي.

٨. المنتظم، لأبن الجوزي.

٩. فتوح البلدان، للبلاذري.

١٠. الكامل، لأبن الاثير.

١١. مروج الذهب، للمسعودي.

١٢. التعرف لمذهب اهل التصوف،للكلاباذي.

١٣. طبقات الاولياء، لأبن الملقّن.

١٤. وفيات الاعيان، لأبن خلكان.

١٥. فوات الوفيات، لمحمد شاكر الكتبي.

١٦. البداية والنهاية، لأبن كثير.

١٧. عوارف المعارف، لعبد القاهر السهروردي.

١٨. العبر في خبر من عبر، للذهبي.

١٩. سير اعلام النبلاء، للذهبي.

٢٠. الذيل على طبقات الحنابلة، لأبن رجب.

٢١. فتاوي ابن تيمية، المجلد الثامن (كتاب القدر)، المجلد العشر (كتاب السلوك)، المجلد الحادي عشر (كتاب التصوف).

٢٢. تكملة الاكمال، للحافظ أبي بكر محمد بن عبدالغني البغدادي الحنبلي المعروف بـأبن

نقطة.
٢٣. تكملة الاكمال في الانساب والاسماء والالقاب، لأبن الصابوني.
٢٤. التاج المكلل من جواهر مآثر الطراز الاخر و الاول، لأبي الطيب القنوجي.
٢٥. اللمع، لأبي نصر عبدالله السراج.
٢٦. قواعد التصوف، لأبي العباس احمد زروق.
٢٧. الطبقات الكبرى، لعبدالوهاب الشعراني.
٢٨. قلائد الجواهر، لمحمد بن يحيى التاغي.
٢٩. كشف الظنون عن اسامي الكتب و الفنون، لحاجي خليفة.
٣٠. حاشية ابن عابدين.
٣١. الشيخ عبدالقادر الكيلاني، للاستاذ محمد علي العيني (النسخة الفرنسية).
٣٢. من روائع حضارتنا، لمصطفى السباعي رحمه الله تعالى.
٣٣. الموجز في تأريخ القطب الغوث و الباز الاشهب الشيخ عبدالقادر الكيلاني، للاستاذ فخري الكيلاني رحمه الله تعالى
٣٤. المستخلص في تزكية الانفس، للشيخ سعيد حوى رحمه الله تعالى.
٣٥. تربيتنا الروحية، للشيخ سعيد حوى رحمه الله تعالى.
٣٦. الموسوعة الفقهية الكويتية.
٣٧. موسوعة التأريخ الاسلامي، للدكتور احمد شلبي.
٣٨. رجال الفكر والدعوة في الاسلام،لأبي الحسن الندوي.
٣٩. ربانية لا رهبانية، لأبي الحسن الندوي.
٤٠. سلاجقة ايران و العراق، للدكتور عبدالمنعم محمد حسنين.
٤١. مايعدُ بة الاسلام، لروجية جارودي، ترجمة: قصي أتاسي و ميشيل واكيم.
٤٢. المائة الاوائل، للدكتور سهيل الزكار.
٤٣. حقائق عبدالقادر الكيلاني، ليونس ابراهيم السامرائي.
٤٤. هكذا ظهر جيل صلاح الدين و هكذا عادت القدس، للدكتور ماجد عرسان الكيلاني.

# ناوەڕۆك